# جوڵانەوەی نەتەوەیی باشووری کوردستان

# 1977-1961

# لەبەڵگەنامە نهێنیەکانی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیادا




وەرگێرانی:

پاسار شێرکۆ

ئامادەکردن و ساغکردنەوەی

لە ئەرشیفی نەتەوەیی بەریتانی:

شەریف هەژاری


**KURDISH FREEDOM FIGHTERS**

*A long war of attrition*

# جووڵانەوەی نەتەوەیی باشوری کوردستان
# (١٩٦١ـ ١٩٧٧) لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی
# وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیادا

ئامادەکردن و ساغکردنەوەی لە ئەرشیفی نەتەوەیی بەریتانی

شەریف هەژاری

# جووڵانەوەی نەتەوەیی باشوری کوردستان (١٩٦١ـ ١٩٧٧) لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیادا

وەرگێڕان بۆ کوردی

پاسار شێرکۆ

ناوی کتێب: جووڵانەوەی نەتەوەیی باشوری کوردستان (١٩٦١-١٩٧٧)
لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیادا
ئامادەکردن و ساغکردنەوەی لە ئەرشیفی نەتەوەیی بەریتانی: شەریف هەژاری
وەرگێڕان بۆ کوردی: پاسار شێرکۆ
پیاچوونەوە: شەریف هەژاری
بابەت: مێژوویی
تایپ: سیروان خەلیل
دیزاینی بەرگ: هێڤی لەتیف هەمەوەندی
دیزاینی تێکست: دانا حەسەن
نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠١٦
چاپخانە: پەنجەرە
تیراژ: (١٠٠٠) دانە
نرخ: (٧٠٠٠) دینار
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (١٩٠٢)ی ساڵی (٢٠١٦)ی پێ دراوە.

هەموو مافێکی لە چاپدانەوەی ئەم بەرهەمە بۆ شەریف هەژاری پارێزراوە

لەسەر ئەرکی بەڕێز (ساسان عوسمان مەلا قادری صەڕاف) چاپکراوە

# پێرست


وتەیەکی پێویست ........................................................................ ٦

پێشــەکی ئامادەکار و ساغکەرەوە ........................................................ ٧

بەڵگەنامەکانی ساڵی ١٩٦١ ............................................................ ١٥

بەڵگەنامەکانی ساڵی ١٩٦٨ ............................................................ ٧١

بەڵگەنامەکانی ساڵی ١٩٦٩ ............................................................ ١٠٣

بەڵگەنامەکانی ساڵی ١٩٧١ ............................................................ ١٤٩

بەڵگەنامەکانی ساڵی ١٩٧٣ ............................................................ ١٥٣

بەڵگەنامەکانی ساڵی ١٩٧٦ ............................................................ ١٨٥

پاشــکۆ: بەشێک لە بەڵگەنامەکان ...................................................... ٣١٥

# وتەیەکی پێویست

لــە دوای جەنگــی دووەمــی جیهانــەوە، گۆڕانــی هاوســەنگیی هێــز لــە ناوچەکـەدا وایکـرد وڵاتـە ناوچەیـی و نێودەوڵەتییـەکان سـەرنجی زیاتـر بخەنـە سـەر کـورد و بیانەوێـت راسـتەوخۆ یـان ناڕاسـتەوخۆ بـەرەو خزمەتکردنـی بەرژەوەندییەکانــی خۆیــان ئاراســتەیان بکــەن.

ئەمـەی لـەم کتێبـەدا دەیخوێنیتـەوە، دەقـی بـێ رتووشـی تێڕوانینـی بریتانیـای سـاڵانی شەسـت و حەفتاکانـی سـەدەی بیسـت بـووە لەسـەر کـورد. خوێنـەر لـە چۆنێتـی مامەڵەکـردن لەگـەڵ خوێندنـەوەی بەڵگەنامەکانـدا بەئاگایـە، بـەڵام جەخـت کردنـەوە لـەم دوو خاڵـەی خـوارەوە، بێسـوود نابێـت:

یەکـەم: ئـەم بەڵگەنامانـە تێکـڕای هەقیقەتی شۆڕشـی کورد و کەسـایەتییەکانی نـاوی پێـک ناهێنـن و، لـە باشـترین حاڵەتـدا تێڕوانینـی تەنیـا لایەنێکـی دەرەکیـن لەسـەر پرسـی کـورد و، دەبێـت بـە هەمـان جۆریـش مامەڵەیـان لەگـەڵ بکرێـت. واتـە بـۆ پێکەوەنانـی وێنـەی تـەواوی هەقیقەتەکـە، دەبێـت گـوێ لـە بۆچونـی لایەنـە ناوخۆیـی و دەرەکییەکانـی دیکـەش وەربگیرێـت.

دووەم: ئەمـەی لـەم کتێبـەدا خراوەتـە روو، تێکـڕای بۆچونەکانـی بریتانیـاش نییـە، بەڵکـو ئەوەندەیـە کـە بەدەسـت هاتـووە. رێـی تێدەچێـت کـە لـە بەڵگەنامەی دیکـەدا بۆچونگەلـی جیـاواز باسـیان لێـوە کرابێـت، کـە نەگەیشـتۆتە دەسـتمان.

# پێشەکی ئامادەکار و ساغکەرەوە

**خوێنەری بەڕێز،** ئەم بەڵگەنامانەی بەردەست، هەوڵێکم بوو بە درێژایی ساڵانی ٢٠١١-٢٠١٤، کاتێک لە زانکۆی لەندەن خوێندکاری ماستێر بووم، لە پاڵ خوێندنەکەمدا -ناسنامەی ئەرشیفخانەی نەتەوەیی بەریتانیم- درووست کرد و، تەواوی توانام خستەگەڕ تا لە نزیکەوە، قوژبن دوای قوژبن، بە شوێن هەر زانیاری و بەڵگەنامەیەک دا بگەڕێم کە لەسەر کورد و کوردستان بێت و، بتوانم چنگیان بخەم و، بیانهێنمەوە بۆ باشوری کوردستان.

بەمپێیە، لەلایەک مەرج نییە تەواوی بەڵگەنامەکانم هێنابێتەوە و، لەلایەکی دیکەش مەرج نییە بەڵگەنامەکان "بە نهێنیی و نا-نهێنییانەوە" تەواوی ڕەهەندی ڕووداوەکانی خستبێتەڕوو. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەش دا، دانسقەیی زانیارییەکانی ناو بەڵگەنامەکان لای توێژەری پسپۆڕ و بەراوردکار دەردەکەوێت.

بۆیە، دەکرێت ئەم بەرهەمە و، بەرهەمە بەڵگەنامەییەکانی دیکەشم، کەرەستەیەکی پڕ-بایەخ و دانسقەبن بۆ نووسینی قۆناغە جیاکانی مێژووی نەتەوەکەمان و، ڕوونیشە "تاهەتایە" دەبنە سەرچاوەی سەرەکیی و کەرەستەی بنەڕەتیی بۆ تەواوی توێژینەوە زانستییەکان کە لەسەر مێژووی هاوجەرخی کورد ئەنجام بدرێن.

زانیارییەکانی ناو بەڵگەنامەکانیش لەلایەن دبلۆماتکار و باڵوێز و هەواڵنێرەکانی ئینگلیزەوە بۆ سەروو خۆیان بەرزکراوەتەوە، کە لۆژیک نییە تەواوی زانیارییەکانی ناو بەڵگەنامەکان نادروستبن و هەڵەیان بە سەروو خۆیان گەیاندبێت، لەگەڵ هەموو ئەمانەش دا: توێژەر هەر دەبێت بە دیدی تێڕامان و وردبوونەوە و بەراوردکاریی هەڵیان سەنگێنێت.

لە ڕاستیدا بەڵگەنامەکانم پۆلێن کردووە و لە دووتوێی چەند کتێبێکدا هەوڵی بڵاوکردنەوەیان دەدەم، پێشتریش بەشێکیانم لە کتێبی: "ڕۆژهەڵاتی کوردستان (١٩٧٩-١٩٨٠) لە بەڵگەنامەکانی بەریتانیا دا" بڵاوکردەوە و، ئەم بەشەی بەڵگەنامەکانیش تایبەتە بە شۆڕشی ئەیلول و سەرهەڵدانی شۆڕشی نوێی باشوری کوردستان لە بەڵگەنامەکانی بەریتانیا دا، هەربۆیە بە باشمزانی ناونیشانی پەرتووکەکە بکەمە: "جووڵانەوەی نەتەوەیی باشوری کوردستان (١٩٦١-١٩٧٧) لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا دا".

**سەبارەت بەم پەرتووکە** و ئەم بەشەی بەڵگەنامەکانیش، ئەوا بە گونجاوی نازانم زۆر بە وردی زانیارییەکانی ناو بەڵگەنامەکان تەتەڵە بکەم، هەرچەندە ئەکرێت سەرەقەڵەمێکیان لەبارەوە بخەمەڕوو. بەڵام واباشترە بخرێتە بەردەست "توێژەران" و، ئەوان هەڵسەنگاندنی بۆ بکەن. هەربۆیە بەڵگەنامەکان "بەبێ زیاد و کەم و بێ دەستکاری" لە لایەن برای گرانقەدرم کاک "پاسار شێرکۆ" وەرگێڕدراون و خۆشم بە وردی پیاچوونەوەم پێدا کردوونەتەوە.

جێی ئاماژەیە، پێم باش نەبوو کە هەر خودی خۆم بە کاری وەرگێڕانەکەیان هەستم، چونکە پێموایە: لەلایەک ئەم ئەمانەتە مێژووییە دەخەمە بەردەستی وەرگێڕێکی بەتوانا و، لەلایەکی دیکەش پێش چاپکردنیان خۆشم بە وردی بەراوردی وەرگێڕانەکە و بەڵگەنامەکان دەکەمەوە و، بەتەواویش بۆم سەلماوە کە "کاکە پاسار" ڕەوشتی پاراستنی ئەمانەتی وەرگێڕانی تێدایە و، بەڕاستیش لەو روانگەیەوە هەندێ جار لەسەر یەک وشەی دەگمەنیش، پێکەوە هەوڵماندا وە "دەقاودەق" ماناکەی بکەینە کوردی، بۆ ئەوەی "ئێستا یا چەند ساڵێکی دیکە یان هەرکاتێکی تر"، هەر کەسێک توانی ئەم بەڵگەنامانە یان بەشێکیانی دەست بکەوێت، ئەو ڕاستییەی بۆ بسەلمێت کە تا چەندێک لە پەرۆشی وەرگێڕانێکی تەواو درووست و بێ دەستکارییدا بووین و، چۆن ئەم ئەمانەتە مێژووییەمان "وەک خۆی" خستۆتە بەردیدی خوێنەوارانی کورد.

بە نیسبەت زانیارییەکانی ناو بەڵگەنامەکانیش، ئەم بەڵگەنامانە "کورد،

سەرکردەکانیی، شۆڕش و سیاسەتکردن و دانووستان و پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان"یانمان پێ ئەناسێنێت - لە دید و دونیابینیی دبلۆماتکارانی ئینگلیزەوە -. هەروەها، کاتێک خوێنەر ئەم بەڵگەنامانە ئەخوێنێتەوە و تێیاندا ڕۆدەچێت، ڕەنگە بەو یەقینە بگات کە: "- نەتەوەی کورد و تراژیدیا و خۆخۆری- سیانەیەکن زۆر سەیر پێکەوە ئالاون!!".

بە ڕامان لەم بەڵگەنامانەش، ئەکرێت بەو ڕاستییە بگەیت: زلهێزان و نەتەوەیەکگرتووەکان و باقی دەوڵەتانی دیکە، بە وردی ئاگاداری تراژیدیا خوێناویی و جینۆسایدەکانی سەر نەتەوەی کورد بوون. بەڵام لەبەر بەرژەوەندییە ئابوریی و سیاسییەکانیان، ئامادە نەبوون هیچ گرنگییەک بە بەندەکانی یاسا نێودەوڵەتییەکانی نەتەوەیەکگرتووەکانیش بدەن کە هەر خودی خۆیان واژوویان لەسەری کردووە و لەسەری ڕێککەوتوون و وەک بەندی پاراستنی مافەکانی مرۆڤ ڕایانگەیاندووە. لەکاتێکدا چەندان بەڵگەنامەیان بەوردی باس لەوە دەکەن: "لە ساڵی ١٩٦١ەوە دەوڵەتی عێراق پرۆسەی جینۆسایدکردنی نەتەوەی کوردی لە باشوری کوردستان گرتۆتەبەر و، تورک و فارسیش هەمان تاوانی دژ بە مرۆڤایەتییان لە دژی نەتەوەی کورد لە بەشەکانی خۆرهەلات و باکوری کوردستان دا ئەنجام داوە".

تەنانەت دبلۆماتکارە پسپۆڕەکانی ئینگلیز لە بەڵگەنامەکانیاندا بە بەڵگەوە چەندان جار زاراوەی "جینۆساید"یان بەکارهێناوە بۆ پرۆسەکانی قاتوقڕکردنی نەتەوەی کورد، کە ئەم پرۆسەیە هەر لە ساڵی ١٩٦١ەوە دەستی پێ کردووە و تا بەرواری کۆتایی ئەم بەڵگەنامانە کە هەتا ساڵی ١٩٧٧ دەکات، ئەوا پرۆسەکانی جینۆسایدی نەتەوەی کورد بەردەوامیی هەبووە. دەشێت خودی ئەم بەڵگەنامانە وەک بەشێک لە "بەڵگەی سەلمێنەر" لە ناو پەرلەمانی بەریتانیا و لە ناو دامەزراوەی مافی مرۆڤی نەتەوەیەکگرتووەکانیش دا، بۆ تاوانی ناساندنی "چەندان جینۆسایدی نەتەوەی کورد بە پێی کاتی ڕوودانیان" بەکاربهێنرێت و کاریان لەسەر بکرێت.

لە بارەی تراژیدیا جینۆسایدکارییەکانی سەر نەتەوەی کوردیش، بە پێی هەندێک لە بەڵگەنامەکان: "بەریتانیا ئاگای لە پلانە نهێنییەکانی دەوڵەتی عێراق بووە کە یەک ملیۆن کورد لە ناوچەکانیان هەڵکەنێت و هەندێکیانی قاتوقڕ کردووە و، بەشێکیشیانی بردووە بۆ باشوری عێراق و عەرەبی شوانکارەی لە شویندا داناوون. ئەم پرۆسەی جینۆسایدە لە ساڵی ١٩٦١ ەوە دەستی پێ کردووە و، ناوچەکانی موسڵ- کەرکووک- خانەقین- هەولێر- دهۆک- سلێمانیی و تا هەڵەبجەشی گرتۆتەوە".

تەنانەت کپکردنی دەنگدانەوەی ئەم تراژیدیا جینۆسایدکارییانەش بە جۆرێک خامۆشکراوە، نەتەوەیەکگرتووەکان و دەوڵەتانی زلهێزیش بێ دەنگیان لە ئاست دا هەڵبژاردووە. بۆ نموونە بەڵگەنامەکان ساغی دەکاتەوە کە: "نەتەوە یەکگرتووەکان ئاگای لە دۆخی کوردان و جینۆسایدکردنەکردنەکانیان بووە، بەڵام لەبەر زیان نەگەیاندن بە پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ دەوڵەتانی ئێران و عێراق دا، ئەوا نەتەوە یەکگرتووەکان خۆی لە دەربڕینی هەڵوێستی مرۆڤانە پاراستووە".

تەنانەت کار گەشتۆتە ئاستێک، ئەو کوردانەشی کە هەڵهاتوون بۆ ئەورووپا، دەوڵەتە ئەورووپییەکان بە مەرج "ڤیزا یان ڕەزامەندی مانەوەی کاتیشیان" بۆ دەربڕیوون. بۆ نموونە چەند بەڵگەنامەیەک ئەیسەلمێنن کە: "بەریتانیا بە مەرجێک ڤیزای بە کورد داوە و، تەنها هەر بەو مەرجەش بە مانەوەی کاتیی پەنابەرە کوردەکان لە ناو بەریتانیا ڕازی بووە، کە: پەنابەرە کوردەکان چالاکیی سیاسیی ئەنجام نەدەن!!"، کە توێژەر دەتوانێت زانیاری وردتر شەن و کەو بکات لە ناو ئەم بەڵگەنامانەدا، سەبارەت بە دڕندایەتیی بێ دەنگبوونی جیهانی دەرەوە، لە ئاست قڕکردنی نەتەوەی کورد دا لە نێوان ساڵانی ١٩٦١ تا ١٩٧٧ دا.

**سەبارەت بە سنووری باشوری کوردستان و ژمارەی دانیشتووانەکەشی،** هەندێ لە بەڵگەنامەکان ئاماژە بەوە دەکەن: "لەو کاتەدا ژمارەی کورد لە عێراق دا "٣ ملیۆن" و ژمارەی عەرەبیش "٧.٥ ملیۆن" بووە". دیارە بەهۆی شاڵاوی تەعریب و جینۆسایدە یەکلەدوای یەکەکانەوە، ئەوا لە ئێستادا ژمارەی

کورد لە چاو عەرەب لە عێراق دا بە ڕێژەیەکی زۆر کەم کراوەتەوە. هەر بەڵگەنامەکانیش جەخت دەکەنەوە کە: "عەقرە، شەنگال و خانەقین، کوردن و، شۆڕشی ئەیلوول داوای کەرکووکی کردووە کە بیکاتە پایتەختی هەرێمی ئۆتۆنۆمی باشوری کوردستان". بە پێی ئەم بەڵگەنامانەش: "پرۆسەی ڕاگواستن تا ساڵی ١٩٧٥ بۆ ١٩٧٦ گەشتۆتە لووتکە و، تەنها لە ساڵی ١٩٧٥ دا لە خانەقین "٦٠ هەزار" کورد ڕاگوێزراوون".

**لە بارەی پەیوەندییەکانی شۆڕشی ئەیلول و جیهانی دەرەوە و دراوسێکانیش،** بەپێی بەڵگەنامەکان سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلول مەبەستی بووە کە پەیوەندی توندوتۆڵی لەگەڵ "ئێران و ئیسرائیل و ئەمریکا" دا هەبێت. هەرچەندە بەڵگەنامەیەک لایەنی نەرێنی پەیوەندییەکانی دەرەوەی شۆڕشی ئەیلول دەردەخات و "شۆڕشی ئەیلول وەک بووکەڵەیەکی دەستی حەمەڕەزا شای ئێران لە قەڵەم دەدات". بەڵام پەیوەندییەکانی شۆڕشی ئەیلول و ئیسرائیل جێی بایەخ بوون و بە پێی زانیارییەکانی ناو بەڵگەنامەکان: "مەشقەکانی ڕاوێژکارانی ئیسرائیل و ناردنی چەک و تەقەمەنی بۆ پێشمەرگە وایکردووە کە پێشمەرگەکان لە نێوان ساڵانی ١٩٦٣ تا ١٩٦٧ بەباشتر ڕێک بخرێن و، خاوەن پێداویستیی جەنگیی و دژە فرۆکەش بن".

**سەبارەت بە پەیوەندیەکانیش لەگەڵ خودی بەریتانیا خۆیدا،** ئەوا بەریتانیا بەتەواوی بەرژەوەندیخوازانە لەگەڵ شۆڕشی ئەیلول و دۆزی کورد دا مامەڵەی کردووە، بە جۆرێک: "هەندێ جار لەبەر خواستی دەوڵەتی عێراق، بەریتانیا داوای لە ئێران کردووە بەتایبەت لە ساڵی ١٩٦٥ دا، کە هاوکاری بۆ شۆڕشی ئەیلول ڕاگرێت".

زیاتر لەمانەش، بە پێی ئەم بەڵگەنامانە: "دەزگا دبلۆماتکاریی و ناوخۆییەکانی بەریتانیا، بەدواداچوونیان کردووە بۆ وتاری ڕۆژنامەکان و بەرنامەی تەلەفزیۆنەکانی ناو وڵاتەکەیان و، هانیان داون کە بەجۆرێ ڕەفتار بکەن کە بەرژەوەندییە دەرەکییەکانی بەریتانیا نەخەنە مەترسییەوە و، دۆزی

کورد لە وتار و بەرنامە تەلەڤزیۆنییەکانیش دا زەق نەکەنەوە کە دڵی "ئێران و تورکیا و عێراق"یان لێ بڕەنجێت". کەچی لە روانینیکی دیکەوە، هەر خودی بەریتانیا پێکدادانەکانی نێوان دەوڵەتی عیراق و شۆرشی ئەیلولی لا پەسەند بووە، چونکە لەو کاتەدا بەریتانیا پێی وابووە:

"ئەگەر عێراق سوپاکەی لە باکوری وڵاتەکەیدا بۆ شەڕی دژ بە کورد نەهێڵێتەوە، ئەوا تووشی کەڵکەڵەی سەرکێشی دەرەکی دەبێت لە کەنداو دا و، دژ بە کوەیت و هەروەها دژ بە دەولەتی حەمە ڕەزا شای ئێرانیش شەڕ دەکات، هەروەها ئەگەریشی هەیە سوپاکەی بەگشتی بۆ شەڕی دژ بە ئیسرائیل تەرخان بکات". ئا لیرەدا راڤەکار تێ دەگات کە چارەکە سەدەیەک پێش ڕوودانی جەنگی عێراق-ئێران و، داگیرکردنی کوەیت لەلایەن عێراقەوە، ئەوا بەریتانیا کەڵکەڵەی پلانی سیاسیی عێراقی خوێندووەتەوە!!.

**لە بارەی پەیوەندییەکانی "یەکێتی سۆڤیەت و عێراق و ئێران" و پێگەی شۆڕشی ئەیلولیش لەو ئەڵقە سیاسییە ئیقلیمییە دا،** بەڵگەنامەکان جەخت دەکەنەوە کە: "یەکێتی سۆڤیەت ویستوویەتی بەهۆی شۆڕشی ئەیلولەوە ماسی لە ئاوی لێڵدا بگرێت و، ڕۆڵیشی لە ڕێکەوتننامەی ١١ ی ئازاری ١٩٧٠ دا هەبووە".

هەروەها سەبارەت بە پەیوەندییەکانی عێراق و ئێرانیش بە پێی بەڵگەنامەکان: "بەندێکی نهێنی لە ناو ڕێکەوتننامەی جەزائیری ١٩٧٥ دا ئەوە بووە کە: ئێران بە نهێنیی پەنابەرە کوردە عێراقییەکان بەتایبەت سەرکردە و کەسە چالاکەکانیان تەسلیم بە ڕژێمی عێراق بکاتەوە و تا ڕادەیەکی زۆریش ئێران ئەم بەندەی جێ بە جێ کردووە".

لەبارەی هۆکارێکی ناوبانگ پەیداکردنی سەدام حسێن کە ئەوکات جێگری ئەحمەد حەسەن بەکر بووە، ئەوا بەڵگەنامەکان بۆ ئەوەی دەگێڕنەوە: "سەدام سور بووە لەسەر واژوو کردنی ڕێکەوتنامەی ١١ ی ئازاری ١٩٧٥ لەگەڵ کورد دا و، ئەمەش دژ بە بۆچوونەکانی زۆرێک لە ئەندامانی سەرکردایەتی حیزبی بەعس بووە لەو کاتەدا".

**بەڵگەنامەکانی ئەم کتێبە** باس لە ململانێی نێوان "کورد" خۆشی دەکات بەتایبەت ناکۆکیی و ململانێکانیی نێوان هەردوو بەشی سەرەکی پارتی دیموکراتی کوردستان کە باڵی سەر بە مەلا مستەفای بارزانیی و، باڵی ئیبراهیم ئەحمەد-مام جەلال بوون.

سەرەڕای هەموو ئەوانەش کە ئاماژەی بۆ کرا، لەگەڵ ئەوەی زۆرێک لە بەڵگەنامەکان جەختیان لە خاوەنداریێتیی کورد لەسەر خاکی ڕەسەنی خۆیان کە خاکی کوردستانە، بۆ مێژوویەکی دە هەزار ساڵە گەڕاندووەتەوە و بە خاوەنی ڕاستەقینەی خاکی کوردستان ناوییان بردوون، ئەوا هەندێ جار ڕەخنەشیان ئاراستەی هەندێ لە تایبەتمەندییەکانی نەریتی سیاسیی و کۆمەڵایەتیی کورد گرتووە، کە توێژەر و ڕاڤەکار دەتوانن بیخەنەبەر پێوانی ڕەخنەی لۆژیکییەوە، کە ئایا ڕەخنەکانی دبلۆماتکارانی ئینگلیز لە بارەی هەندێ نەریتی کوردەوە مەنتیقین "لۆژیکین" یاخود نا!؟

ئەگەر ڕەخنەکانیان لۆژیکین، بۆ کورد سود و پەندیان لێ وەرناگرێ و چەندبارەیان دەکاتەوە!؟ بۆ نموونە: هەندێ لە دبلۆماتکاران لە بەڵگەنامەکاندا جەخت دەکەنەوە کە "زانیاری وردیان لایە کە لە هەندێ ناوچەدا کوردەکان خۆیان دەسەڵاتدارن و دەسەلاتی دەولەتە ناوەندییەکانی ئێران و عێراق زاڵ نییە بەسەریاندا، بەڵام کوردەکان لەناویەکدا هێندە خۆخۆرن، ڕۆژانە لەسەر لەوەڕگاکانیان، لەنێوان خۆیاندا شەڕ دەکەن و لە یەکتر دەکووژن و دانوویان پێکەوە ناکوولێت".

هەروەها هەر سەبارەت بە خۆخۆری لە ناو تاکەکانی کورد دا، دبلۆماتکارێکی دیکەی ئینگلیز جەخت دەکاتەوە، کە: "لە ڕووی سیاسییەوە کورد هەرگیز وەک نەتەوەیەک یەکگرتوو نەبوون و، بە زۆری لە چوارچێوەی ژیانی خێڵەکییدا بە ناکۆکیی و جیاوازییە زمانەوانیی و نەریتییەکانیانەوە ژیاوون".

لەم بارەیەوە بەڵگەنامەکانی چەند دبلۆماتکارێکیش ڕەخنەکانیان زۆر زەقن لەبارەی کوردەوە، بۆنموونە ئاماژە بەوە دەدەن، کە: "لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە کوردەکان لە دۆخێکدان کە لە تێ پەڕاندنی قۆناغی ژیانی مەڕداریی و،

سەرەتای نیشتەجێ بوونی شارنشینیش دان و، هەندێک لە شۆڕشەکانی کورد-شۆڕش نەبوون، بگرە حەزی سەرکردە خێڵەکییەکانی کورد بووە بۆ ئەوەی لەمپەر بۆ ئازادی دەسەڵاتەکانیان لە ناوچەکانیاندا بۆ درووست نەبێت"، کە وەک ئاماژەی بۆ کرا توێژەری هەڵسوڕ دەبێت بە وردی و زانستییانە لەم ڕەخنانە بکۆڵێتەوە و، ئەو ڕەخنانەی کە مەنتیقین ئیدی ناکرێت گەلەکەمان پەندییان لێوە وەرنەگرێت، چونکە پێموایە: **ئەگەر هەڵەکان چەندبارە ببنەوە - ئەوا تراژیدیاکانیش بەسەر نەتەوەکەماندا بەردەوام دەبنەوە.**

خوێنەرانی بەڕێزیش دڵنیا دەکەمەوە کە بەڵگەنامەکانی دیکەشمان وەرگێڕاوە و لە دوو توێی چەند کتێبێکی دیکەدا ئامادەمان کردوون، بەڵام دەبێت چاوەڕوانبم تا ئەوکاتەی لایەنی دارایم هاوکارم ئەبێت بۆ چاپکردنیان، بۆ ئەوەی لە مانگەکانی داهاتوودا بکەونە بەر دەستی ڕووناکبیرانی کورد.

زۆر سوپاسی برای خۆشەویستم کاک پاسار ئەکەم، کە لە وەرگێڕانەکەدا زۆر ماندوویێتیی بۆ نەتەوەکەی کێشا، بێ گوومان کاکە سیروان خەلیلیش هاوکاری گەورەمان بوو لە تایپکردنی ئەم بەرهەمەدا.

بە سوپاسیشەوە بەڕێز (ساسان عوسمان مەلا قادری صەڕاف) ئەرکی چاپکردنەکەی گرتەئەستۆ، هیوادارم هەمیشە نموونەیان زیادبێت.

لەگەڵ ئەوپەڕی ڕێز و حورمەتم بۆ هەر نیشتیمانپەروەرێکی کورد.

**شەریف هەژاری**
**٢٠١٦-١١-١١**
**سلێمانی**

**زانیاری**
**لەلایەن باگەوە**
**ناردنی لە وەزارەتی دەرەوە و وایتهۆڵ**
**لە وەزارەتی دەرەوە بۆ چەند نوێنەرێکی دیاریکراوی خاوەنشکۆ "شاژن"**
**ژمارە ١٢٠ ی زانیاری**
**٢٢ی ئەیلولی ١٩٦١**

## کوردەکان:

سەدان ساڵە کوردەکان لە ناوچەیەکی شاخاویدا نیشتەجێن کە بەشێکی زۆری لە ئێستادا بەسەر وڵاتانی تورکیا و ئێران و عێراقدا دابەشکراوە. سەرەڕای داگیرکردنی نیشتمانەکەیان لەلایەن داگیرکارییەکانی عەرەبەوە، کە لە سەدەکانی شەشەم تاوەکوو نۆیەمی زایینی درێژەی کێشا و، لەلایەن تورکە عوسمانییەکان و ئێرانییەکانەوە لە سەدەکانی شانزە و حەڤدەدا درێژەی هەبوو، ئەوا نەتەوەی کورد هەمیشە توانیویانە برێک لە ئۆتۆنۆمییان هەبێت و تا رادەیەکی زۆر خۆیان لە توانەوە لەناو نەتەوەکانی تردا پاراستووە. لە رۆژگاری ئەمرۆشدا، کوردەکان لەو وڵاتانەی بەسەریدا دابەشکراون، گروپێکی رەگەزی جیاوازن و کەمینەیەکی نەتەوەیی پێک دەهێنن کە گرنگی سیاسییان هەیە.

## ژمارە و دابەشبوون:

٢. کۆی گشتیی ژمارەی کوردەکان لە بەرزترین خەمڵاندندا دەگاتە ٥,٥ ملیۆن کەس. لە تورکیا، سەرژمێرییەکەی ساڵی ١٩٥٥ ژمارەی کوردەکانی

بـە ١,٥ ملیـۆن کـەس لەقەڵەمدابـوو، بـەڵام هەنـدێ لـە چاودێـران بڕوایـان وایـە ژمارەکەیــان بگاتــە ٢,٥ ملیــۆن کــەس، ناوچــە کوردییەکانــی تورکیــا بریتیــن لــە ناوچــە ســنورییەکانی ئــەو وڵاتــە لەگــەڵ عێــراق و ئێرانــدا، لــە ناوچەکانــی دەریاچــەی وان و بــەری ســەروی روبارەکانــی دیجلــە و فــورات، لــەم باشــوری خۆرهەڵاتــەی وڵاتــەوە، کــوردەکان هاوشــێوەی کوردانــی ئەوپــەڕی باکــور کــە دەکاتــە کارس و ئــەرزروم و ئەرزنجـان و ئەوانـەی ئەوپـەڕی خۆرئاوا کـە دەکاتە ســیواس و مــاراس و غــازی عەنتــاب، لــە روی ژمــارەوە لــە کەمبوونــەوەدان.

لــە ئێــران و لــە عێراقیــش، کەمینــە کوردییەکــە لــە رووی ژمــارەوە بــە ١,٢٥ ملیـۆن کـەس دەخەملێنرێـن. لـە ئێـران کـوردەکان لـە ناوچەکانـی باشـور و خۆرئــاوای ئورمیــە نیشــتەجێن و لــە باشــورەوە تاوەکــوو کرماشــان درێــژ دەبنــەوە.

لـە عێـراق، زوربـەی کـوردەکان لـە باکـور و باکـوری خۆرهــەڵات دەژیـن، لـە پارێزگــای ســلێمانی، هەروەهــا لــە پارێزگاکانــی موســڵ و هەولێــر و کەرکــوک و دیالــەش هــەن. بــەلای کوردەکانــەوە، (لــوڕ)ە فارســیزمانەکان کــە لــە ئێــران نیشــتەجێن و بــە هەمــان ژمــارەوە لــە عێراقیشــدا هــەن، ئــەوا بــە کــورد دەزانرێن. جڤاتــی ئێزدییــەکان ("شــەیتانپەرســتەکان") لــە عێراقیــش هــەر بــە زمانــی کــوردی دەئاخفـن.

٣. لــە هەرێمــی ســوریای کۆمــاری یەکگرتــوی عەرەبــدا کــورد هــەن، بەتایبەتیـی لـە ناوچەکانـی دیمەشـق و ناوچـە سـنورییەکانی نزیـک لـە تورکیـادا، ژمارەکەشــیان لــە کەمتــر لــە ١٠٠ هــەزارەوە تاوەکــو زیاتــر لــە ٢٠٠ هــەزار کــەس دەخەملێنرێــت. یەکێتیــی ســۆڤیەت ٥٩ هــەزار هاووڵاتــی کــوردی هــەن کــە زوربەیــان لــە کۆمــارە سۆشیالیســتەکانی ئەرمینیــا و جۆرجیــای ســۆڤیەتدا نیشــتەجێن.

## ئایین و زمان:

٤. زوربەی کوردەکان موسوڵمانی سوننەن، لەگەڵ ئەوەشدا زوربەیان سەر بە ڕێبازەکانی دەروێشیی و تەسەوفن. بە چەند شێوەزارێکی زمانی کوردی قسە دەکەن کە پەیوەندیی لەگەڵ زمانی فارسیدا هەیە و بە زۆرییش بە ئەلفوبێی عەرەبی دەنووسرێت، لەگەڵ ئەوەشدا لە هەندێ لە بڵاوکراوەکانی سوریا و لوبناندا بە ڕێنوسی لاتینی دەنووسرێت و لە یەکێتی سۆڤیەتیشدا سود لە ئەلفوبێی (سیریلی) وەردەگیرێت.

## شێوازی ژیان:

٥. کوردەکان تا ئێستاش بەزۆری کەسانێکی گوندنشین و کشتوکاڵیین و، لەو دۆخەدان کە شێوازی ژیانی مەڕداری تێپەڕێنن و لە گوندا نیشتەجێ ببن. هەندێ لە کوردەکان بەرەو شارەکان جماون، بەڵام خەڵکە گوندنشینەکە بەزۆری لەسەر بنەمای خێڵەکی ڕێکخراون و، هەموو چەند گوندێک پێکەوە لەژێر جۆرە دەسەڵاتێکی دەرەبەگانەی سەرکردەیەکی خێڵەکیی یاخود ئایینیی یاخود خاوەن زەویدان.

## نەتەوەخوازیی کوردی:

٦. کوردەکان زۆرجار لەدژی دەسەڵاتدارە بیانییەکان ڕاپەڕیوون، زوربەی جاریش شۆڕشەکانیان -لەم ساڵانەی دوایی و لە ڕابردووشدا- لەبەر حەزی سەرکردە خێڵەکییەکان بووە کە حەزیان کردووە بەبێ هیچ لەمپەرێک بە ئازادی دەسەڵاتەکانیان پیادە بکەن. جگە لەو سنورە سیاسییە نێودەوڵەتییانەی کە کوردەکانی دابەش کردووە، زۆر دەمێکە ڕکابەریی خێڵەکییانە و سەختییەکانی پەیوەندییکردن لەو وڵاتە شاخاوییەدا کە تیایدا نیشتەجێن، بووەتە ڕێگر لەبەردەم بوونی یەکێتییەکی پتەوتر لەناویاندا.
دەتوانرێت سەرەتای نەتەوەخوازییە هاوچەرخەکەی ئێستایان بگەڕێنرێتەوە

بــۆ کۆتاییەکانــی ســەدەی نــۆزدە و ســەرەتاکانی ســەدەی بیســت. یەکــەم رۆژنامــەی کــوردی لــە ســاڵی ١٨٩٧ لــە قاهیــرە چاپکــرا و لــەو کاتــەوە مــاوە مــاوە لــە شــوێنی جیاجیــا بــڵاو کراوەتــەوە (بــۆ نمونــە لــە شانشــینی یەکگرتــوو). لــە ســاڵی ١٩٠٩دا لــە قوســتەنتنیە یانەیەکــی سیاســیی کــورد دامەزرێنــرا، دواتریــش لــە بەغــدا و موســڵ یانــەی تــری لەوجــۆرە دامەزرێنــران. لــەو کاتــەدا، کوردانــی دیــوان و ئەنجومەنــی پیرانــی دەوڵەتــی عوســمانی دەســتیان کــرد بــەوەی لەپێنــاو دۆزی کــورددا خەبــات بکــەن.

٧. لــە دوای جەنگــی یەکەمــی جیهانییــەوە نوێنەرانــی کــورد لــە کۆنفرانســی ئاشــتیی پاریــس و هەروەهــا لــە پەیماننامــەی سیڤریشــدا بەشــدار بــوون، کــە ئەمــەی دواییــان شانشــینی یەکگرتــو و فەرەنســا و ئیتاڵیــای تێدا بەشــدار بــوون و دواتــر لەگــەڵ تورکیــادا لــە مانگــی ئابــی ١٩٢٠ دا کۆتاییــان پــێ هێنــا، ئــەو پەیماننامەیــە مافــی ئۆتۆنۆمــی لەســەر بنەمــای هەرێمیــی لــەو ناوچانەدا کــە کورد زۆرینــەن و – بــەو مەرجــەی خەڵکەکــە بیانەوێــت و کۆمەڵــەی گــەلان رەزامەنــد بێــت – مافــی دروســتکردنی دەوڵەتــی ســەربەخۆی لــە ناوچــە کوردییەکانــی تورکیــا و عێراقــدا بــە کــورد رەوا بینیبــوو. بــەڵام بەهــۆی نارەزایــی تورکەکانــەوە کــە لەژێــر ســەرکردایەتیی کەمــال ئەتاتورکــدا بــوون، ئــەم پەیماننامەیــە قبــوڵ نەکــرا و پێشــنیارەکانی ســەبارەت بــە کــورد لــە پەیماننامــەی لۆزانــدا دووبــارە نەکرانــەوە، کــە ئــەم پەیماننامەیــەی دوایی لــە تەمــوزی ١٩٢٣دا لەنێوان شانشــینی یەکگرتــو و تورکیــادا واژوو کــرا.

٨. یەکەمجــار پارتــی ســەربەخۆیی کــورد لــەدوای جەنگــی یەکەمــی جیهانییــەوە لــە ســوریا دامــەزرا. کوردانــی بەیــروت لــە لوبنــان و لــە رابردووشــدا کوردانــی دیمەشــق چالاکانــە بانگەشــەیان بــۆ دۆزی کــورد و بزوتنــەوەی پان–کوردیــی دەکــرد.

**تورکیا:**

٩. ئـەو سیاسـەتی بەخۆرئاواییبـوون و بەعەلمانیبوونـەی کـە کۆمـاری نوێـی تورکیـا گرتویەتیـە بـەر، شۆڕشـێکی تونـدی کـوردی لـە سـاڵانی ١٩٢٥ - ٢٦ دا بـەدوای خۆیـدا هێنـا، کـە بەشـێوەیەکی سـەرەکی هۆکارەکـەی بریتـی بـوو: لـە نەیارێتیـی ئاینیـی لـە دژی سیاسـەتەکانی حکومـەت: شۆڕشـی هاوشـێوەش لـە دواتـردا و لەسـاڵانی ١٩٣٠ و ١٩٣٧-٣٨ دا هەڵگیرسـان.

١٠. سیاســەتی تــورک: سیاســەتی توانــەوە بــووە و کــورد وەکــو کەمینــە ددانــی پێــدا نەنــراوە. لــە شــارە کوردییەکانــدا قوتابخانــە دانــرا بــۆ ئــەوەی کــوردەکان فێــری زمانــی تورکــی بکــەن، قســەکردن بــە زمانــی کــوردی و لەبەرکردنــی جلوبەرگــی کــوردی لەمپــەڕی خراوەتــە ڕێ، لــە هەمــان کاتــدا، ڕێگــە و هێڵــی شــەمەندەفەر گەیەنراونەتــە دورتریــن ناوچەکانــی خۆرهــەڵات، ئەمــەش لەپێنــاو هاندانــی خەڵـک کـە واز لـە شـێوازی ژیانـی کۆچـەری بهێنـن و نشـیتەجێ ببـن، هەروەهـا هەوڵێکـی زۆر دراوە کـە بـۆ بەرەوپێشـبردنی شـێوازە سـەرەتاییەکانی کشـتوکاڵکردن، ئەمـەش لەپێنـاو لاوازکردنـی سیسـتمە خێڵەکیـی و دەرەبەگایەتییـەکان و بـۆ ئـەم مەبەسـتەش پەنـا براوەتـە بـەر دورخسـتنەوەی هەنــدێ لــە ســەرکردە خــاوەن دەســەڵاتەکانی ناوچەکــە و دابەشــکردنی زەویــوزارەکان.

١١. پارتـی دیموکـرات کـە سـکرتێرەکەی بەڕێـز عەدنـان مەندەرەسـە، ناوبـراو لـە سـاڵی ١٩٥٠وە تاوەکـو کودەتاکـەی مانگـی ئایـاری ١٩٦٠ سـەرۆک وەزیـر بـوو، لـە دەنگدانەکانـدا پشـتیوانی کـوردی شـارەکانی خۆرهەڵاتـی تورکیـای بەدەسـت هێنـا. لـە مانگـی کانونـی یەکەمـی ١٩٦٠ دا راپۆرتـەکان باسـیان لـەوە دەکـرد کـە ٥٥ خـاوەن زەویـی خۆرهەڵاتـی تورکیـا، کـە لـەدوای کودەتاکـەوە

دەستگیر کرابوون، بە زۆرەملێ لە خۆرئاوای وڵاتەکە نیشتەجێ کراون. لە مانگی کانونی دووەم، ٤٩ کەسیان بەتۆمەتی هەوڵدان بۆ دروستکردنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کورد دادگایی کراون، لەگەڵ ئەوەشدا، ٢٧ لەم تۆمەتبار کراوانە لە سەردەمی رژێمی پێشووەوە دەستگیر کراون و ئەوانی تر لە مانگی ئایاری ١٩٦٠ەوە خراونەتە زیندانەوە.

١٢. لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٦٠دا رادیۆیەکی نوێ لە ئەرزروم دامەزرێنرا تاوەکوو پەخش بۆ خۆرهەڵاتی تورکیا بکات، کە خەڵکەکەی بە سەختی بەرنامەکانی ئەنقەرەیان پێ دەگەیشت و دەیانتوانی گوێ لە پەخشە کوردییەکانی ئێریڤان لە یەکێتی سۆڤیەت و پەخشی کوردییەکەی بەغدا بگرن.

**ئێران**:

١٣. لە کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانیدا، کورد لە هەندێ ناوچەی ئێراندا توانی سەربەخۆیی خۆی بسەپێنێت و تا ئەو کاتەی رەزا خان (کە دواتر بووە رەزا شا) کە هەتا ساڵی ١٩٢١ حوکمی نەگرتبووە دەست، ئەوا کوردەکان ملیان بۆ نەدا. لەو کاتە بەدواوە سەرکردە خێڵەکییەکان نێردرانە ناوچەکانی تر، دەست بەسەر زەوییەکانیاندا گیرا و کۆنترۆڵی سەربازیی بەسەر ناوچە کوردییەکاندا سەپێنرا. دوای چوونی هێزەکانی بەریتانیا و سۆڤیەت بۆ ناو ئێران لە ساڵی ١٩٤١ دا -بۆ رێگرتن لە ئەگەری کودەتایەکی ئەڵمانیی- و رفاندنی رەزا شا، هەندێ لە سەرکردە خێڵەکییەکان گەرانەوە بۆ ناوچەکانی خۆیان و دوبارە دەسەڵاتی خۆیان سەپاندەوە. قازی محەمەد کە سەرکردەیەکی ناوچەیی کورد بوو خۆی لە مهاباد دامەزراند و لە سەردەمی ئەو "ئۆتۆنۆمی"یەی پارێزگای ئازربایجانی ئێران کە لەنێوان ساڵانی ١٩٤٥-٤٦ بە پشتیوانیی روسیا هاتبووە کایەوە، "کۆمارێکی کوردی"

راگەیاند، بەڵام ئەم کۆمارە بەرگەی کشانەوەی سۆڤیەتی لە ساڵی ١٩٤٦ لە ئێران نەگرت و قازی محەمەد و چەند کەسێک لە هاوەڵەکانی لە سەرەتای ساڵی ١٩٤٧ دا لەسێدارە دران.

١٤. حکومەتی ئێرانیش هەر وەکوو حکومەتی تورکیا سیاسەتی تواندنەوەی گرتۆتەبەر.

## سوریا (کۆماری یەکگرتوی عەرەب):

١٥. کوردانی سوریا بەزۆری لە باکوری ئەو وڵاتە و نزیک لە سنورەکانی تورکیا دەژین، بەڵام کوردانی دیمەشق لە رووی سیاسییەوە چالاکتر بوون و چەند بانگەشەکارێکی ناسراوی کوردیان تێدا هەڵکەوتووە. خالید بەکداشی سەرکردەی کۆمۆنیستی دوورخراوە، کەسێکی کوردە.

١٦. لە کانونی یەکەمی ١٩٦٠ دا، لە سوریا دادگاییکردنی ٣٢ کورد دەستی پێ کرد کە تۆمەتبار کرابوون بەوەی هەوڵی لەتکردنی خاکی کۆماری یەکگرتوی عەرەب و دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردیی سەربەخۆ دەدەن.

## عێراق:

١٧. دوای ئەوەی کۆمەڵەی گەلان لە ساڵی ١٩٢٥ دا پێشنیاری کرد کە دەبێت ویلایەتی موسڵ بۆ هەمیشە بخرێتە سەر دەوڵەتی عێراق، حکومەتی عێراق چەند هەنگاوێکی ناوە وەک دامەزراندنی کاربەدەستانی کورد و بەکارهێنانی زمانی کوردی لە دادگا و قوتابخانەکان. پێش کۆتاییهاتنی ئینتیدابی بەریتانیا لە ساڵی ١٩٣٢، حکومەتی عێراق راگەیەنراوێکی فەرمی بڵاو کردەوە و تیایدا زەمانەتی مافەکانی کورد و کەمینەکانی تری راگەیاند.

١٨. بەڵام، لەنێوان ساڵانی ١٩١٩ و ١٩٤٣ دا چەند راپەڕینێکی کاریگەری کوردەکان رویاندا، هەرە تازەکەیان ئەوەی مەلا مستەفای ناوچەی بارزانە کە لە ساڵی ١٩٤٣دا رویدا و هۆکارەکەشی ئەو نارەزاییە بوو کە بەهۆی خراپ بەڕێوەبردنی ناوچە کوردییەکان و خراپ دابەشکردنی خۆراکەوە سەری هەڵدابوو. لەدوای ئاگربەستێکی کاتییەوە، شۆڕشەکە لە ساڵی ١٩٤٥ دا سەری هەڵدایەوە. دواجار مەلا مستەفا کشایەوە بۆ ئێران و پەیوەندی کرد بە "کۆماری کورد"ەوە و لە ساڵی ١٩٤٧ دا چووە یەکێتی سۆڤیەت.

١٩. لە عێراق، لەپێش جەنگی دووەمی جیهانییەوە هەندێ لە کوردەکان، بۆ نمونە جەنەراڵ بەکر سدقی، پۆستی بەرزیان بەدەست هێناوە. لە سەردەمی جەنگەوە چەند پرۆژەیەکی پەرەپێدان لە ناوچەکانی کوردستان جێبەجێ کراون، کێڵگەی نەوتیی کەرکوک لەم پرۆژانەوە نزیکە و کوردانی عێراق لە کوردانی وڵاتانی دراوسێ هەلی زیاتری ئەزمونی پیشەسازییان لەبەردەمدا بووە.

٢٠. ئەو دەستورە کاتییەی کە لە دوای شۆڕشی تەموزی ١٩٥٨دا دەرکرا دەڵێت: هەموو هاووڵاتیان بەبێ لەبەرچاوگرتنی رەگەز و نەتەوە و زمان و ئایینیان، لەبەردەم یاسادا یەکسانن و، کورد و عەرەب لە کۆمارەکەدا هاوبەشن. لەو سێ ئەندامەی کە ئەنجومەنی دەوڵەت پێک دەهێنن یەکێکیان کوردە. هێمای نەتەوەیی نوێی عێراق خەنجەرێکی کوردیی شانبەشانی شمشێرێکی عەرەبی لەخۆدەگرێت و دوو ئەستێرەکەی سەر ئاڵاکە (کە جێگەی تاجەکەیان گرتۆتەوە)، هێمای هاوکاریی نێوان کورد و عەرەبن. لەدوای شۆڕشەوە، هەندێ لە زیندانیانی سیاسیی کورد ئازاد کران، مەلا مستەفا لە مەنفاکەی لە یەکێتی سۆڤیەت گەڕایەوە و ئێستا سەرکردایەتی

پارتـی دیموکراتـی کـورد دەکات کـە زیاتـر بە حزبـی پارتـی ناودەبرێـت و یەکێکە لـەو حزبـە سیاسـییانەی کـە لـە کانونـی دووەمـی ١٩٦٠دا مۆڵەتـی وەرگـرت.

٢١. ئـەو بەڵێنانـەی کـە رژێمـی قاسـم لـە سـەرەتادا بـە کـوردی راگەیانـد ئـەوا نەهێنراونەتـە دی، بەهـۆی خراپیـی بەڕێوەبردنـی چاکسـازیی زەویـوزارەوە نارەزاییەکـی زۆر سـەری هەڵـداوە. سیاسـەتەکەی قاسـم کـە لەچوارچێـوەی سیاسـەتی "پەرتکـە و زاڵ بـە" دا خێڵەکان بەگژ یەکتری دا دەکات، کێشـەی کوردی بەتـەواوی چارەسـەر نەکـردووە. لـەم چەنـد مانگـەی رابـردوودا بارزانییـەکان زیاتـر لەجـاران لـە قاسـم دوور کەوتوونەتـەوە و سـەبارەت بـە شـەڕی خێڵەکانیـش، بارزانییـەکان بـە هاوکاریـی خێڵـە هاوپەیمانەکانیـان توانیوویانـە گـورز لـە خێڵەکانـی لایەنگـری قاسـم، بـۆ نمونـە: رێکانـی و زێبارییـەکان بوەشـێنن و کەسـە دەسـەڵاتدارەکانیان دەسـتگیر بکـەن. دوابـەدوای ئەم شـەڕانە، دەسـەڵاتدارانی عێـراق بەتـەواوی دەسـەڵاتیان بەسـەر ناوچـە خێڵەکییەکانـی کوردسـتانەوە نەمـا و، هێـزی پۆلیسـە ناوخۆییـەکان، کـە زوربـەی ئەندامەکانـی بریتـی بـوون لـە کوردانـی ناوچەکـە، رێکخسـتنیان شـێوا. خێڵـەکان رێگـەی هاتوچۆیـان بـڕی. دەسـەڵاتدارانی عێـراق ناچـار بـوون هێـزە سـەربازییەکان بـە قەبارەیەکـی بەرچـاوەوە بجوڵێنـن و لـە هەفتـەی رابـردودا چالاکییـە زەمینییەکانیـان بـە پشـتیوانیی ئاسـمانیی ئەنجـام داوە. خێڵـەکان هەوڵیـان داوە تـا دەتوانـن خۆیـان لـە بەریەککەوتنـی راسـتەوخۆ لەگـەڵ هێزەکانـی حکومـەت بپارێـزن، ئەمـە لەکاتێکدایـە کـە پێدەچێـت هـەوڵ بـدەن خۆیـان لـە دەسـەڵاتی حکومـەت رزگـار بکـەن و رەنگـە کوردسـتانێکی ئۆتۆنۆمـی تارادەیەکـی زۆر خێڵەکیـی دروسـت بکـەن.

## بۆچونی کۆمۆنیستەکان لەسەر کورد

٢٢. نە وڵاتانی یەکێتی سۆڤیەت و نە هیچ وڵاتێکی کۆمۆنیستیی دیکە، کەسیان پشتیوانییەکی راستەوخۆیان بۆ ئۆتۆنۆمی، کە ئامانجی کوردەکانە، رانەگەیاندووە. لەبەر ئەوەی بوونی کوردستانێکی سەربەخۆ لەگەڵ سیاسەتی ئێستای سۆڤیەت بۆ خۆرهەڵاتی ناوەڕاست ناگونجێت، بەمشێویە جیابوونەوەی کوردانی عێراق لە دەوڵەتی عێراق ئەو شوێنپێیە لاواز دەکات کە یەکێتی سۆڤیەت لە عێراق بەدەستی هێناوە و یەکڕیزیی عەرەبیش بەهێزتر دەکات. لەگەڵ ئەوەشدا، پروپاگەندەی سۆڤیەت بەشێوەیەکی هەلپەرستانە نارەزاییەکانی کوردیان بەکارهێناوە بەرامبەر سیاسەتەکانی ئێران و تورکیا و بەم دواییەش حکومەتی عێراق.

٢٣. لە مانگی ئازاری رابردوو، پەخشی بەرنامە کوردییەکان لە یەکێتی سۆڤیەت بۆ ١٠,٥ کاتژمێر لە هەفتەیەکدا بەرزکرایەوە و لە مانگی ئایاردا، پەیکی ئێران کە رادیۆی فارسیی حزبی تودەیە و بارەگاکەی لە ئەڵمانیای خۆرهەڵاتە، پەخشی بە زمانی کوردی دەستپێکردەوە، لە مانگی تەموزدا ماوەی پەخشی کوردییەکەی زیاد کرد و لە ئێستادا هەفتانە نزیکەی شەش کاتژمێر پەخشی کوردی هەیە. دەنگی گەلی ئێران کە لە ئازربایجانی سۆڤیەتەوە بە زمانی فارسی پەخش دەکات، داوای مامەڵەیەکی باشتر لەگەڵ کوردانی ئێراندا کردووە و، (رادیۆکەشمان) کە رادیۆیەکی نیمچە نهێنیی تورکیە لە ئەڵمانیای خۆرهەڵات دا ئەوا هەوڵی داوە هەستە دژەحکومەتییەکان لەلای کوردی تورکیا بوروژێنێت.

٢٤. ئەو بڕیارەی کە لە کۆبونەوەی کۆڕبەندی لاوانی جیهان لە ٢٥ی تەموز بۆ ٣ی ئاب لە مۆسکۆ دەرکرا، دەڵێت: "کوردەکان بەتەواوی لە

هەمـو مافێکـی نەتەوەیـی بێبـەری کـراون و لـە بارودۆخێکـی نالەبـاری ئابوریـی و لەژێـر زەبروزەنگـی پۆلیسـدا دەژیـن".

٢٥. ئێمـە حـەز ناکەیـن هانـی قسـەکردن لەسـەر ئـەم بابەتـە بدەیـن، لـەوەش خراپتـر ئەوەیـە کـە پێمـان خـۆش بێـت کـە وا دەریبخەیـن کـە بـە جۆرێـک لـە جـۆرەکان پەیوەندیداریـن بـەو نائارامییانـەوە کـە بـەلای حکومەتـی خاونشـکۆ "شـاژن"ەوە بـە رەهایـی بابەتێکـی ناوخـۆی حکومەتـی عێراقـە. ئەوەی لەپێشـەوە باسـکرا تەنیـا بـۆ زانیاریـی بەڕێزتانـە، لەوانەشـە بتوانیـت کـە بـە وریاییـەوە لەگـەڵ کەسـە متمانـە پێکراوەکانـدا باسـیان لێـوە بکەیـت.

(وێنەیـەک بـۆ نێـردەی بـاڵای شانشـینی یەکگرتـوو لـە هەمـوو وڵاتانـی کۆمۆنوێڵـز و باڵیـۆزی خاوەنشـکۆ "شـاژن" لـە دبلـن)

**نهێنی - تەنیا بۆ بەرچاوی شانشینی یەکگرتوو***
**ژمارەی تۆمارکردن RR 6/10**
**رەشنوسی پلە ١**
**پلەبەندیی ئاسایش**

**بۆ: - راپۆرتی بەشی لێکۆڵینەوە**
**کێشەی کورد لە عێراق، ١٩٦٣ - ١٩٧١**

**پوختە**:

١. پێشەکی. وا دەزانرێت کە کوردی عێراق ١٥ تا ٢٠ لەسەدی کۆی دانیشتوان پێک دەهێنن (لە ئاماری ساڵی ١٩٦٥ دا ٨,٣ ملیۆن بون). لە سەردەمی پاشایەتیدا چەندین شۆڕشی خێڵەکیی کوردەکان رویانداوە. کاتێ قاسم لە ساڵی ١٩٥٨ دا دەسەڵاتی گرتە دەست، لە سەرەتادا ماوەیەک هاوکاریی لەنێوان ئەو و کوردەکاندا هەبو، بەلام لە ساڵی ١٩٦١ دا مەلا

---

* شیاوی ئاماژە پێدانە، ئەم بەڵگەنامە نهێنییە کە ڕاپۆرتێکی لێکۆڵینەوەیی گرنگە لە بارەی ڕەهەندی مێژوویی کورد و شۆڕشی ئەیلول و پەیوەندییە سیاسییەکانیی و هەڵوێستی وڵاتان لە بارەیەوە، بەرواری نووسینی لەسەر نییە. هەروەها هەر ئەم بەڵگەنامە نهێنییەش نییە کە بێ-بەروارە، بگرە چەند بەڵگەنامەیەکی دیکەش ئاماژە بە بەرواری نووسینیان نەکراوە و زۆربەشیان نهێنین، منیش بە پێی زانیارییە مێژووییەکانی ناو بەڵگەنامە بێ-بەروارەکان، لە قۆناغبەندی ‹ڕۆژ و مانگ و ساڵ›ی ڕێکخستنی بەڵگەنامەکاندا، ئەوا بەڵگەنامە بێ-بەروارەکانم داناوە، لەم ڕووەشەوە پرسم بە کاک ‹›پاسار›› کردووە و ئەویش پێشنیار و بۆچوونەکانمی بەلاوە پەسەند بوو. بۆیە هەر بەڵگەنامەیەکی دیکەی بێ-بەروار لەم پەرتووکەدا هەبێت، ئەوا هەوڵمداوە بە پێی زانیارییەکانی ناوی نزیک ببمەوە لە کاتی نووسینی بەڵگەنامە بێ-بەروارەکە و، هەر یەکەشیان لە شوێنی خۆیاندا لە پەراوێز دا ئاماژەی بۆ دەکەم کە بۆچیی و هۆکارەکانی چین کە لەو شوێنەدا لە ڕیزبەندی بەڵگەنامەکاندا ئەو بەڵگەنامە بێ-بەروارەم جێ کردۆتەوە!؟ شەریف هەژاری.

مستەفا بارزانی و پارتی دیموکراتی کوردستان شۆڕشێکی بەرفراوانیان لەدژی حکومەت بەڕێوەبرد. ئەو جەنگەی شۆڕشەکەی لێ کەوتەوە، هیچ کام لە لایەنەکان سودێکی یەکلاکەرەوەیان لێ نەبینی.

٢. لە ساڵی ١٩٦٣ دا حکومەتی بەعس شەڕی دژی کوردەکان دەست پێ کردەوە، بەڵام دیسانەوە بنبەستێکی سەربازیی لێ کەوتەوە. لە مانگی شوباتی ١٩٦٤ دا ئاگربەستێک راگەیەنرا، بەڵام دیسانەوە شەڕەکە لە ساڵی ١٩٦٥ دا دەستی پێ کردەوە.

٣. لە مانگی حوزەیرانی ١٩٦٦ دا، د. بەزازی سەرۆک وەزیری عێراق پلانێکی دوانزە خاڵیی بۆ ئاشتی لە کوردستاندا راگەیاند، بەڵام کاتێ لە مانگی ئاب دا لە پۆستەکەی دورخرایەوە، هیوای رێکەوتنیش نەما.

٤. لە ئازاری ساڵی ١٩٧٠ کورد و حکومەتی بەعس لەسەر چارەسەرێکی نوێ رێککەوتن، کە تیایدا کورد لە چوارچێوەی کۆماری عێراقدا خۆبەڕێوەبەرێتی بدرێتێ. بەڵام بەرەوپێشچوونەکان لە جێ بەجێکردنی ئەم رێکەوتنەدا بە خاوی بەڕێوە چووە و، ئاست و سروشتی ئەو خۆبەڕێوەبەرێتییەی کورد، چارەسەری یەکلاکەرەوەی بۆ نەکراوە.

٥. کێبڕکێی خێڵەکی لەناو ریزەکانی کورددا هەیە، لەنێوان کەسە خێڵەکییەکان کە بارزانی سەرکردایەتییان دەکا و کەسە چەپڕەوە شارنشینەکانیش کە لەلایەن جەلال تاڵەبانی و ئیبراهیم ئەحمەدەوە سەرکردایەتی دەکرێن، لەتبونێک هەیە. تاڵەبانی و ئەحمەد لە ساڵی ١٩٦٤ دا لە پارتی دیموکراتی کوردستان کرانە دەرەوە و لەو کاتەوە دەسەڵاتی باڵا لەدەست بارزانیدایە، بەڵام ئەگەر ئاشتییەکی ڕاستەقینە دابمەزرێت،

ئەوا پێدەچێت کەسە رادیکاڵەکان بتوانن کاریگەریی خۆیان سەر لەنوێ دەربخەنەوە.

٦. رێکخستنی سوپایی کورد: تەکتیکە پارتیزانییەکانیان بە سەرکەوتوویی بەکار هێناوە.

٧. هەڵوێستی وڵاتانی تری ناوچەکە. لە ساڵی ١٩٦٣ سوورییەکان هێزیان بۆ یارمەتیدانی حکومەتی عێراق رەوانە کرد، بەڵام لەو کاتەوە لە ناکۆکییەکەدا بەشدارییان نەکردووە. تورکەکانیش بەشدار نین، کە بە نزیکەی ٣ ملیۆن کوردەوە، خۆیان کێشەیەکی بەرچاویان هەیە کە کێشەی کوردە. ئێران بە نهێنی لە رووی چەک و پارەوە یارمەتی کوردەکان دەدات، مەبەستە سەرەکییەکە ئەوەیە: رێ لە دەستێوەردانی سۆڤێت بۆ کوردەکان بگرێت و مەبەستی گشتیشی لاوازکردنی حکومەتی عێراقە. ئیسرائیلیش بە هەمان شێوە بە نهێنی چەک و راوێژکاری سەربازیی داونەتێ.

٨. یەکێتی سۆڤێت بەردەوام بانگەشەی بۆ ئەوە کردووە کە دەبێت کورد لە چوارچێوەی کۆماری عێراقدا مافە نەتەوەییەکانی بدرێتێ و لە هاندانی رێکەوتنەکەی ساڵی ١٩٧٠ دا لەپشتی پەردەوە بوونی هەبووە. هەرچەندە یەکێتی سۆڤێت لە رێگەی مەعنەوییەوە پشتیوانی کوردی کردووە، بەڵام خۆی و وڵاتە شیوعییەکانی دیکەش کۆمەکێکی ماددی ئەوتۆیان نەکردوون.

٩. سیاسەتی حکومەتەکەی خاوەنشکۆ "شاژن"، سیاسەتی بەشدارینەکردن بووە. ناکۆکییەکەی کورد بایەخێکی گرنگی بۆ بەریتانیا هەیە، ئەویش بەهۆی ئەگەری زیانگەیاندن بە دامەزراوە نەوتییەکانی باکوری عێراق لەکاتی شەڕەکاندا، دیوەکەی تری ئەم دراوەش ئەوەیە: ئەگەر کێشەی کورد

چارەسەر ببێت، ئەوا رژێمی عێراق لەتوانایدا دەبێت هێزەکەی لە باکوری ولاّتەوە بکێشێتەوە و رەنگە هانیان بدات لە کەنداوی فارس دەست بدەنە سەرکێشیی دەرەکی.

بەلاّم لە رابردودا جاروبار قۆناغبەندی کراوە لە گەیاندنی چەکە داواکراوەکانی سوپای عێراق، ئەوەش بۆ رێگری کردن لە بەکارهێنانی ئەو چەکانە لەدژی کوردانی سیڤیل. عێراقییەکان بە هەڵە گومانی ئەوەیان لەلا دروست بووە کە حکومەتی خاوەنشکۆ "شاژن" لە بواری چەکدار کردنی کوردەکاندا هاوکاریی ئێران دەکات. جێی ئاماژەیە: ئەم لایەنە پەیوەندیدارانە پرسی کوردیان لەگەڵ نەتەوە یەکگرتووەکاندا باس نەکردووە، بۆیە حکومەتی خاوەنشکۆ "شاژن" ئەرک نەبووە لەسەری کە هەڵوێستی خۆی لەسەر ئەم پرسە یەکلا بکاتەوە و لەکاتی پێویستدا رایگەیەنێت.

**ئەنجامەکان:**

١٠. پیادەکردنی رێکەوتنەکەی ساڵی ١٩٧٠ چەند بەرەوپێشچونێکی بەخۆوە دیوە، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا چەند کێشەیەکی گرنگ هەن، بۆ نمونە: بڕیاردانی ورد لەبارەی ئاست و سروشتی خۆبەڕێوەبەرێتییەکەی کورد، هەروەها ئەو داهاتەی بدرێت بە ناوچە کوردییەکە و، داهاتوی هێزەکانی کورد (پێشمەرگە) و پارتی دیموکراتی کوردستان، کە هێشتا بە وردی یەکلا نەکراوەتەوە. نازانرێت کە ئەم رێکەوتنە تا کەی دەبێتە دیفاکتۆ و دەرکەوتنی نارەحەتی لە ناو کوردەکاندا بەهۆی خاویی پیادەکردنی رێکەوتنەکەوە لە زیادبووندایە. ئەگەر ئەمە بەردەوام بێت، ئەوا رەنگە شەڕێکی ئەوەندە سەخت سەر هەڵبدات کە زۆری نەمابێت رێکەوتنەکە مرداربکاتەوە.

١١. بەردەوامیی رێکەوتنەکە لە بەرژەوەندی حکومەتی عێراق و

کوردەکانیشدایە. کوردەکان بەهۆی شەڕەوە نارەحەتیی زۆریان چەشتووە، بەڵام بە گشتی کاریگەرییەکانی ئەم شەڕە زیانی بە عێراقیش گەیاندووە و هیچ حکومەتێک نیە لە بەغدا دا کە لەکاتی شۆڕشی کوردەکاندا بتوانێت خۆی بە گەورەی ماڵەکەی خۆی بزانێت. سەبارەت بە بریتانیا، ئاشتی لە کوردستان واتە نەمانی هەڕەشە لە بەدەستهێنانی نەوت لە باکوری عێراق دا.

١٢. دیوەکەی تری ئەم دراوەش ئەوەیە، کاتێ پێویست نەکات عێراق سوپاکەی لە باکوردا بهێڵێتەوە، رەنگە توشی کەڵکەڵەی سەرکێشیی دەرەکی ببێت - ئێران بێت یان کەنداو (بەتایبەتی لەدوای کشانەوەی هێزەکانی بریتانیا)، یاخود لە "بەرەی خۆرهەڵات"ەوە روبەڕوی ئیسرائیل ببێتەوە. دژبەیەکیەکە لەوەدایە: ئاشتی لە کوردستان رەنگە مەترسی لەسەر ئارامیی ناوچەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستی بەدوادابێت. ئەمەش نە بەلای ئێرانەوە باشە: کە بە چارەسەربونی کێشەی کورد چەکێکی دژ بە رژێمی عێراق لەدەست دەردەهێنێت و، نە بەلای کوەیتیشەوە، کە سەرەڕای داننانی فەرمی عێراق لە ساڵی ١٩٦٣دا بە سەربەخۆیی کوەیت لە چوارچێوەی سنورەکانی ساڵی ١٩٣٢، هێشتا کوەیت گومانی هەیە لە ئارەزووی عێراق بۆ ئەودیو سنورییەکانی.

١٣. ئەگەر کوردی عێراق رێکەوتنێکی بەردەوام بەدەست بهێنن، ئەمە رەنگە تێکۆشانی کوردانی ئێران و تورکیاش چالاک بکاتەوە. بە بەراورد لەگەڵ کوردی عێراق، لە ئێستادا کوردی ئێران بێدەنگن، بەڵام لە تورکیا مەترسییە چاوەڕوانکراوەکەی راپەڕینی کوردان یەکێک بووە لە هۆکارەکانی پشت سەپاندنی یاسای سەربازیی لە مانگی نیسانی ١٩٧١ دا.

١٤. لـە سـاڵی ١٩٦٣ دا، ترسـی ئـەوە لەئـارادا بـوو کـە یەکێتـی سـۆڤێت ڕەنگـە بـە شـێوەیەکی سـەرەکی پشـتی کوردانـی عێـراق بگرێـت. ئەمـە پێدەچـوو مەترسـی بێـت بـۆ ئاسایشـی وڵاتانـی ناوچەکـە و ئاسایشـی خـودی عێراقیـش. بـەڵام هەنگـاوی لـە پێشـینەی یەکێتـی سـۆڤێت پـەرە پێدانـی پەیوەندییەکانیەتـی لەگـەڵ عێـراق و جیهانـی عـەرەب، هەربۆیـە تاڕاددەیەکـی زۆر خـۆی لـە پشـتیوانیی مەعنـەوی بـۆ کـوردەکان قەتیـس کـردووە. گومانـی تێـدا نیـە کـە یەکێتـی سـۆڤێت بەشـداربووە لـە نزیکردنـەوە و تەنانـەت لـە پیاچوونـەوەی ڕێکەوتننامەکـەی سـاڵی ١٩٧٠ یـش دا.

١٥. لـە مـاوەی جێـی مەبەسـتی لێکۆڵینەوەکەدا، کـوردەکان بەشـێوەیەکی باش یەکبەرەییـان پاراسـتووە و ڕێگەیـان نـەداوە حکومـەت چارەسـەری سـەربازییان بەسـەردا بسـەپێنێت. بـەڵام دابەشـبوون لەنـاو ڕیزەکانیانـدا هەیـە و لەوانەیـە لەگـەڵ بەدیهاتنـی ئاشـتیی بەردەوامـدا، ئـەم جیاوازییانـە قووڵتـر ببنـەوە. جگـە لـە کێبڕکێـی خێڵەکـی، دابەشـبونی سـەرەکیی لەنێـوان کەسـە خێڵەکییـەکان بـە سـەرکردایەتی مـەلا مسـتەفا بارزانـی و ڕۆشـنبیرە شارنشـینە توندڕەوەکاندایـە کـە جـەلال تاڵەبانـی و ئیبراهیـم ئەحمـەد نوێنەرایەتییـان دەکـەن.

هاوپێـچ: وەرگێڕانـی بەشـێک لـە ڕێکەوتننامەکـەی ئەنجومەنـی سـەرکردایەتی شۆڕشـی عێـراق کـە لـە ١١ی ئـازاری ١٩٧٠دا بـڵاو کراوەتـەوە.

تێبینـی: تـەواوی لێکۆڵینەوەکـە خراوەتـە بـەردەم ئـەو کەسـانەی کـە ڕەنگـە وردەکارییـەکان زۆر جێگـای گرنگـی پێدانیـان بێـت. ناردنـی کۆپـی لێکۆڵینەوەکـە بەنـدە بـە داواکارییەکانتانـەوە.

**هۆبەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست،**
**بەشی لێکۆڵینەوە،**
**فەرمانگەی دەرەوە و کۆمۆنوێڵز**

## ئەلف. پێشەکی

١. راپۆرتی ژمارە 9G/LR 6 ی ساڵی ١٩٦٣ باسی لە کێشەی کورد لە عێراقدا کردووە لەنێوان ساڵەکانی ١٩٥٨ تا ١٩٦٣. ئەم راپۆرتە لە پێشهاتەکانی دوای ساڵی ١٩٦٣ دەکۆڵێتەوە.

٢. لەوانەیە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست ٦ تا ٧ ملیۆن کوردی لێ بێت. رەگوڕیشەی رەگەزەکەیان ناڕوونە، خەسڵەتی جەستەیی چەند رەگەزێکی جیاجیایان لەخۆیاندا جێ کردۆتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، زمانەکەیان دەچێتەوە سەر هیندۆ ئەوروپی و پەیوەندییەکی نزیکی لەگەڵ زمانی فارسیدا هەیە. زۆرینەیان موسوڵمانی سوننەن، بەڵام چەند خێڵێکی کەمی شیعەشیان هەیە. ئەم رەگەزە ئازا و سەرسەختەی چیاکان بە یاخیگەریی بەناوبانگن. هەرگیز لە رووی سیاسییەوە وەکو نەتەوەیەک یەکیان نەگرتووە و بەزۆری لەچوارچێوەی ژیانی خێڵەکیدا بە ناکۆکی و جیاوازییە زمانەوانی و نەریتییەکانیانەوە ژیاون.

"کوردستان" - ئەو ناوچەیەی کە لێی دەژین تا رادەیەکی زۆر کۆمەڵگەیەکی یەکچەشنە و کورد زۆرینەی دانیشتوانەکەی پێک دەهێنێت - لە ئێستادا بەسەر تورکیا و عێراق و ئێراندا دابەش بووە و چەند بەشێکی بچوکیشی کەوتۆتە سوریا و یەکێتی سۆڤێتەوە.*

* پەیماننامەی سیڤەر (١٩٢٠) دروستکردنی کوردستانێکی خۆبەڕێوەبەری لەبەرچاو گرتبوو، بەڵام بەهۆی نەیارێتی تورکیاوە ئەم بیرۆکەیە هەرگیز دەنگی بۆ نەدرا. لەبری ئەوە، کوردەکان خۆیان

٣. وا دەزانرێت کە کوردی عێراق ١٥ - ٢٠٪ی کۆی دانیشتوانی وڵاتەکە پێک بهێنێت (لە ئاماری ساڵی ١٩٦٥ دا ژمارەیان ٨،٣ ملیۆن کەس بووە) - ئەم رێژەیەش لە رێژەی کورد لە هەر وڵاتێکی تر زیاترە. بەهۆی ئەوەی ناوچەکەیان شاخاوییە، کورد توانیوێتی تا راددەیەکی زۆر سەربەخۆیی خۆی لە حکومەتی ناوەند بپارێزێت. لە ناوچە خێڵەکییەکاندا، خواستی سەرەکییان ئەوەیە کە ئەم سەربەخۆییە بپارێزن و بە شێوە نەریتییەکەی خۆیان - کە جوتیاریی و مەڕدارییە - بەبێ دەستێوەردان بژین. بەڵام شارنشینەکان، کە ئێستا نزیکەی چواریەکی کوردانی عێراق پێک دەهێنن، لەم چەند ساڵەی دواییدا گرنگییان بە پرسی مافی یەکسان بۆ کورد لەچوارچێوەی دەوڵەتی عێراقدا داوە. بۆیە داواکاریی کوردانی عێراق لە یەککاتدا بریتییە لە: خۆبەڕێوەبەرێتی لە هەرێمە کوردییەکەدا و بەدەستهێنانی تەواوی مافەکانە هاوتای هاووڵاتییەکی عێراقی. دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردستان بۆ هەمو ئەو کوردانەی کە سنورە نێودەوڵەتییەکان دابەشی کردوون، داوایەکی هەنوکەیی نییە،* هەرچەندە دەمێکە ئەمە خەونی بەنزیکەیی هەموو کوردێک بووە.

٤. لە سەردەمی ئیدارەی بەریتانیادا (١٩٢٠ - ١٩٣٢)، هەنگاوگەلێک نراون بۆ بەرەوپێشبردنی بارودۆخی کوردەکانی عێراق، بەڵام هەوڵەکان بۆ دروستکردنی ئیدارەیەکی تایبەت بۆ شارە کوردییەکان بەهۆی چەند شۆڕشێکی خێڵەکییەوە کۆسپی هاتە رێ. لە ساڵی ١٩٣٢ دا کاتێ عێراق سەربەخۆیی تەواوی بەدەست هێنا، ئەو وڵاتە راگەیاندنێکی فەرمیی پێشکەشی کۆمەڵەی گەلان

---

لەوەدا دۆزییەوە کە لەتکرابوون لە نێو سنورە نێودەوڵەتییەکانی تورکیا و عێراق و سوریادا، لەکاتێکدا کە لە سەردەمی عوسمانیدا، تەنیا سنوری ویلایەتەکان جیای کردبوونەوە.

* لە پرۆگرامی ساڵی ١٩٦٦ی پارتی دیموکراتی کوردستاندا هاتووە کە کورد دەجەنگێت لەپێناو «ئازادی و بەدەستهێنانی خۆبەڕێوەبەرێتی کوردستانی عێراق لەچوارچێوەی کۆماری عێراقدا».

کـرد و تیایـدا زامنکردنـی مافەکانـی کـورد و کەمینەکانـی دیکـەی راگەیانـد. ئەمـە وایکـرد کـوردەکان لەگـەڵ عێراقییەکانـی دیکـەدا لەبـەردەم یاسـا و بوارەکانـی تردا یەکسـان بـن، و لـە هەمـو ئـەم بوارانـەدا زمانـی کـوردی هاوشـانی زمانـی عەرەبی بـە فەرمـی دابنرێـت و، ئەگـەر گونجـا کوردیـش لـە پۆسـتە فەرمییەکانـدا دابنرێـن. هەروەهـا بەڵێنـی ئـەوەش درا کـە بودجـەی فەرمـی دابنرێـت بـۆ ئـەوەی خوێندنـی سـەرەتایی بـە زمانـی کـوردی دەسـتەبەر بکرێـت. کەچـی حکومـەت گرنگییەکـی ئەوتـۆی بـۆ ئـەم بەیاننامەیـە دانەنـا و، زیاتر خـۆی بـە بەهێزکردنی دەسـەڵاتەکەی لـە کوردسـتاندا خەریـک کـرد. نارەزایـی کـوردەکان کۆمەڵێـک راپەڕینـی لـێ کەوتـەوە کـە هـەرە گرنگەکەیـان ئـەوە بـو کـە مـەلا مسـتەفا بارزانـی لـە سـاڵی ١٩٤٣ - ١٩٤٥ سـەرکردایەتی دەکـرد. سـوپای عێـراق ناوبـراوی تێکشـکاند و، خۆی دەربـازی ئێـران کـرد، لـەوێ پەیوەنـدی بـە "کۆمـاری مهابـاد"ە کورتخایەنەکـەوە کـرد. دوای رووخانـی کۆمارەکـە، بارزانـی لەگـەڵ کۆمەڵێـک لە شـوێنکەوتووەکانی رویانکـردە یەکێتـی سـۆڤێت.

٥. کاتـێ قاسـم لەسـاڵی ١٩٥٨ سیسـتمی پاشـایەتی روخانـد، بەڵێنـی ئـەوەی دا بـە کـورد کـە بـە یەکسـانی لەگـەڵ عەرەبـی عێراقـدا تەماشـایان بـکات و، رێگـەی بـە بارزانـی دا لـە مەنفـا بگەڕێتـەوە. بـەڵام دوای ماوەیـەک لـە هاوکارییکـردن، بۆچونـی کـورد لـە دژی حکومـەت بەهێـز دەبـو، ئەمـەش بەهـۆی پشتگوێخسـتنی بەرژەوەندییەکانـی کـورد و چەکدارکردنـی خێڵـە نەیارەکانـی بارزانـی. لـە مانگـی حوزەیرانـی ١٩٦١ دا، بارزانییـەکان چەکیـان هەڵگـرت و دوژمنەکانیـان تێـک شـکاند. پاشـان بارزانییـەکان بـە پشـتیوانی خێڵەکانـی دیکـە و ئەندامانـی پارتـی دیموکراتـی کوردسـتان دەسـتیان بەسـەر بنکـە و بارەگـا حکومییەکانـی باکـوری عێراقـدا گـرت. لـە کۆتایـی مانگـی ئابـی هەمـان سـاڵدا، ئـەو ناوچـە چیاییـە نیمچە بازنەییـەی کـە لەنێـوان باکـوری خۆرئاوای موسـڵ تاوەکـو باشـوری خۆرهەڵاتی کەرکـوک درێـژ دەبێتـەوە بەکـردار کەوتبـووە ژێـر دەسـتی کـوردەوە. ئینجـا

بارزانی کۆمەڵێک داوای روبەڕوی قاسم کردەوە، یەکێک لە داواکارییەکان بریتی بوو: لە خۆبەڕێوەبەرێتی بۆ کورد، کە قاسم لە وەڵامی ئەمەدا ئەوا لە مانگی ئەیلولدا هێرشێکی سەربازیی سەرانسەری بۆسەر کوردەکان ئەنجامدا. شەڕ و پێکدادانەکان بەردەوام بون و تا کاتی کەوتنی قاسم لە شوباتی ١٩٦٣ دا، ئەوا هیچ کام لەم دوو لایەنە سەرکەوتنێکی یەکلاکەرەوەی بەدەست نەهێنا. هێزە حکوومییەکان شارە سەرەکییەکانی باکوری عێراق - موسڵ، هەولێر، کەرکوک، و سلێمانی- یان لە ژێر دەستدابوو، بەڵام زوربەی ناوچەکانی تر لەبن دەستی کوردەکاندا بوو.

## بێ. شەڕی کورد، ١٩٦٣ - ١٩٦٩

### هەڵمەتەکەی بەعسی ساڵی ١٩٦٣

٦. هەر کە حزبی بەعس لە شوباتی ١٩٦٣ دا دەسەڵاتی گرتە دەست، ئاگربەستێک راگەیەنرا. لە مانگی دواتردا دەستکرا بە دانوستان و راگەیەندرا کە حکومەت ئامادەیە "لەسەر بنەمای لامەرکەزی مافە نەتەوەییەکان" بە کورد ببەخشێت. داواکارییەکانی کورد کە بریتی بون لە بەدەستهێنانی پشک لە داهاتی نەوت یان هەر داهاتێکی تر لەسەر بنەمای داهاتی تاکەکەس و، دورخستنەوەی هێزە عەرەبییەکان لە کوردستاندا بەلای حکومەتەوە قبوڵ نەکران، هەرچەندە حکومەت بە پێشنیاری دیکە وەڵامی دانەوە، بەڵام زۆری نەخایاند بە روونی دەرکەوت کە ئەم دانوستانگەلە ناگەنە ئەنجام. لە مانگی حوزەیراندا حکومەت وەفدێکی کوردەکانی خستە زیندانەوە و دەستی بە هەڵمەتێکی نوێی سەربازی کرد. ئەم هێرشە لە هێرشەکانی قاسم مەبەستدارتر و توندوتیژتر و خوێناویتر بو. بەڵام لەگەڵ هاتنی وەرزی زستاندا سوپا تەنیا چەند بەشێکی کەمی ناوچە شاخاوییەکانی کوردستانی

لەژێر دەستدا مایەوە و ئەمەش دەری خست کە حکومەت لە سەپاندنی چارەسەری سەربازی بێ هیوایە.

دانوستانەکەی ساڵی ١٩٦٤ و ناکۆکییەکەی بارزانی لەگەڵ ئیبراهیم ئەحمەد و جەلال تاڵەبانی.

٧. لە شوباتی ساڵی ١٩٦٤ دا، ئاگربەستێک لەنێوان کوردەکان و حکومەتدا راگەیەندرا، ئەو حکومەتەی کە لەکاتی دوورخستنەوەی بەعسەوە لە تشرینی دووەمی ١٩٦٣وە بە رواڵەت لە ناسری (لایەنگری جەمال عەبدولناسر) دەچو. سەرۆک عارف لە لێدوانێکی فەرمیدا بەڵێنی مافە نەتەوەییەکانی "لە چوارچێوەی تاکە نەتەوەیەکی برایانە"دا بە کوردەکان بەخشی، لێبوردنی گشتی دەرکرد، و داوای لە حکومەت کرد پەرە بە ناوچەکانی باکور بدات و کاربەدەست و کارمەندی کوردی لێ دابمەزرێنێت. ئەمەش چەندین سەردانی وەفدی حکومەتی بۆ باکور بەدوای خۆیدا هێنا، کە هەوڵیان دەدا کوردەکان بە شتێک کەمتر لە خۆبەڕێوەبەرێتی قایل بکەن.

٨. لەم کاتەدا، خودی کوردەکانیش بەسەر دوو دەستەدا دابەشبووبوون. دەستەی یەکەم: لەژێر سەرکردایەتی بارزانیدا بوو کە هەم سەرکردەیەکی خێڵەکیی دەسەڵاتدار و هەمیش سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان (پدک) بوو، ئەم دەستەیە بڕوایان وابوو: کە پێویستە هەموو رێگەیەک بگیرێتەبەر لەپێناو تاقیکردنەوەی سەرڕاستیی حکومەت و بزانرێت ئایا دەتوانن لەگەڵیاندا رێک بکەون یان نا. دەستەی دووەم: کۆمەڵێک کەسانی گەنجتر و خاوەن بیری توندڕەوتر بوون و لەلایەن ئیبراهیم ئەحمەد و جەلال تاڵەبانییەوە سەرکردایەتی دەکران، ئەمان هەر زوو گەیشتبوونە ئەو باوەڕەی کە مامەڵەکردن لەگەڵ حکومەتدا هیچ بەرهەمێکی لێ ناکەوێتەوە. ئەم ناکۆکییە لە کۆبونەوەیەکی پدک لە حوزەیرانی ١٩٦٤ دا لە قەڵادزێ

گەیشتە ئەوپەڕی کە دەگوترێ ٩٠٠ کەسی تێدا بەشدار بون، چواردەیان سەرکردەی باڵای پدک بوون بە ئەحمەد و تاڵەبانییەوە و هەموو ئەندامانی مەکتەبی سیاسیی پدک، جگە لە یەک کەس، ئەوا لە ریزەکانی پدک دوورخرانەوە و مەکتەبی سیاسییەکی نوێ هەڵبژێردرا. پێکدادانی چەکداری لەنێوان ئەم دو دەستە کێبرکێکارە رویدا و لە ئەنجامدا ئەحمەد و تاڵەبانی لەگەڵ نزیکەی ٤٠٠ لایەنگریاندا خۆیان دەربازی ئێران کرد. (لەوێ لەلایەن دەسەڵاتدارانی ئێرانەوە لە شاری هەمەدان شوێنی پارێزراویان پێدرا).

## هەڵمەتەکەی ساڵی ١٩٦٥

٩. دوای نزیکەی یەک ساڵ لە ئاگربەست و دانوستانی بێسەروبەرە، حکومەت لە یەکەم هەفتەی ساڵی ١٩٦٥دا شەڕی دەست پێ کردەوە. لەو کاتەدا، زۆرینەی دەستە جیابووەکە لەگەڵ بارزانیدا پێک هاتبونەوە و لە ئێران گەڕابونەوە، بەڵام ئیبراهیم ئەحمەد لە ئێران بە زویری مابۆوە و تاڵەبانی ئەو هاوینەی لە هەندەران بە راکێشانی پشتیوانیی نێودەوڵەتی بۆ دۆزی کورد بەسەر برد.

١٠. هەڵمەتەکەی ساڵی ١٩٦٥ بۆ حکومەت لە هەڵمەتەکانی پێشوو باشتر نەبو و، بە کۆتایی هاتنی ئەو ساڵە، دیسان بە روونی دەرکەوتەوە کە ئەمجارەش گەیشتونەتە بنبەستی سەربازی.*

---

* دوو تایبەتمەندێتی بەرچاوی ئەم هەڵمەتە بریتی بوو لەوەی کورد دەیگوت: گازی کیمیاویی لە دژ بەکار هێنراوە و، هەروەها هێزی کۆماری یەکگرتوی عەرەبی لە نزیک بەغداوە جێگیر کرابون (ئەمەش لەژێر چاودێریی فەرماندەیی هاوبەشی عێراق و کۆماری یەکگرتوی عەرەبی)، ئەم هێزەش ئەرکە ناوخۆییە ئەمنییەکانی لە کۆڵ سەربازانی عێراقیی کردەوە و دەستی واڵاکردن کە بەشداریی لە شەڕ و هەڵمەتەکان بکەن.

## پێشنیارەکەی بەزاز، ١٩٦٦

١١. لە سەرەتای ساڵی ١٩٦٦دا چەند ئاماژەیەک هەبوون بەوەی دکتۆر عەبدولرەحمان بەزاز کە لە پاییزی پێشوودا وەکو یەکەم سەرۆک وەزیری سیڤیلی عێراق کە لەدوای شۆڕشەکەی ساڵی ١٩٥٨ەوە هاتبێتە سەر کار، لەگەڵ ئەوەدایە دانوستانی ئاشتییانە لەگەڵ کوردەکاندا بکات و نایەوێتە لەگەڵ هاتنی وەرزی بەهاردا هێرشی تازەیان بکاتە سەر. پێشنیارەکەی بەزاز وەلانرا و لە مانگی ئایاری ئەو ساڵەدا هێرشێکی نوێ دەستی پێکرد، بەڵام هێزەکانی حکومەت هەر زو لە ناوچەکانی نزیک ڕەواندوز شکستێکی گەورەیان هێنا و لە سەرەتای حوزەیراندا هەڵمەتەکە وەستێنرا.

١٢. لە ٢٩ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٦دا، د. بەزاز پلانێکی ١٢ خاڵیی بۆ ئاشتیی لە کوردستاندا ڕاگەیاند. پوختەی ئەو دوانزە خاڵە بەمجۆرەیە:

یەک. مافی نەتەوەیی یەکسان بۆ کورد و عەرەب لە عێراقدا.

دوو. بە لامەرکەزیی کردن: ئەنجومەنی هەڵبژێردراوی ناوچەیی دەسەڵاتی فراوانی دەبێت.

سێ. لەو ناوچانەی کە کورد زۆرینەن، زمانی کوردی هاوشانی زمانی عەرەبی وەکو زمانێکی فەرمی دەناسێنرێت.

چوار. سەنگی کورد لە ئەنجومەنی نیشتمانیدا بەپێی ڕێژەی دەبێت.

پێنج. فەرمانگە گشتییەکان و دامەزراندن بە ڕووی کورددا کراوە دەبن.

شەش. یەکسانیی لە هەلی پەروەردەدا.

حەوت. بڕێک ئازادی سیاسی و ئازادی دەربڕین بۆ کورد دەستەبەر دەکرێت.

نۆ. دەرکردنی لێبوردنی گشتی و گێڕانەوەی کاربەدەست و کارمەندانی کورد بۆ شوێنەکانی خۆیان.

دە. ئەندامە کوردەکانی پۆلیس و هێزە چەکدارەکان بگەڕێنەوە بۆ یەکەکانی خۆیان. چەکدارەکانی دیکە چەکەکانیان دابنێن.

یانزە. ئاوەدانکردنەوەی باکور.
دوانزە. جێگیرکردنەوەی کەس و کۆمەڵە ڕاگوێزراوەکان.

١٣. هەرچەنـدە پلانەکـە لـە هەنـدێ ڕووەوە نارِوونـە و زۆر شـتی بـە نەگوتـراوی هێشـتۆتەوە،* بـەڵام پێدەچـوو بتوانرێـت وەکـو بنەمـای ڕێککەوتنێـک لێـی برِوانرێـت و وا هەسـتیش دەکـرا کـە تـا ئـەو کاتـەی بـەزاز لـە دەسـەڵاتدا بێـت ئـەوا هەلێکـی بـاش بـۆ بەرەوپێشـچوون لەئـارادا بێـت. بارزانـی بـە فەرمـی پێشـوازیی لـەم پلانـە کـرد. بـەڵام لـە ناوەرِاسـتی مانگـی تەمـوزی هەمـان سـاڵدا، کـوردەکان بەهـۆی بـەدی نەکردنـی هیـچ ئاماژەیەکـی ئەرێنییـەوە لـە جێبەجێکردنـی پلانـە دوانزەخاڵییەکـە، بـێ هیواییـان تێـدا دەرکـەوت و کاتـێ بـەزاز لـە مانگـی ئـاب دا لـە دەسـەڵات دوور خرایـەوە، هیواکانـی ڕێککەوتـن ڕەوینـەوە.

**بەردەوامیی بنبەست، ١٩٦٧**

١٤. هەرچەنـدە لـە سـاڵانی ١٩٦٦ یاخـود ١٩٦٧ دا هیـچ شـەرِێکی بەرفـراوان ڕویاننـەدا، بـەڵام هێزەکانـی حکومـەت لـە باکـوردا مانـەوە و لـە چەنـد شـەرِ و پێکدادانێکـدا ڕوبـەرِوی هێـزە کوردییـەکان بوونـەوە. حکومەت بـە هاوکارییکردنی تاڵەبانـی کـە دوبـارە پەیوەنـدی لەگـەڵ بارزانیـدا پچرِابـوو، مەبەسـتی بـوو پێگـەی بارزانـی لاواز بـکات، لێـرە و لـەوێ پێکدادانـی چەکداریـی لەنێـوان گروپـە کێبرِکێـکارە کوردەکانـدا ڕوویـدەدا، بـەڵام دەسـتەکەی تاڵەبانـی لـەوە لاوازتـر بـوو کـە بتوانێـت هەرِەشـەیەکی جـددی بێـت بـۆ سـەر دەسـەڵاتی بارزانـی.

* بـە بۆچونـی عیسـمەت شـەریف وانلـی (Le Kurdistan Irakien, Entite National, Neuchatel 1970)، سـێ بابەتـی نهێنـی دیکـە لەلایـەن حکومەتـەوە لەئەسـتۆ گیـراوە:
ئەلـف) دروسـتکردنی لیـوای دهـۆک بـۆ لەخۆگرتنـی ئـەو ناوچانـەی پێشـتر سـەر بـە لیـوای موسـڵ بـوون.
بـێ) ئازادکردنـی هەمـو زیندانـە سیاسـییەکان لـە عێراقـدا و، جیـم) پێدانـی مۆڵەتـی یاسـایی بـە پارتـی دیموکراتـی کوردسـتان.

### گەڕانەوەی بەعس، ١٩٦٦

١٥. حکومەتی بەعس کە لە تەموزی ساڵی ١٩٦٨ دا دەسەڵاتی گرتە دەست، ئەوا لە سەرەتادا هیچ ئاماژەیەکی نیشان نەدا کە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ کوردەکاندا بیرۆکەیەکی باشتری هەبێت لەوەی حکومەتی پێشوی بەعسیەکانی ساڵی ١٩٦٣ یاخود ئەوەی کە ئیدارەکانی دیکە ماوە ماوە جێبەجێیان کرد. بۆیە بەردەوامییان بەو سیاسەتە دا کە لە حکومەتەکەی پێشووەوە بۆیان بەجێ مابوو، ئەوەش بریتی بوو لە: ڕێگرتن لە فراوانبونی ناوچەی ژێر دەسەڵاتی کوردەکان و هاوکارییکردنی تاڵەبانی بە پارە و چەک.

١٦. هەرچۆنێک بێت، پاش ماوەیەک دەستیان کرد بەوەی بەشێک لە پێشنیارەکەی ساڵی ١٩٦٦ی د. بەزاز بەکار بهێنن. بەمەش زمانی کوردی لە ناوچە کوردییەکاندا بووە زمانی خوێندن، زانکۆیەک لە سلێمانی دامەزرێنرا، ئەکادیمیای ئەدیبانی کورد دامەزرێنرا، لێبوردنێک بۆ ئەو کەسانە دەرکرا کە لە شەڕەکاندا بەشدارییان کردبوو، و وەکو بەشێک لە بە لامەرکەزی کردن، بڕێک دەسەڵات درایە پارێزگاکان. سەرەڕای ئەم کارە دڵخۆشکەرانەیە، بە درێژایی ساڵی ١٩٦٩ پێکدادان هەر بەردەوام بوو.

## جیم. ڕێکەوتننامەکەی ئازاری ١٩٧٠

١٧. بە هاتنی کانونی دووەمی ١٩٧٠، دەرکەوت کە لەو ئاگربەستە دیفاکتۆیەی لەئارادا بوو، دانوستانی جددی لەنێوان بەعس و نوێنەرەکانی بارزانیدا بەڕێوە دەچێت. ئەنجامە سەرکەوتووەکانی ئەم دانوستانانە لە ١١ی ئازاردا لەلایەن ئەنجومەنی فەرماندەیی شۆڕشی عێراقەوە ڕاگەیەنرا.

بەندەکانــی ئــەو راگەیەنــراوە* زۆر نزیکــە لــە پێشــنیارەکەی ســاڵی ١٩٦٦ی د. بــەزاز و ئــەم خاڵــە ســەرەکییانەی لەخــۆ دەگــرت:

١. کــوردەکان لــە چوارچێــوەی عێراقــدا مافــی سیاســی و خۆبەڕێوەبەرێتییــان دەدرێتــێ. ناوچەکانــی خۆبەڕێوەبەرێتــی کــورد لــە رێگــەی ســەرژمێرییەوە یەکلادەکرێنــەوە.

٢. دەستور دان بە بوونی نەتەوەی عەرەب و کورددا دەنێت.

٣. کوردێک وەکو جێگری سەرۆک کۆماری عێراق دادەمەزرێت.

٤. کورد بەپێی رێژەیان لە دەسەڵاتی یاسادانانددا پشکیان دەبێت.

٥. کــوردەکان بەبــێ هــەڵاواردن لــە حکومــەت و دامــەزراوە حکومییەکانــدا بەشــدار دەبــن.

٦. کاربەدەســتان لــە ناوچــە کوردییەکانــدا یــان کــورد دەبــن یاخــود کەســانێک دەبــن کــە لــە زمانــی کوردیــدا شــارەزا بــن.

٧. هــەردوو زمانــی کــوردی و عەرەبــی لــە ناوچــە کوردییەکانــدا زمانــی فەرمــی دەبــن، لــەم ناوچانــەدا زمانــی کــوردی زمانــی فێرکردنــە.

٨. هەمــوو کاربەدەســتە ســەربازی و مەدەنییەکانــی رابــردوو هەروەهــا هەمــوو خوێنــدکار و کرێــکارەکان دەگەڕێنرێنــەوە ســەر کارەکانــی پێشــوویان.

٩. دەزگا پەروەردەیی و کلتورییەکانی کورد فراوانتر دەکرێن.

١٠. کــورد خۆیــان رێکخــراوی خوێنــدکاری و گەنجان و ژنان و مامۆســتایانیان دەبێــت و، ئــەم رێکخراوانــە پەیوەندییــان دەبێــت بــە رێکخــراوە عێراقییــە هاوشــێوەکانیانەوە.

١١. دانیشــتوانی گونــدە عەرەبییــەکان و کــوردەکان دەگەڕێنرێنــەوە بــۆ خانووەکانــی خۆیــان.

١٢. دەســت دەکرێــت بــە قەرەبوکردنــەوەی ئــەو کوردانــەی کــە بەهــۆی

* بۆ خوێندنەوەی دەقی وردەکاریی راگەیەنراوەکە بڕوانە هاوپێچی ئەم راپۆرتە.

شەڕەکانەوە زەرەرمەند بوون.

١٣. کۆمسیۆنێک بە بودجەی پێویستەوە بۆ گەشەپێدانی کورد دابمەزرێت کە بۆ ناوچە کوردییەکە پلانی تایبەتی ئابووری ئامادە بکات.

١٤. پەلە بکرێت لە چاکسازییەکانی بواری زەوی و زار لە ناوچە کوردییەکاندا .

١٥. بەکارهێنانی سامانە سروشتییەکان لە ناوچەکانی خۆبەڕێوەبەرێتییەکەدا ئەرکی دەسەڵاتی کۆمارییە.

١٦. لە قۆناغەکانی کۆتایی جێبەجێکردنی ئەم ڕێککەوتننامەیەدا، کەناڵی پەخشی کوردی و هەموو چەکە قورسەکانی کورد رادەست بکرێنەوە.

١٨. ڕێککەوتنە بڵاوکراوەکە، پرۆتۆکۆلێکی نهێنیشی لەگەڵدا بوو کە دەگوترێت ئەم بەندانەی لەخۆگرتووە:

١) لیژنەیەکی هاوبەش دروست بکرێت بۆ سەرپەرشتیکردنی جێبەجێکردنی ئەم ڕێککەوتنامەیە.

٢) یەکێک لە ئەرکەکانی ئەم کۆمیتەیە بۆ هەڵوەشاندنەوەی پێشمەرگەیە (هێزە کوردییە شۆڕشگێڕەکان) و تەنیا (٦٠٠٠)یان لە سوپادا دەهێڵرێنەوە. لەکاتی هەڵوەشاندنەوەکەدا، کە لە پێنج قۆناغی دیارینەکراو پێک هاتووە، حکومەت ئەرکی بەڕێوەبردنی گشتیی هێزەکە لەئەستۆ دەگرێت.

٣) حکومەت هەموو ئەو هێزە کوردییانەی کە دژی بارزانین بە نایاسایی لەقەڵەم دەدات و، چەکیان دەکات و هێزە چەکدارەکانی عێراق لە "پێگە ئاسایییەکان"یان دەکشێنێتەوە.

٤) پەدک ڕێگەی پێدەدرێت لە ناوچە کوردییەکەدا بە ئازادی بجوڵێتەوە و ڕۆژنامەی تایبەت بە خۆی دەربکات.

٥) هەموو ئەو کەسانەی پێشتر لە کەرتی حکوومی دابوون و لە شۆڕشەکەی کورددا بەشدارییان کردووە، ئەوا ڕێگایان پێ دەدرێت بچنەوە

سەرکارەکانیان و هیچ قیدەمێکی وەزیفییان نافەوتێت. ئەو کەسانەش کە لە ریزی هێزە چەکدارە کوردییەکاندا خزمەتیان کردووە خزمەتەکەیان وەک ئەوە بۆ هەژمار دەکرێت کە لە ریزەکانی سوپای عێراقدا خزمەتیان کردبێت.

٦) لە ماوەی یەک ساڵدا سەرژمێرییەکی سەرانسەری لە وڵاتدا ئەنجام دەدرێت ئەمەش بەمەبەستی دیاریکردنی ئەو ناوچانەیە کە زۆرینە کوردن.

٧) هەرچەندە ئاڵای دەوڵەتی عێراق بەو زووانە ناگۆڕێت، بەڵام لەگەڵ گۆڕینی ئاڵاکەدا، هێمای کوردیش لە ئاڵاکەدا جێی دەکرێتەوە.

١٩. هەرچەندە رێوشوێنە نهێنییەکان لەم بەندە بڵاوکراوانەدا بەرەو رەواندنەوەی تەمومژەکان دەچوون، بەڵام هەندێک لە خاڵە گرنگەکان، بۆ نمونە: سروشتی تەواوی خۆبەڕێوەبەرێتییەکەی کورد و بڕی ئەو پارەیەی کە حکومەتی عێراق بۆ پەرەپێدانی هەرێمە کوردییەکە دەبوو تەرخانی بکات، هێشتا بە ناروونی ماوەتەوە، دیاربوو پێش ئەوەی بتوانن بگەنە رێکەوتنێکی گشتگیر، دەبوو لەسەر ئەم خاڵانە دانوستانی زیاتر بکەن.

٢٠. جێبەجێ کردنی رێککەوتننامەکە لە ساڵی ١٩٧٠دا بە خێرایی بەرەوپێشەوە نەچوو. لێبوردنەکە بە ئاشکرا راگەیەندرا، پێنج وەزیری کورد دامەزرێنران، چالاکیی گەشەپێدان لە کوردستان دەستی پێکرد، و حکومەت لە بوارەکانی کەلتور و پەروەردەدا چەند هەنگاوێکی نا. بەڵام کێشەی دامەزراندنی کوردێک وەکو جێگری سەرۆک و هەروەها دروستکردنی ئەنجومەنێکی نیشتمانی تائێستاش کە ساڵی ١٩٧١ە چارەسەر نەکراوە (بڕوانە پەرەگرافی خوارتر).

حکومەت پشتیوانی‌یەکەی لە تاڵەبانی و ئیبراهیم ئەحمەد پچڕاند و ئەوانیش چوونەوە پاڵ بارزانی و بە فەرمی (پارتی رزگاریی کورد)ەکەیان تێکەڵی پدک کرد. هەندێک لە پێشمەرگەکان گەڕانەوە بۆسەر کارە سیڤیلەکانیان و

هەندێکی تریان خرانە ریزی هێزی سنوری کوردستانەوە کە بەشێک دەبوو لە وەزارەتی ناوخۆ، بەڵام بارزانی نزیکەی ٢٠ هەزار چەکداری هێشتەوە و چەکە قورسەکان و کەناڵە رادیۆییەکەشی لەلای خۆی پاراست. (بەپێی زانیارییەکان، لە ئازاری ساڵی ١٩٧١دا ئەم شتانەی داوە بەدەستەوە، بەڵام لەراستیدا زوربەی کەلوپەلە گرنگ و کاریگەرەکانی لەلای خۆی پاراستووە)، داهاتووی پدک کە یەکێک بوو لەو پرسانەی کە لە رێککەوتنەکەدا بە روونی باسی لێ نەکراوە، بە چارەسەرنەکراوی مایەوە، جارجارە روانگەی ناسنامەی حزبەکە لەگەڵ بەعسدا بڵاودەکرایەوە، بەڵام هیچ پەیوەندییەکی کرداریی دروست نەکرا. هەروەها نەتوانرا وێنەیەکی روون لەبارەی داهاتووی کارگێرییەوە لە کوردستاندا فەراهەم بکرێت: گومان لەوەدا نەبوو کە مەبەستی حکومەت لە (خۆبەرێوەبەرێتی) هیچی لە جۆرە کارگێرییەکی خۆبەرێوەبردنی سادە زیاتر نەبوو، کوردەکانیش زۆر لەمە زیاتریان لە (خۆبەرێوەبەرێتی) چاوەروان دەکرد.

٢١. گرنگترین پرسیش کە بریتی بوو لە: سنوری ناوچە خۆبەرێوەبەرێتییەکەی کورد، کە دەبوو لە رێگەی راپرسییەوە یەکلا بکرێتەوە، بە چارەسەرنەکراوی مایەوە، لە سەرەتادا راپرسییەکە خرایە تشرینی یەکەمی ١٩٧٠ەوە، بەڵام ماوەیەکی کەم پێش وادەی دیاریکراو دواخرا بۆ ماوەیەکی نادیار. لە هەمووی سەختتر بریتی بوو لە دیاریکردنی سنوری کارگێریی پارێزگای کەرکووک کە سەرەکیترین ناوچەی بەرهەمهێنانی نەوتی عێراقە (هەرچەندە گەورە یەدەکی نەوتی وڵات کە لە باشوورە) و دانیشتوانەکەی تێکەڵەیەکە لە تورکمان و کورد و عەرەب. (بەهۆی ئەوەی زۆرێک لە خێزانە کوردەکان لەسەردەمی شەردا لەماڵەکانیان دەرکران و خەڵکی عەرەب لە شوێنیان نیشتەجێ کران، ئەم بابەتە زۆر ئاڵۆزتر بووە.) هەرچەندە لە ئازاری ساڵی ١٩٧٠دا لەسەر ئەوە رێککەوتبوون کە کێڵگە نەوتیەکان دەبێت لەژێر

دەسەڵاتی حکومەتی ناوەند دا بێت، بەڵام کوردەکان دەمێکە پێدادەگرن کە کەرکوک دەبێت پایتەختی ئەوان بێت و ئامادە نین کەرکوک لەدەرەوەی هەرێمە خۆبەڕێوەبەرەکەیان قبوڵ بکەن. چاوەڕوانی ئەوەش لە حکومەت نەدەکرا بەوە قایل بێت کە کێڵگە نەوتی‌یەکان بکەونە دیوە هەڵەکەی هێڵی سنورەکەوە. ئەستەمبوونی ڕێککەوتنی دوولایەنەکە لەسەر ئەم خاڵە، ڕەنگە وا باش بووبێت کە بۆ ماوەیەکی کاتی ڕاپرسییەکەی دواخستبێت، چونکە ئەگەر خاوەندارێتییەکەی بکەوتایە لای هەریەکێکیان، ئەوا ڕەنگە ببوایەتە هۆی تێکدانی پرۆسەی جێبەجێکردنی خاڵەکانی دیکەی ڕێککەوتنەکە. لەگەڵ ئەوەشدا، پێناچێت لە داهاتوویەکی نزیکدا بەبێ ڕێککەوتن لەسەر پرسی سنور هیچ چارەسەرێکی هەمیشەیی بدۆزرێتەوە.

٢٢. دواخستنی ڕاپرسییەکە کاردانەوەی خێرای لەلای کورد دروست نەکرد. دیاربوو داواکاری هەرە لەپێشیان بریتی بوو لەوەی بزانن حکومەت تا چەند لەگەڵ ئاوەدانکردنەوە و پەرەپێدانی باکوردا دەڕوات و هەست بەوە دەکرا کە تا ئەوکاتەی بەرەوپێشچوونەکان لەم بوارە و بوارەکانی دیکەدا بەردەوامی هەبێ، ئەوا کوردەکان لەگەڵ ئاگربەستەکەدا دەمێننەوە، بەڵام ددان بەخۆداگرتنەکەشیان ڕەنگبوو تاسەر نەبێت. حکومەت چونکە پێویستی بەو سەقامگیرییە بوو کە ڕاگرتنی شەڕی دابین دەکرد، سیاسەتی ئاشتەوایی بەلاوە پەسند بوو. (جێی خۆیەتی لێرەدا باس لەوە بکرێت کە ناوبانگە سیاسییەکەی سەدام حسێن ئەلتکریتی کەسایەتی بەهێزی عێراقی بەعس، تا ڕادەیەک پەیوەندی بە ڕێککەوتنەکەی ئازاری ١٩٧٠وە هەیە، کە سەدام حسێن لەگەڵ بوونی ڕێژەیەکی بەرچاو لە نارەزایی لەناو حزبەکەیەوە، ئەوا ڕێکەوتنەکەی هێنایەکایەوە) لە ساڵی ١٩٧١دا، حکومەت لە چەند کاتێکی جیاجیادا پلانی بۆ گەشەپێدانی ئابوری لە باکور بەتایبەتی لە کەرتی گەشتیاریی‌دا، ڕاگەیاند. خاوبونەوەی کۆتوبەندە لەسەر

ئەندامانــی وەفــدە دیبلۆماســییەکان کــە ســەردانی باکوریــان دەکــرد، نیشــانەی ئەوەبـون کـە ئاشـتەوایییەکە وەکـو پێویسـت بـە نەرمـی بەرەوپێشــەوە دەچێـت. لەگــەڵ ئەوەشــدا، هێشــتا هیــچ کوردێــک وەکــو جێگــری ســەرۆکی عێــراق دیـاری نەکرابـوو. (وا دەردەکــەوت کــە بارزانــی تــا ئەوکاتــەی دەســەڵاتەکانی ئــەو پۆســتە بــە دیاریکراویــی نەزانێــت، نایەوێـت هیـچ کەسـێک لـەو پۆسـتەدا ببینێــت: ئەگــەر تەنیــا بەنــاو جێگــر بێــت، بارزانــی نەیدەویســت بارمتەیــەک بخاتــە دەســتی بەعســەوە.) ئەنجومەنــی نیشتمانییەکەشــی دروســت نەکرابــوو، هەرچەنــدە ســەرۆک لــە ئاهەنگــی ســاڵیادی شۆرشــی تەمــوزی ١٩٧١یشــدا پێشـبینی کردبـوو. (تائێسـتاش بەعـس نەیتوانیـوە بەنـدی ئەوتـۆ دابرێژێـت کـە کەسـانی نا-بەعسـی، واتـە کـورد و شـیوعییەکان، ئامـادە بـن کـە بەشـداریی لـە ژیانــی سیاســی نەتەوەیــیدا بکــەن، بەجۆرێــک کــە ئــەو کارە رۆڵــی بــاڵای حزبــی بەعــس تــا رادەیەکــی قبوڵنەکــراو نەخاتــە بــەردەم مەترســییەوە.) لەراســتیدا لــە ســاڵی ١٩٧١ دا کۆمەڵێــک ئامــاژەی دیاریکــراو لەســەر تێکچونــی پەیوەنــدی نێــوان کــورد و حکومەتــدا دەرکەوتــن، بــۆ نمونــە دۆخــی کــوردە فەیلیــەکان - کـە خێڵێکـن ریشـە و رەگـەزی سـەرەکییان دەچێتـەوە ئێـران، کـە زۆربەیـان لــە بەغــدا کرێــکاری و حەماڵــی دەکــەن و داوای رەگەزنامــەی عێراقــی دەکــەن - هەروەهــا راپــۆرت لەســەر ئــەوەش هەبــوون کــە لــە باکــور چەنــد پێکدادانێــک روویانــداوە کــە وا دەردەکەوێــت خێڵەکانــی لایەنگــری تاڵەبانــی تیایــدا بەشــدار بووبـن. وا گریمانـە دەکرێـت کـە لـە وەڵامـی سـکاڵاکانی کـورددا، حکومـەت لـە مانگـی ئایـاردا لیژنەیەکـی بـاڵای نـوێی بـۆ کاروبـاری کـورد دامەزرانـدووە، کـە مەبەسـت لـێی بـرەودان بـوو بـە پیادەکردنـی رێککەوتننامەکـەی سـاڵی ١٩٧٠، بــەڵام لەبــەر ئــەوەی هیچــکام لــە ئەندامانــی ئــەم لیژنەیــە کــورد نەبــوون، بۆیــە رەنگــە متمانەیەکــی زۆری لــەلای کــوردەکان نەبوبێــت. لەراســتیدا، هەوڵەکــەی ئــەو لیژنەیــە بــۆ کارکــردن لەگــەڵ سەرنوســەری (ئەلتەئاخــی) رەتکرایــەوە. بەپـێی هەندێـک راپۆرتـی دیکـە، بارزانـی لەمـاوەی هاویـندا داواکاریـی زیاتـری

خستووەتە بەردەم حکومەتی عێراق، بۆ نمونە دەبێت ساڵانە ١٥٠ دیناری عێراقی بۆ ناوچە کوردییەکان تەرخان بکرێت و هەروەها دەبێت سێ‌یەکی ئەندامانی ئەنجومەنی نیشتمانیی کورد بن. دواجار، هەوڵی تیرۆرکردنەکەی بارزانی لە ئەیلولی ١٩٧١دا، کە زۆرکەس بەکاری حکومەتی ناوەندی دەزانن، بەلاّم سەرکردایەتی حزبی بەعس بە فەرمی خۆی لێ بێبەری کردووە - ئەوەش ئەو گومانەی زیاتر کردووە کە بارزانی هەمیشە بەرامبەر حکومەتی بەغدا هەیبووە و ئەوەندەی تر پرۆسەی ئاشتەوایی‌یەکەی گێرابێتەوە دواوە.

بۆچوونەکانی بارزانی لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ رۆژنامەی فەرەنسی بەیروت (جیهانی ئەمرۆ) (L`Orient Le Jour)ی رۆژی ١٨ی تشرینی دووەمدا دەردەکەون، کە تیایدا گوتویێتی متمانەی بە دەسەڵاتی بەغدا نی‌یە لە هێرشی چاوەڕواننەکراوی سوپای عێراق دەترسێت.

٢٣. بە کورتییەکەی پێدەچێت بارودۆخەکە دیسانەوە گەیشتبێتە بنبەست. پێناچێت چارەسەرێک بۆ کێشە دیارەکان بدۆزرێتەوە. ئەگەر نیگەرانییەکانی کورد زیادبکات لە بەرامبەر خاوی هەنگاوەکانی جێبەجێ کردنی رێککەوتنامەکە، ئەوا پێدەچێت زۆر نەخایەنێت کە جەنگی نوێی کاریگەر سەرهەڵبداتەوە کە ئەوەندە توند بێ، رێککەوتنەکە بە تەواوی هەڵبوەشێننەوە.

## (٥) رەهەندە سیاسیی و سەربازییەکانیی شۆڕشی کورد

**سیاسیی:**

٢٤. لە ساڵی ١٩٦١ەوە کە بارزانی خۆی وەکو گەورە سەرکردەی خێڵەکیی دامەزراند و هێزەکانی پدکیش چوونە پاڵی، کوردانی عێراق لە چاو شۆڕشەکانی پێشوتریان زیاتر یەکگرتوو بوون. ئەو ناکۆکییەی کە

لە ساڵی ١٩٦٤ەوە لەنێوان بارزانی لەلایەک و جەلال تاڵەبانی و ئیبراهیم ئەحمەد لەلایەکی دیکەوە درێژەی کێشابوو، نیشانەی جیاوازی تێڕوانینی خێڵە چیاییەکانی باکورە لەگەڵ تێڕوانینی خەڵکە شارنشینەکەی باشوری کوردستان ]ی عێراق[ و ڕۆشنبیرانی بەغدا و شوێنەکانی دیکە. تا ئێستا ڕێککەوتنەکە هێشتا ناتەواوە و بارزانی لەڕووی تەندروستییەوە جێگیرە - ئەو ئێستا تەمەنی نزیکەی ٧٠ ساڵە - پێناچێت پێگەکەی وەکو سەرکردەی گشتی کوردانی عێراق بکەوێتە لێژی،* بەڵام ئەگەر ئاشتییەکی تۆکمە بێتە ئاراوە، ئەوا ئەگەری هەیە دیسانەوە جیاوازیی توند لەنێوان ریزەکانی کورددا سەرهەڵبداتەوە. سەرکردە خێڵەکییەکان کە مەرج نییە لەناو خۆیاندا بە یەکگرتوویی بمێننەوە، حەز دەکەن دەسەڵاتی خۆیان لە کوردستاندا بپارێزن، لەکاتێکدا کەسە توندڕەوترەکان دەیانەوێت ڕۆڵی زیاتری پدک لە بەڕێوەبردنی ناوچەکە و دارشتنی سیاسەتی پێشکەوتنخوازانە و، بۆ نمونە لە بوارەکانی چاکسازی کۆمەڵایەتی و ئاودێریدا ببینن. ڕەنگە لە درێژمەودادا، چینە ڕۆشنبیرەکە بۆی دەربکەوێت کە خاڵی هاوبەشیان لەگەڵ سۆشیالیستە عەرەبەکاندا زیاترە وەک لە هاونەتەوەکانی خۆیان، ئەمەش بەشێک لە هۆکاری رابردووەکەی تاڵەبانی لەگەڵ دەسەڵاتدارانی بەغدا پێک دەهێنێت.

٢٥. لەبەرئەوەی پدک تاکە ڕێکخراوی سیاسی کوردە لە عێراق، بۆیە هەر هەوڵێک بۆ کۆنترۆڵکردنی جوڵانەوەی کورد پێدەچێت لەناو ئەم حزبەوە رووبدات. پدک لە کرۆکدا حزبێکی نەتەوەییە و ئایدۆلۆجیایەکی بەردەوامی نییە. لە ڕۆژانی یەکەمی دەسەڵاتی قاسمدا، پدک لەبەر هۆکاری تەکتیکی

* وانلی، سەرچاوەی پێشوو، بارزانی وەکوو پارێزەری سەرکردە نەریتیەکان لە بەرامبەر توندڕەوەکانی ناو حزبدا و، هەروەها وەکوو (کاراکتەرێکی یاریدەدەری هەموو هێزە نەتەوەییەکان) دەبینرێت. بارزانی کە لە ڕۆژانی کۆماری کوردستان لە مهاباد و مەنفاکەی لە یەکێتی سۆڤیەتەوە بووەتە قارەمانێکی نەتەوەیی، ئەزمونێکی کەم وێنەی وەکوو سەرکردەی بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد هەیە و, ئێستا لە باشترین حاڵەتیدا لە قەیراندایە. بەڵام دیدێکی سنورداری هەیە و هەندێ جار توند و کەللەڕەقە. پێدەچێت بۆچونێکی روونی نەبێت لەبارەی داهاتووی سیاسیی کوردستانەوە.

ئـەوا خـۆی لـە شـیوعییەکان نزیـک کـردەوە و شـیوعیەکانیش دژەیـان کـردە ناویـەوە، بـەڵام لـە سـاڵی ١٩٦٠ەوە کاریگەرییەکـی جێـی سـەرنجیان نەبـووە، ئەوکاتـەی حیزبەکـە لایەنگیرییەکانیـی بـۆ شـیوعیی و پرۆگرامەکەیشـی کاڵ کـردەوە. ئـەو پەیـرەوە نوێیـەی لـە سـاڵی ١٩٦٤دا دانـرا، و لـە سـاڵی ١٩٦٦دا پیاچوونـەوەی بۆکـرا، لـە جەختکردنـەوەدا تارادەیەکـی زۆر توندرەوە،* بـەڵام پێدەچێـت بەشـێک لـەو زمانـەی پـێی نوسـراوە میراتـی ئـەو پەیـرەوە کۆنـە بێـت کـە لەسـەردەمی قاسـمدا نوسـرابوو.

٢٦. لـە سـاڵی ١٩٦٤ەوە، لەوکاتـەوەی بارزانـی دژی تاڵەبانـی و ئەندامـە چەپڕەوەکانـی تـری مەکتەبـی سیاسـی جوڵایـەوە، حزبەکـە تارادەیەکـی زۆر لـە دەسـەڵاتی بارزانـی چووەتـە دەرەوە، و لـە دواییـن هەڵبژاردنـی ئەنجومەنـی ناوەندیـی حزبەکـەدا کـە لـە تەمـووزی ١٩٧٠ بەڕێوەچـوو، ئەندامە راسـترەوەکان

---

* مـاددەی دووەمـی ئـەم پەیـرەوە دەڵێـت: حزبەکـە «حزبێکـی دیموکـرات، شۆرشـگێری پێشـرەوە، کـە پارێزگاریـی لـە بەرژەوەنـدی کرێـکاران و جوتیـاران و موچەخـۆران و هونەرمەنـدان و رۆشـنبیرە شۆرشـگێرەکانی کوردسـتانی عێـراق دەکات». مـاددەی ٣ دەڵێـت حزبەکە شـەڕ دەکات «لەپێنـاو ئازادکردن و خۆبەڕێوەبرێتـی بـۆ کوردسـتان لـە چوارچێـوەی کۆمـاری عێراقـدا». مـاددەی ٥ دەڵێـت: حزبەکـە دەچێتـەوە سـەر ئـەو «دۆکترینـە زانسـتییە پێشـکەوتنخوازانە کـە لەگـەڵ واقیعـی نەتـەوەی کوردمانـدا دەگونجێـت».

مـاددەی ٦ دەڵێـت: حزبەکـە شـەڕ دەکات لەپێنـاو دامەزراندنـی دیموکراسـی پەرلەمانـی لـە عێـراق و ئـازادی رادەربڕیـن و ئاییـن و رێکخـراوی سیاسـی و تادوایـی. مـاددەی ١٣ داوای تەرخانکردنـی رێژەیـەک لـە داهاتـی نـەوت دەکات بـۆ کوردسـتان، کـە رێژەکـە بەپێـی رێـژەی دانیشـتوانی کوردسـتان بێـت. مـادەی ١٤ بانگەشـە بـۆ چاکسـازیی ئاودێـری دەکات لـە کوردسـتان، بەتایبەتیـش بەجۆرێـک بێـت کـە لەگـەڵ بارودۆخـی ناوچەکـەدا بگونجێـت و دیاریکردنـی رووبەرێکـی دیاریکـراوی زەوی بـۆ هـەر جوتیارێـک و هەڵوەشـاندنەوەی سیسـتمی دەرەبەگایەتـی, هەروەهـا چەنـد رێگەیـەک پێشـنیار دەکات بـۆ بەهاوچەرخکردنـی سیسـتمی کشـتوکاڵ لـە کوردسـتاندا. بەشـێکی مـاددەی ١٦ بـاس لـە باجـەکان دەکات کـە دەبێـت دادپەروەرانـە بێـت لەسـەر بنەمـای باجـی راسـتەوخۆ و پێشـکەوتووانە بێـت لـە مامەڵـەی داهـات و میراتـدا, هەروەهـا لەسـەر بنەمـای کەمکردنـەوەی باجـە ناراسـتەوخۆکان بێـت بەجۆرێـک کـە تیایـدا چینـی کار زەرەرمەنـد نەبـن. ماددەکانـی دیکە بـاس لـە گەشـەپێدانی پیشەسـازی و پەیوەندییکردن، هەروەهـا پەرەپێدانـی کەلتـوری کـوردی و پـەروەردە و گرتنەبـەری سیاسـەتێکی دەرەکیـی «سـەربەخۆ» و «دژە ئیمپریالسـتی» و تادوایـی لەخۆدەگرێـت.

زۆرترین دەنگیان بەدەست هێنا. ئەگەر ئاشتییەکی تۆکمە دابمەزرێنرێت، و هەروەها حزبەکە بتوانێت لەڕووی سیاسییەوە چالاکتر ببێتەوە، پێدەچێت ئەندامە توندڕەوەکان کاریگەریی خۆیان زیاتر دەربخەن لەناو حزبەکەدا.

٢٧. فۆرمی ڕێکخستنی شۆڕشی کورد شتێکی ئاڵۆزە، ناوچەیەکی بەرفراوان و جیاواز و چەندین کەسی لێقەوماو لە خۆی دەگرێت. ئۆرگانە سەرەکییەکانی دەسەڵاتی کورد لە ساڵانی ١٩٦٦ - ١٩٧٠ بریتی بوون لە: ئەنجومەنی شۆڕش، دەستەی کارگێڕی، و مەکتەبی سیاسیی پدک. وانلی* لە باسی ئەنجومەنی شۆڕشدا دەڵێت: وەکوو پەرلەمانێکی هەڵبژێردراوە کە لە ٦٢ ئەندام پێک هاتووە، باڵاترین دەسەڵاتی هەیە و هەموو چوار مانگ جارێک کۆدەبێتەوە (و ئەگەر لەلایەن سەرۆک یاخود زۆرینەی ئەندامانی ئەنجومەنەکە یاخود لەلایەن مەکتەبی سیاسییەوە بە پێویست بزانرێت، زیاتر کۆدەبێتەوە). لە باسی مەکتەبی سیاسیدا وانلی دەڵێت: وەکو کابینەیەکی وەزاری وەهایە و بەرپرسە لە کۆنترۆڵکردنی هەموو ئۆرگانەکانی شۆڕشی کورد، کە سوپاش دەگرێتەوە. مەکتەبی سیاسیی پدک دەسەڵاتێکی زۆری هەیە بەسەر ئۆرگانەکاندا و یەکێک لە ئەندامەکانی دەکاتە بەرپرسی ئۆرگانەکان.** (لێرەدا پەیوەندییە فەرمییەکانی پدک لەگەڵ ئیدارەدا وەکوو گشتێک دەبینرێت). بارزانی سەرۆکی هەر سێ دەستەکەیە و فەرماندەی گشتی سوپایە، بۆیە لە پێگەیەکدایە کە بەسەر تێکڕای سیستمەکەدا باڵادەستە.

---

* سەرچاوەی پێشوو، پاشکۆکانی ٧ و ٨ی ئەم کتێبە دەقەکانی دەستوری شۆڕشی کوردستانی عێراق و یاسای کارگێڕیی لەخۆدەگرێت، کە هەردووکیان لە ١٧ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٦٤دا دەرچوون. ئەو دوو دەقە لە پاشکۆکاندا بە زمانی فەرەنسیین.

** ئەندامانی دیکەی دەستەی کارگێڕی بریتین لە: نوێنەرانی هەریەک لە سوپا، خێڵەکان، خەڵکانی دیکە و، جڤاتی مەسیحی (ئاشوری). خودی مەکتەبی سیاسیی لەلایەن ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندییەوە هەڵدەبژێردرێن، کە پێکەوە ئەوانیش لەلایەن کۆنفرانسی ئەندامانی ئەو حزبەوە هەڵدەبژێردرێن.

٢٨. کوردانی عێراق توانای جووڵاندنی سوپایەکی ٢٥ هەزار کەسیان هەیە. ئەو چەکانەی کە هەیانە بریتین لە: تفەنگ، رەشاش، چەکی دژە تانک، و برێک تۆپهاوێژ. هەروەها کەلوپەلی رادیۆ و چەند ئامێرێکی گواستنەوەشیان هەیە. بەشێکی زۆری چەکە سوکەکانیان لە سوپای عێراقیەوە دەست بەسەردا گرتووە یاخود دزیوویانە لێیان. ئەوەی دەمێنێتەوە کە چەکە قورسەکانن ئەوا بەشی زۆریان لەلایەن ئێران و ئیسرائیلەوە لەنێوان ساڵانی ١٩٦٣ - ١٩٦٦ دابین کراون. سوپاکە برێک چەکیشی لە چیکۆسلۆڤاکیاوە پێگەیشتووە، بەڵام بەو ئەندازەیە نییە.

٢٩. بەپێی زانیارییەکان، پێشمەرگە لە کۆتایی شەستەکاندا بەسەر ١٠ کەتیبەدا دابەش بوبون، هەر کەتیبەیەک لە خەڵکی ناوچەکە پێک هاتبوو و سەربەخۆییەکی بەرچاوی هەبوو. چالاکیی کەتیبەکان بە تەواوی هاوئاهەنگ نەبوون لەگەڵ یەکتری، لەگەڵ ئەوەشدا بارزانی وەکو فەرماندەی گشتی برێک دەسەڵاتی ناوەندیی بەسەریاندا هەبوو. کارایی ئەم کەتیبانە تارادەیەک سنوردار بوو لەبەرئەوەی ئامادەییان تێدا نەبوو لە دەرەوەی ناوچەکانی خۆیان چالاکی بکەن. (لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو گروپە بچوکانەی کە کوردەکان بۆ چالاکی کۆماندۆیییەکان بەکاریان دەهێنان توانایەکی گەورەی جوڵەیان هەیە، ئەویش بە لەبەرچاوگرتنی سروشتی جوگرافیاکەیان).

خودی بارزانی، کە نزیکەی ٢٠٠ چەکداری خێڵەکیی پاسەوانیی دەکەن، بەردەوام لەکاتی شەڕەکاندا لە جوڵەدایە و ئەم کارەش بۆ خۆونکردن ئەنجام دەدات. (زۆربەی جار خێزانەکەشی لەگەڵی دابوون. ئیدریس کە کوڕی سێیەمێتی وەکو یاریدەدەری تایبەتی ئەو وابوو).

٣٠. رێکخستنی سەربازیی کورد لەنێوان ساڵانی ١٩٦٣ تا ١٩٦٦،

پێشکەوتنی بەرچاوی بەخۆوە بینیووە، بەشێک لە هۆکارەکەشی بریتییە لە: ڕێنمایی ئیسرائیلییەکان و بەشەکەی دیکەش بەهۆی لێشاوی سەربازە عێراقی‌یە هەڵهاتووە کوردەکانەوەیە بۆ ناو پێشمەرگە. لەکاتی شەڕەکاندا کوردەکان تەکنیکی پارتیزانییان بەکارهێناوە و تارادەیەکی باش تیایدا سەرکەوتوو بون، هەوڵیان نەداوە دەست بەسەر شارەکاندا بگرن بەڵکو ویستویانە سوپای عێراق رابکێشنە چیاکان و لەوێ لێیان بدەن. زۆربەی جار ئەو خاکەی لە هاویندا لەدەستیان دەدا، لە وەرزی زستاندا و لەوکاتەی کە بەفر و باران تەنگی بە هێزەکانی حکومەت هەڵدەچنی، دەیانگرتەوە. بەلای کوردەوە، شەڕەکان بەگشتی سروشتێکی بەرگریکارانەیان هەبوو، بەشێک لە ئامانجەکەش: بۆ بەکراوەیی هێشتنەوەی ئەو ڕێگەی یارمەتی‌یانە بوو کە لە ئێرانەوە پێیان دەگەیشت. سودیان لە هەموو دەرفەتێک بۆ بێزارکردنی سوپای عێراق نەبینی، هەروەها چەکی ئاژاوەگێڕییان بە هەموو تواناوە بەکارنەهێنا، لەکاتێکدا دامەزراوە نەوتی‌یەکانی ناوچەی کەرکوک لەوپەڕی لاوازییدا بوو بەرامبەر ئەم چەکە (بڕوانە خاڵی ٤٥ی خوارەوە). سنوردارکردنی شەڕەکان تەنیا لە بەرزاییەکان و هەوڵنەدان بۆ دەستگرتن بەسەر شارەکاندا بۆ بارزانی باش بوو، چونکە لەوێ دەیتوانی دەسەڵاتی خێڵەکیی لە بەڕێوەبردندا بسەپێنێت.

## ٥. هەڵوێستی وڵاتانی دراوسێ لەبارەی کێشەی کوردەوە

**سوریا:**

٣١. لە ساڵی ١٩٦٣دا، ئەوکاتەی رژێمی بەعس لە هەریەکە لە بەغداد و دیمەشقدا لەسەر حوکم بوو، سورییەکان بەئاشکرا نزیکەی دوو کەتیبە چەکداریان ناردە عێراق بۆ ئەوەی لە شەڕی دژی کورددا یارمەتی عێراقی‌یەکان بدەن و پڕوپاگەندەی ئەوەیان بڵاودەکردەوە کە یارمەتی عێراق

دەدەن بۆ ئەوەی خۆی لە (جوداخواز و چەتەکان) رزگار بکات. لە پاش ساڵی ١٩٦٣ەوە، ئەو دوو وڵاتە پەیوەندییەکی باشیان پێکەوە نەبووە و سوریا سیاسەتی بەشدارییەکردنی لە ناکۆکییەکاندا گرتووەتە بەر. هەرچەندە بڕوا وایە کە کوردانی سوریا لەڕووی دارایییەوە یارمەتی برا عێراقییەکانیان دابێت و لەکاتی شەڕەکانیشدا هاتوچۆ لە سنورەکانی سوریا بەدی کراوە، بەڵام دەسەڵاتدارانی سوریا هەمیشە بە توندی رووبەڕووی چالاکییەکانی کوردەکان بونەتەوە. لە سوریا نەتەوەخوازیی کوردی چیتر وەکو بابەتێکی گرنگ تەماشا ناکرێت و کوردەکانی ئەوێ بە ژمارە زۆر لەوە کەمترن ئەو بارە قورسە هەڵبگرن (نزیکەی ٣٠٠ هەزار کەسن).

**تورکیا:**

٣٢. تورکیا بە ئاشکرا خۆی تێکەڵی ناکۆکییەکە نەکردووە، بەڵام لەکاتی شەڕەکاندا سنورەکانی لەگەڵ عێراقدا قەتیس نەکردووە. تورکیا بە دڵنیاییەوە دەیەوێت بونێکی هەمیشەیی لە عێراقدا هەبێت ئەگەر ئەم بونە ببێتە هۆی ئارامییەکی زیاتری سنورەکانی لە باشوری خۆرهەڵاتی وڵاتەکەیدا، بەڵام پێویستە لەوە بترسێت کە خۆبەڕێوەبەرێتی بۆ کوردانی عێراق هانی کوردەکانی تورکیاش دەدات، کە ژمارەیان نزیکەی ٣ ملیۆن کەسە. کێشەی کوردەکانی خۆی (تورکیا) لە مانگی نیسانی ١٩٧١دا مایەی سەرنج بوو، کاتێک ترس لە ڕاپەڕینی کوردان لە خۆرهەڵاتی تورکیا بووە یەکێک لە هۆکارەکانی سەپاندنی یاسای سەربازیی لەو وڵاتە. (تورکەکان بە نهێنی و تایبەت پێیان راگەیاندوین کە کێشەی کوردەکان، بەتایبەت لەناو خوێندکاراندا لە ئەڵمانیای خۆرهەڵاتەوە بەڕێوەدەبرێت). لەگەڵ ئەمانەشدا، لە کۆنگرەیەکی رۆژنامەنوسیی رۆژی ١ی ئایار سەرۆک وەزیری تورکیا رایگەیاند کە: مەترسیی کوردەکان تەنیا ئەگەرێک بووە نەک راستیی و سەپاندنی یاسای سەربازی وایکردووە هێزە ئەمنییەکان بتوانن بارودۆخەکە بە تەواوی کۆنتڕۆڵ بکەن.

**ئێران:**

٣٣. بڕوا وایە کە کوردەکان لەسەردەمی قاسمدا کۆمەکی دارایی‌یان لە حکومەتی ئێرانەوە وەرگرتبێت و هەندێک لە کوردەکان لە یەکەکانی سوپای ئێراندا راهێنانیان لەسەر بەکارهێنانی چەکی قورس پێکرابێت.

٣٤. بێ متمانەیی ئێران بە حکومەتی بەعس و چۆنێتی مامەڵەکردنەکەی لەگەڵ ناسردا وایکردووە کە لە ساڵی ١٩٦٣دا هاوکارییەکی زۆری کوردەکان بکات، لەگەڵ ئەوەشدا، (شا) خۆی لەوە پاراست کە بە ئاشکرا پشتیوانی خۆی بۆ دۆزی کورد دەرببڕێت. لە ساڵی ١٩٦٣ەوە ئێران گرنگترین هاوپەیمانی کورد بووە، چەک و کەرەسەی دیکە، پێداویستی، پارە، راهێنان و پەیوەندییکردنی نهێنی بۆ دابین کردون. هاوکاریی ئێران یەکێکە لە (نهێنی‌یە ئاشکراکان)ی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و زۆرجار (شا) لەکاتی باسکردنی پەیوەندییەکانی لەگەڵ حکومەتی عێراقدا، وەکو "کارتە کوردی"یەکەی ئاماژەی بۆ دەکات. هەرچەندە (شا) بە پشتیوانی کردن لە بارزانی مەترسی ئەوەی دروست دەکرد هەستی دانیشتوانە کوردەکەی ئێران بجولێنێت و وا لە عێراق بکات لە شەتولعەرەب و خوزستاندا تۆڵە لە ئێران بکاتەوە، بەلاّم نەیدەتوانی بهێڵێت ئەم دەرفەتەی بۆ شەرمەزارکردن و لاوازکردنی رژێمی عێراق لەدەست دەربچێت. هەروەها، (شا) ئەم کارەی وەک رێگرییەک لە دەستتێکەڵکردنی سۆڤێت لەگەڵ کوردەکاندا دەبینی، پشتیوانیی سۆڤێت بۆ کورد لەسەردەمی قاسمدا تارادەیەکی تەواو لە بواری زارەکی‌دا سنوردار بوو، بەلاّم بە لەبەرچاوگرتنی نەیارێتییە لە رادەبەرەکەی یەکێتی سۆڤێت بەرامبەر رژێمە بەعسییەکەی ساڵی ١٩٦٣، ترسێکی بەربڵاو هەبوو کە رەنگە ئەو پشتیوانی‌یە شێوازێکی زۆر گرنگتر بەخۆوە ببینێت و ئاسایشی وڵاتانی دیکەی ناوچەکە و عێراقیش بخاتە بەردەم مەترسی.

٣٥. حکومەتی عێراق لە چەند بۆنەیەکدا سکاڵای خۆی بەرامبەر پشتیوانی ئێران بۆ کوردەکان راگەیاندووە، دیارترینیان لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٦٦ بوو ئەوکاتەی کە بارەگایەکی سوپای عێراق لە پێنجوێن لەلایەن کوردەکانەوە ئابلۆقە دراو درایە بەر تۆپ. ئەوکاتە عێراق بەوە ئێرانی تۆمەتبار کرد کە هەم چەک و تەقەمەنی دەداتە کورد و هەم رێگەیان دەدات خاکەکەی بەکاربهێنن و لەوێوە تۆپبارانی ]عێراق[ بکەن. حکومەتی ئێران تۆمەتەکانی رەت کردەوە.

٣٦. جگە لەوە چەکانەش ئەوا ئێران خۆی رێی دەدا بە ئیسرائیل کە بە خاکەکەیاندا چەک بگەیەنێتە دەست کوردانی عێراق. زۆربەی پشتیوانییەکانی دیکە، بە یارمەتییەکانی خاچی سوریشەوە*. هەر لە ئێرانەوە دەگەیەنران و زوربەی ئەو رۆژنامەنوسانەی کە لە هەشت ساڵی رابردوودا سەردانی کوردستانی عێراقیان کردووە لە سنورەکانی ئێرانەوە چونەتە ئەو وڵاتە و بە رەزامەندی دەسەڵاتدارانی ئێران ئەم کارەیان کردووە.

٣٧. رێککەوتنەکەی ئازاری ١٩٧٠ ئەو چەکە لەدەستی ئێراندا دژ بە عێراق دەردەهێنێت و ئەگەر رێکەوتنەکە بەردەوام بێت، توانای عێراق بۆ دروستکردنی کێشە لە کوردستانی ئێراندا زیاد دەکات. بۆیە چاوەڕواندەکرێت ئێران دژی ئەو رێکەوتنە کار بکات، چونکە زیان بە بەرژەوەندییەکانی دەگەیەنێت. بەڵام بە لەبەرچاوگرتنی ئەو راستییەی کە ئێران سەرەڕای ئەو فشارە (دارایییە) بەرچاوەی کە لەسەر بارزانی دایدنابوو ئەوا نەیتوانی لەسەرەتاوە رێ لەم رێکەوتنە بگرێت، کە ئەمەش دەریدەخات کە ئێران تەنیا دەسەڵاتێکی

---

* ئەمەش برێکی بەرچاو بووە. وانلی (سەرچاوە پێشوو) دەڵێت: هەشت وڵاتی رێکخراوی خاچی سوور کە بەناو تەنیا باس لە «سوید و هەنگاریا» دەکات، لەژێر چاودێریی خاچی سووری نێودەوڵەتیدا تفەنگیان رەوانەی کورد کردووە.

سنورداری بەسەر کوردانی عێراقەوە هەیە و ناتوانێت ناچاریان بکات جارێکی دیکە چەک هەڵگرنەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، بارزانی هێشتا پەیوەندی لەگەڵ ئێرانییەکاندا هەیە و ئەگەر بزانێت دیسانەوە لەگەڵ عێراقییەکاندا توشی شەڕ دەبێتەوە، وەکو جاران بۆ بەدەستهێنانی پارە و چەک و پێویستییەکانی رוودەکاتەوە ئێران. تا ئەوکاتەی پەیوەندییەکانی نێوان ئێران و عێراق ئاڵۆز بن، ئەگەری ئەوە هەیە ئێران داواکانی بارزانی قبوڵ بکات.

٣٨. لەئێستادا، کوردانی ئێران کە نزیکەی ١,٥ ملیۆن کەسن، بە بەراورد لەگەڵ ئەوانی دیکە بێدەنگن، و حکومەتی ئێران بە تێکەڵێک لە (چاکسازیی زەویوزار، کەناڵی تەلەفزیۆن، بەرنامەی رادیۆیی، و تادوایی) و گۆچان (رووبەڕووبونەوەی توندی نائارامی، دورخستنەوەی ئەوانەی کێشە دروست دەکەن و تادوایی) توانیویێتی بە رادەیەکی زۆر بە توندی کۆنترۆڵیان بکات. بەڵام هێشتا پاشماوەی نارەزایەتیبونی هەیە، کە رەگوریشەی دەگەڕێتەوە بۆ هەوڵە سەرنەکەوتووەکەی دامەزراندنی کۆمارێکی سەربەخۆی کورد لە ئێران لە ساڵی ١٩٤٦دا، کە دەکرا دژی حکومەتی ئێران بەکاربهێنرێت بەتایبەت ئەگەر کوردانی عێراق بیانتوانیایە خۆبەڕێوەبەرێتی تەواو بەدەست بهێنن یاخود بگەیشتنایە رێکەوتنێکی هەمیشەیی لەگەڵ حکومەتی عێراقدا. بۆیە، لەکاتێکدا کە هاندانی کوردانی عێراق بۆ شەڕکردن لەگەڵ حکومەتی عێراقدا لەپێناو بەرژەوەندییەکانیاندا لە قازانجی ئێرانە، بەڵام سەرکەوتنی کورد لەم شەڕەدا لەوانەیە لە قازانجی ئێران نەبێت. ئامانجی ئێران ئەوەیە: کێشەکە بە تەواوی لە ناو سنوری عێراقدا بهێڵێتەوە.

**ئیسرائیل:**

٣٩. لانی کەم لە ساڵی ١٩٦٤ەوە ئیسرائیل بە نهێنی چەک دەداتە کوردەکان، چەکەکانیشیان بە هەماهەنگی لەگەڵ دەسەڵاتدارانی ئێران و بە

ناو خاکی ئەو وڵاتەدا گەیاندووەتەوە کورد. هەروەها ئیسرائیل راوێژکاری سەربازی بۆ رەوانەکردون و راهێنانی بۆ ئەفسەرانی کورد دەستەبەرکردووە و برێک پارەی نەختینەشی بۆ دابین کردون. ئامانجی ئیسرائیل بەگشتی ئەوەیە حکومەتی عێراق بە باکوری وڵاتەکەوە سەرقاڵ بکات کە ئەگەر وانەبێت ئەوا رەنگە بواریان ببێت بەگژ ئیسرائیلدا بچن. بڕوا وایە کە ئیسرائیل تفەنگ و رەشاش و هاوەن و چەکی دژەفڕۆکە و دژەتانکی دابێتە کوردەکان. یارمەتییەکەی ئیسرائیل نهێنییەکی پارێزاوترە لە یارمەتییەکەی ئێران لەلای دەسەڵاتدارانی عێراق، جاروبار لە راگەیاندنەکانەوە باس لەم پرسە دەکرێت، چ لە دنیای عەرەبی و چ لە شوێنانی دیکە.

## ٦) هەڵوێستی بەرامبەر یەکێتی سۆڤیەت و وڵاتە شیوعییەکان

٤٠. یەکێتی سۆڤیەت بەردەوام بانگەشەی ئەوەی کردووە کە دەبێت کورد لە چوارچێوەی کۆماری عێراقدا مافە نەتەوەیییەکانی بدرێتێ و رەخنەی گرتووە لە حکوومەتە یەک لەدوای یەکەکانی عێراقی لەسەر رەفتاریان بەرامبەر بە کورد. لەگەڵ ئەوەشدا، ئاستی رەخنەکەی بەپێی هەڵوێستی لەسەر حکومەتەکەی ئەو سەردەمە گۆڕانکاریی بەسەردا هاتووە. بۆیە، کاتێک حکومەتە بەعسییەکەی ساڵی ١٩٦٣ کە زۆر بە توندی دژی شیوعییەکان بوو شەڕی دژی کورد دەست پێ کردەوە، ئەوا یەکێتی سۆڤێت هەڵمەتێکی توندی پڕوپاگەندەی دژی ئەو حکومەتە راگەیاند و، هەڕەشەی ئەوەی کرد کە: پرسی کورد بباتە بەردەم ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان. لەهەمان کاتدا، مەنگۆلیا — کە رەنگە لەسەر رێنمایی یەکێتی سۆڤێت بێت، داوای ئەوەی کرد کە بڕگەیەک بخرێتە ئەجێندای کاتیی کۆمەڵەی گشتیی نەتەوەیەکگرتووەکانەوە کە حکومەتی عێراق بە جینۆسایدکار تۆمەتبار دەکات. (هیچکام لەم دەستپێشخەرییانە نەگەیشتنە

هیـچ کـوێ چونکـە ئەندامـە ئەفریقـی و ئاسـیاییەکان پشـتیوانییان لـێ نەکـرد و یەکێتـی سـۆڤێت نەیدەویسـت بۆچوونـی عـەرەب بـە تێکـڕای پەراوێز بخـات)*. لە سـاڵی ١٩٦٥دا، بـە پێچەوانـەوە، کاتێـک یەکێتـی سـۆڤێت پەیوەنـدی دۆسـتانەتری لەگـەڵ حکومەتـی بەغـدا دامەزراندبـوو، ئاسـتی پڕوپاگەندەکـە نـزم کرابـووەوە و هیـچ هەوڵێـک نـەدرا کـە پرسـی کـورد ببرێتـە بـەردەم نەتەوەیەکگرتـووەکان.

٤١. هەرچەنـدە کێشـەی کـورد دەرفەتـی ئـەوەی بـە یەکێتـی سـۆڤێت بەخشـی کـە لـە ئـاوی لێڵدا ماسـی بگرێـت - پشـتیوانیکردنی کـوردی عێراق رەنگـە بایەخی بـە پرسـی کـورد لـە ئێـران و تورکیـا و شـوێنەکانی دیکـە لـێ بکەوتایەتـەوە - یەکێتـی سـۆڤێت لەمـاوەی بـواری ئـەم لێکۆڵینەوەیـەدا، سـودێکی کەمـی لـە دەرفەتەکـە وەرگرتـووە و هۆکارەکەشـی بریتییـە لـەوەی پەیوەندییەکانـی لەگـەڵ حکومەتـی عێـراق و جیهانـی عەرەبدا بەگشـتی لـەم بابەتـە بـەلاوە گرنگتـر بووە. لەگـەڵ دابینکردنـی پشـتیوانی مەعنـەوی و بڕێکـی دیاریکـراو کۆمەکـی دارایـی بـۆ کـورد، یەکێتـی سـۆڤێت و وڵاتانـی دیکـەی شـیوعیی کۆمەکێکـی زۆر کەمـی دیکەیـان پێبەخشـیون، هەرچەنـدە چەنـد راپۆرتێکـی پشتڕاسـت نەکـراوە هـەن کـە بـاس لـەوە دەکـەن لـە خۆرهەڵاتـی تورکیـاوە چەکـی (چیکـی) بـە نهێنـی گەیەنراوەتـە دەسـت بارزانـی و هەروەهـا زانـراوە کـە خاچـی سـوری سـۆڤێت پێداویسـتی و جلوبـەرگ و دەرمانـی بـۆ بارزانـی رەوانـە کـردووە.

٤٢. یەکێتـی سـۆڤێت لـە پێـش سـاڵی ١٩٧٠ لـە مامەڵەکردنـدا لەگـەڵ بەعسـی عێـراق ئـەوا بە بەردەوامیی کێشـەی کوردی سـەرکۆنە کردووە و، بە دڵنیاییشـەوە یەکێتـی سـۆڤێت لەپشـت پـەردەوە چالاکانـە هانـدەری رێککەوتنامـەی ئـازار بـووە. بـە وردی رادەی بەشـدارییەکەی نازانرێـت، بـەڵام لـە رۆژنامـەی پراڤدای رۆژی ٢٨ی نیسـانی ١٩٧٠دا وتەیـەک لـە سـکرتێری گشـتیی پـدک وەرگیـراوە کە

* کـوردەکان خۆیـان لەنێـوان سـاڵانی ١٩٦٢ تاوەکـوو ١٩٦٨ کۆمەڵێـک وەفدیـان نـارد بـۆ کۆکردنـەوەی پشـتیوانی لـە نەتـەوە یەکگرتـووەکان, بـەڵام سـەرکەوتوو نەبـوون لـە بەدەسـتهێنانی.

سوپاسی یەکێتیی سۆڤێتی کردووە بەوەی (هەوڵی شەریفانەی) داوە لەپێناو "کۆتایهێنان بە شەڕی براکوژی .... و بەدەستهێنانەوەی ئاشتی و ئارامی لە عێراقدا .." خەڵکی سۆڤیەت بەمە تێدەگەن کە حکومەتەکەیان بە ئاشکرا لە بەرامبەر هێنانە کایەی ڕێککەوتنەکەدا دەنرخێنرێت.

٤٣. پێدەچێت کە یەکێتی سۆڤیەت لە ساڵی ١٩٧١دا تێکچونی پەیوەندییەکانی نێوان کورد و عەرەبی بەلاوە خراپ بووبێ. بڕوا وایە وەفدە باڵاکەی سۆڤێت کە بە سەرکردایەتی نۆڤیکۆڤ کە لە حوزەیرانی ١٩٧١دا سەردانی عێراقی کردووە و جەختی لەگەڵ حزبی بەعس کردووەتەوە کە دەیانەوێت ڕێککەوتنەکەی ساڵی ١٩٧٠ بمێنێتەوە.

## ٧) هەڵوێستی دەوڵەتی بەریتانیای مەزن

٤٤. لەو ماوەیەدا کە ئەم لێکۆڵینەوەیە دەیگرێتەوە، سیاسەتی دەوڵەتی بەریتانیای مەزن ئەوەبوو کە: نا-بۆ بەشدار بوون. هەڵوێستی ڕاگەیەندراو ئەوەیە کە سەرۆک وەزیر لە وەڵامی پرسیارێکدا لە پەرلەمان لە حوزەیرانی ١٩٦٥دا ڕایگەیاند: «دەوڵەتی بەریتانیای مەزن بەداخە بۆ شەڕ لە کوردستان، هەروەها بۆ هەموو ناسەقامیگرییەک لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست دا، بەلام ئێمە پێمان وایە کە پرسی کورد بابەتێکی ناوخۆیی عێراقە و بۆ ئێمە ناگونجێت کە دەستی تێ وەربدەین.» لەسەر ئاستی نهێنیش، دەوڵەتی بەریتانیای مەزن لە چەند کاتێکی گونجاودا داوای لە هەردولایەنەکە کردووە کە بگەنە ڕێککەوتنی ئاشتییانە.

٤٥. کێشەی کورد بەلای بریتانیاوە بایەخێکی تایبەتی هەیە ئەویش بەهۆی ئەوەی کە دامەزراوەی کۆمپانیای نەوتی عێراقە (IPC)، کە هەردوو

کۆمپانیای شێڵ و بریتش پیترۆڵیەم دەگرێتەوە، هەریەکەیان ڕێژەی ٢٣,٧٥٪ی خاوەنداریێتییان هەیەو، لەژێر مەترسییەکی تەواوی هێرشی کوردەکاندان. لەسەردەمی قاسمدا کوردەکان خۆیان لە ئاژاوەنانەوە بەدوور گرت، جگە لە هەندێک بابەتی زۆر لاوەکی نەبێت، بەلام لە ساڵی ١٩٦٢دا دوو ئەندامی کۆمپانیای نەوتی عێراقیان رفاند و ئامانجەکەشیان کە بەدەستهێنانی سەرنجی خەڵک بوو، بە سەرکەوتوویی بەدەستهێنا. لەکاتی شەڕەکانی ساڵی ١٩٦٣، ١٩٦٥ و ١٩٦٦دا تەنیا چەند حاڵەتێکی لاوەکیی ئاژاوەگێڕیی هەبون، ڕەنگە ئامانج لە هەندێکیان هەڕەشەبوبێت بۆ ئەنجامدانی کردەوەی جددیتر. لەگەڵ ئەوەشدا ترس لە ئاژاوەی گەورەتر بێ بنەمایە، لەبەرئەوەی پێدەچێت کورد حەزنەکەن کە رای گشتی عێراق و خۆرئاوا بەگشتی و کۆمپانیای نەوتی عێراق بەتایبەتی لەدەست بدەن، بەتایبەت کە کوردەکان هیوای ئەوە دەخوازن رۆژێک بێت ئەو نەوتە ببێتە سەرچاوەی سەرەکی داهاتی خۆیان. جددیترین ڕووداو لە مێژووی ناکۆکییەکەدا لە ساڵی ١٩٦٩دا ڕوویدا کاتێک بەهۆی گوللەهاوەنێکەوە دامەزراوە نەوتییەکەی کەرکوک زیانی بەرکەوت و بۆ ماوەی زیاتر لە هەفتەیەک لەکارکەوت. بەگشتی دەتوانرێت بگوترێت کە کورد بەلای کەمەوە هەڕەشەن بۆسەر بەرهەمی نەوتی عێراق.

٤٦. یەکێکی دیکە لەو خاڵانەی کە شۆڕشی کورد دەبەستێتەوە بە بەرژەوەندییەکانی دەوڵەتی بەریتانیای مەزنەوە ئەوەیە: کە جێگیربوونی سوپای عێراق لە کوردستان ئەوا توانای عێراقی بۆ هێرشکردنەکەی یاخود بۆ ئەنجامدانی چالاکی لە کەنداودا کەم کردووەتەوە. ئەم بابەتە هەرگیز ئەوەندەی هۆکار نەداوەتەدەست دەوڵەتی بەریتانیای مەزن کە بیر لە پشتیوانیکردنی چالاکانەی کوردەکان بکاتەوە، کە ڕەنگە واش بکات بەرژەوەندییە سیاسی و بازرگانییە بەرچاوەکەی دەوڵەتی بەریتانیای مەزن لە عێراقدا بخاتە بەردەم مەترسی و لە وڵاتانی دراوسێدا نائارامی

لەگەڵ کوردەکانیاندا لێ بکەوێتەوە. (لەکاتی رێککەوتنامەکەی ئازاری ساڵی ١٩٧٠ەوە، لەراستیدا چەند بەشێک لە سوپای عێراق گواستراونەتەوە و ئەمەش نیگەرانی بۆ نمونە لەلای کوەیتییەکان زیاد کردووە.)

٤٧. لەکاتێکدا کە لە تێروانینی دەوڵەتی بەریتانیای مەزندا بۆ ئەم کێشەیە، پەیوەندییەکانی لەگەڵ حکومەتی عێراقدا بەگرنگتر زانراوە، بەڵام لە سیاسەتی چەکدارکردندا ئەوا دەوڵەتی بەریتانیای مەزن ئەو ئەگەرەی لەبەرچاو گرتووە کە رەنگە عێراق چەک لە دژی کوردانی سیڤیل بەکاربهێنێت، بۆیە چەکی نەداوەتە عێراق. هەربۆیە، لە ساڵی ١٩٦٣ دا بڕیاریان دا رادەستکردنی موشەک و گوللە هاوەن و تەقەمەنییەکانی دیکە بە هێزە چەکدارەکانی عێراق قۆناغبەندی بکەن، سەبارەت بە رادەستکردنی تەقەمەنی و موشەکیش لە ساڵی ١٩٦٤یش هەمان رێگە گیرایە بەر. بەڵام دەوڵەتی بەریتانیای مەزن هەرگیز لەبەر ئەم هۆکارە بڕیاری ئەوەی نەداوە چەک و تەقەمەنی نەداتە عێراق، هۆکاری تر، بۆ نمونە: رێگرتن لەوە عێراق لە رووی دابینکردنی پێداویستیی سوپاییەوە پاشکۆی یەکێتی سۆڤێت بێت، بەگرنگتر زانراون.

٤٨. تەنانەت لە کاتی شەڕەکانیشدا، سیاسەتی تێوەنەگلانی دەوڵەتی بەریتانیای مەزن، رێی لەوە نەدەگرت کە پەیوەندی وریاییانە لەگەڵ کورددا درێژە پێ بدات و ئەوە بە باش زانراوە کە تا ئەو جێگەیەی بارودۆخەکە رێگەدەدات، پەیوەندییەکە بەردەوام بێت. بۆیە، کاتێ لە ساڵانی ١٩٦٠ەکاندا جاروبار وەفدی کورد لەلایەن ئەندامانی وەزارەتی دەرەوە و کۆمۆنوێڵزەوە لە لەندەن لە دەرەوەی وەزارەت و بەشێوازی نافەرمی پێشوازییان لێ کراوە. دژبەیەکییەکە لەوەدایە کە لە بەغدا، پەیوەندییەکان ئەوەندە نهێنی نین لەبەر ئەوەی زۆرێک لەو کوردانەی پەیوەندییان لەگەڵ گروپە یاخییەکاندا هەیە رێگەیان دراوەتێ کە بە ئازادی بجوڵێنەوە و تەنانەت هەندێکیشیان لە حکومەتیشدا بەشدارن. لە بارەگاکانی دیکەدا، وەفدە کوردەکان پێشوازییان

لێ کراوە و ئەگەر داوای چاوپێکەوتنیان کردبێت یاخود نامەیەکیان بۆ سەرۆک وەزیر یاخود بۆ وەزیرەکانی دیکە هەبوبێت لێیان وەرگیراوە و ڕەوانەی وەزارەتی دەرەوە و کۆمۆنوێلز کراوە، بەڵام وا باو بووە کە پێزانینی نوسراویان نەدرێتێ یاخود وەڵامی نامەکانیان نەدرێتەوە.

٤٩. چالاکییەکانی وەفدەکانی کورد لە لەندەن هەندێ جار نارەزایی باڵیۆزی عێراقی لێ کەوتۆتەوە، بەتایبەتی لە ساڵی ١٩٦٥ دا ئەو کاتەی جەلال تاڵەبانی لە کەناڵی بی.بی.سی BBC یەوە دەرکەوت. پرسی پێدانی ڤیزا بە کوردەکان چەند جارێک باسی لێوە کراوە: سیاسەتەکە ئەوە بووە کە: ڤیزاکە بدرێت، بەڵام هەندێ جار لەگەڵیدا داوا لە وەرگر کراوە (بەڵام بەسەریدا نەسەپێنراوە) کە بەشداریی لە چالاکیی سیاسیی یاخود لە پروپاگەندەی ئەوتۆدا نەکات کە شەرمەزاربوونی دەوڵەتی بەریتانیای مەزنی لێ بکەوێتەوە.

٥٠. سەرەڕای سیاسەتی تێوەنەگلانەکەی دەوڵەتی بەریتانیای مەزن، حکومەتی عێراق گومانی ئەوەی هەبووە کە بەریتانیا بە هەماهەنگی لەگەڵ ئێراندا کۆمەکی کوردی کردبێت. (بەو ڕاستییەی کە هەردوو وڵات ئەندامی هاوپەیمانێتی سەنتۆن ئەوا ئەم ئەفسانەیەی بەهێز کردووە.) لە مانگی ئابی ١٩٦٥ دا عێراقییەکان ڕایانگەیاند کە ئەو چەک و تەقەمەنییانەی لەلای کوردەکان دەستی بەسەردا گیراوە بەڵگەی بەرجەستەی ئەم قسەیەن، بەڵام ئەو وردەکارییەی دواتر بۆ پشتیوانیکردن لەم تۆمەتبارکردنە رادەستیانکرد ئەوەندە نەبو کە بتوانرێت سەرچاوەی ئەو چەک و تەقەمەنییانەی پێ بناسرێتەوە. دەوڵەتی بەریتانیای مەزن دڵنیایی دایە عێراق کە هیچ چەکێکیان نەداوەتە کورد.

٥١. دەوڵەتــی بەریتانیــای مــەزن دوودڵ بــووە لــەوەی داوا یــەک لــەدوای یەکەکانــی عێــراق لــە ســاڵانی ١٩٦٣ - ١٩٦٦ جێبەجــێ بــکات کــە دەیانویســت دەوڵەتــی بەریتانیــای مــەزن کاریگەریــی خــۆی لەســەر (شــا) دابنێــت و وای لــێ بــکات کــە یارمەتییەکانــی بــۆ کــورد بوەســتێنێت، وا هەســت کــراوە کــە ئــەم کارە نارەحەتــی لــەلای ئێرانییــەکان دروســت دەکات و کاریگەریــی لەســەر سیاســەتیان نابێــت. لەگــەڵ ئەوەشــدا، یــەک جــار لــە ســاڵی ١٩٦٥ دەوڵەتــی بەریتانیــای مــەزن بــە نوێنەرایەتــی عێراقییــەکان داوایەکــی لــەو جــۆرەی کــرد بەبــێ ئــەوەی بچێتــە وردەکارییەکانــی ئــەو داوایــەوە؛ و هەروەهــا، لــە مانگــی کانونــی دووەمــی ســاڵی ١٩٦٦، کاتــێ چەنــد کردەوەیــەک لەســەر ســنور کــە پەیوەندییــان بــە شــەڕی کــوردەوە هەبــوو ناکۆکــی لەنێــوان ئێــران و عێراقــدا دروســتکرد، دەوڵەتــی بەریتانیــای مــەزن لەســەر داوای هــەردوو حکومەتەکــە، راوێــژی بــەوی دیکەیــان دا کــە میانــڕەو بــن، ئــەم داوایەشــی بــە تۆنێکــی نــزم لێکــردن. لــەو کاتــەوە، هەلومەرجەکــە بەجۆرێــک نەبــووە کــە پێویســت بــکات لێــرەدا بــاس بکرێــت.

٥٢. دواییــن جــار کــە پرســی کــورد لــە پەرلەمانــدا باســی لێــوە کــرا لــە مانگــی کانونــی یەکەمــی ســاڵی ١٩٦٩دا بــو، ئــەو کاتــەی کــە مســتەر ڕۆز پرســیاری کــرد ئایــا دەوڵەتــی بەریتانیــای مــەزن بەنیــازە لــە کۆمیســیۆنی مافەکانــی مرۆڤــی نەتــەوە یەکگرتــووەکان باســی مەترســییەکانی ئاشــتی لــە خۆرهەڵاتی ناوەڕاســت بوروژێنێــت کــە ســەرچاوەکەی "بۆمبــاران و خوێنرێژییەکانی حکومەتــی عێراق"ە. وەزیــری دەوڵــەت بــۆ وەزارەتــی دەرەوە و کۆمۆنوێڵــز وەڵامــی دایــەوە و گوتــی: "نەخێــر. پێــم وانیــە کــە کارێکــی گونجــاو بێــت بــۆ دەوڵەتــی بەریتانیــای مــەزن کــە بــۆ ئــەم بابەتە لــە نەتــەوە یەکگرتــووەکان دەستپێشــخەری بــکات. هەڵوێســتی ئێمــە بەرامبــەر هــەر کردارێــک لــە نەتــەوە یەکگرتــووەکان، کــە لــە کۆمیســیۆنی مافەکانــی مرۆڤــدا باســی لێــوە بکرێــت، ئــەوا بەنــدە بــەو بابەتــەوە کــە باســی لێــوە دەکرێــت." ئــەم وەڵامــە کۆکــە لەگــەڵ ئــەو سیاســەتی تێوەنەگلانــەی کــە

دەوڵەتی بەریتانیای مەزن بەرامبەر پرسی کورد گرتویەتیە بەر. هەروەها لەگەڵ ئەو هەڵوێستەی دەوڵەتی بەریتانیای مەزنیشدا تەبایە کە کاتێ لە جێگەیەک باس لە بوونی شێوازێکی بەردەوام لە پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤ وەک سیاسەتێکی گشتی بکرێت، ئەوا نەتەوە یەکگرتووەکان دەتوانێت بە شێوەیەکی رێگەپێدراو بابەتەکە لەبەرچاو بگرێت، ئەگەرچی تۆمەتەکەش پەیوەندی بە ناوخۆی وڵاتێکی ئەندامیشەوە هەبێت. (هەر شتێک کە نەبووبێتە شێوازێکی بەردەوام یاخود سیاسەتێکی گشتی نەبێت، ئەوە رەنگە بکەوێتە چوارچێوەی یاسای ناوخۆیی پەیڕەوی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە "مادەی ٢، بەندی ٧"، جگە لەو کاتەی کە پێشێلکردنی بەشێک لە مافی تاکە کەس دەبێتە بەشێک لە سیاسەتیی گشتی). لە ساڵی ١٩٦٣دا ئەو کاتەی مەنگۆلیا داوای کرد حکومەتی عێراق بە تۆمەتی جینۆساید تۆمەتبار بکرێت، و دواتر کە لەو داوایە کشایەوە، دەوڵەتی بەریتانیای مەزن هەر وەک ئەوەی ساڵی ١٩٦٩ خۆی بەو پرسەوە نەبەستەوە، هەرچەندە ئەوکات لەناو وەزارەتی دەرەوە ئەو بۆچونە دروست بوو بوو کە ئەو کارەی عێراقییەکان دەیکەن، بۆ نمونە بۆردومانکردنی گوندە کوردییەکان، لە پێویستییە سەربازییەکان بەدەرە و رەنگە بتوانرێ بخرێتە چوارچێوەی هەوڵی ئەنقەستەوە بۆ لەناوبردنی رەگەزی کورد.

٥٣. سیاسەتی تێوەنەگلانەکەی دەوڵەتی بەریتانیای مەزن، بەمانای رەتکردنەوەی هەمو ئەو داوایانە بوو کە لە کاتی پەرەسەندنی جەنگەکاندا کوردەکان بۆ وەرگرتنی هاوکاری بەرزیان دەکردەوە. لە ساڵی ١٩٧٠وە، تا ئەو کاتەی حکومەتی عێراقی لە کانونی یەکەم (یان تشرینی دووەم) ی ساڵی ١٩٧١دا پەیوەندییە دیبلۆماسییەکانی لەگەڵ کورددا پچڕاند، پرۆژەیەکی بچوکی یارمەتیدانی تەکنیکی بۆ عێراق لەئارادا بوو. کورد وەکو هەموو هاووڵاتیانی عێراق مافی ئەوەیان هەبوو کە ئەگەر حکومەتی عێراق

بیانپاڵێوێت، سودی لێ وەربگرن. دەوڵەتی بەریتانیای مەزن کتێب و کەلوپەلی بۆ زانکۆی سلێمانی دابین کردووە. باڵیۆزی حکومەتی شاژن لە بەغداش لەگەڵ دەزگای (شەڕ لەسەر ویست War on Want-) دا لە پەیوەندیدابوون بۆ ئەوەی بزانێت ئەو دەستەیە دەتوانن لە ڕێگەی کۆمەڵگەی مانگی سوری نێودەوڵەتییەوە کەلوپەلی پزیشکی ڕەوانە بکەن یان نا.

**پوختە:**

٥٤. جێبەجێکردنی ڕێکەوتننامەکە ساڵی ١٩٧٠ چەند بەرەوپێشچونێکی بەخۆوە بینیوە بەڵام چەند کێشەیەکی سەرەکی هەن، بۆ نمونە ئاستی ورد و سروشتی خۆبەڕێوەبەرێتییەکەی کورد، ئەو داهاتەی کە بۆ هەرێمە کوردییەکەی تەرخان بکرێت، و هەروەها داهاتوی هێزە کوردییەکان (پێشمەرگە) و داهاتوی پدک، هەمو ئەمانە هێشتا بە وردەکارییەوە یەکلا نەکراونەتەوە و چارەسەر نەکراون. بە دڵنیاییەوە نازانرێت ئەم ڕێککەوتننامەیە چەنێک دەخایەنێت، بەڵام چەند ئاماژەیەک هەن کە کوردەکانی نارەحەت کردووە بەهۆی هێواشی جێ بە جێ کردنی ڕێکەوتنەکەوە و نارەحەتییەکەشیان لە زیادبوون دایە. ئەگەر ئەمە بەردەوام بێت، ڕەنگە شەڕێکی وەهای لێ بکەوێتەوە ئەوەندە توند بێت کە زۆر نەخایەنێت ڕێکەوتنەکە بکاتە وشەی سەر کاغەز.

٥٥. بەردەوامیی ڕێکەوتنەکە لە بەرژەوەندی حکومەتی عێراق و کوردەکانیشدایە. کوردەکان بەهۆی شەڕەوە نارەحەتیی زۆریان چەشتووە، بەڵام عێراقیش بەگشتیش زیانی لە کاریگەرییەکانی ئەم شەڕە بینیوە و هیچ حکومەتێک نیە لە بەغدا کە لەکاتی شۆڕشی کوردەکاندا بتوانێت خۆی بە گەورەیماڵەکەی خۆی بزانێت. سەبارەت بە بریتانیاش، ئاشتی لە کوردستان واتە: نەمانی هەڕەشە لەسەر بەدەستهێنانی نەوت لە باکوری عێراق دا.

٥٦. دیوەکەی تری ئەم دراوەش ئەوەیە، کاتێ عێراق پێویست نەکات سوپاکەی لە باکوردا بهێڵێتەوە، رەنگە توشی کەڵکەڵەی سەرکێشیی دەرەکی ببێت - ئێران بێت یان کەنداو (بەتایبەتی لەدوای کشنەوەی هێزەکانی بریتانیا)، یاخود لە "بەرەی خۆرهەڵات"ەوە روبەروی ئیسرائیل ببێتەوە. دژبەیەکییەکە لەوەدایە کە ئاشتی لە کوردستان، رەنگە مەترسی لەسەر ئارامیی ناوچەکانی خۆرهەڵاتی ناوەراست پێوە بێت. ئەمەش نە بەلای ئێرانەوە باشە، کە چارەسەربوونی کێشەی کورد چەکێکی دژ بە رژێمی عێراق لەدەست دەردەهێنێت، و نە بەلای کوەیتەوە، کە سەرەرای دداننانی فەرمی عێراق لە ساڵی ١٩٦٣دا بە سەربەخۆیی کوەیت لە چوارچێوەی سنورەکانی ساڵی ١٩٣٢، هێشتا گومانی لە ئارەزووە سنورییەکانی عێراق هەیە.

٥٧. ئەگەر کوردی عێراق رێکەوتنێکی بەردەوام بەدەست بهێنن، ئەمە رەنگە خواستی کوردانی ئێران و تورکیاش چالاک بکاتەوە. بە بەراورد لەگەڵ کوردی عێراق، لە ئێستادا کوردی ئێران بێدەنگن، بەڵام لە تورکیا مەترسییە چاوەروانکراوەکەی راپەرینی کوردان یەکێک بووە لە هۆکارەکانی پشت سەپاندنی یاسای سەربازیی لە مانگی نیسانی ١٩٧١ دا.

٥٨. لە ساڵی ١٩٦٣، ترسی ئەوە لەئارادا بوو کە رەنگە یەکێتی سۆڤێت بە شێوەیەکی سەرەکی لایەنی کوردانی عێراق بگرێت. ئەمە لەوانە بو ئاسایشی وڵاتانی ناوچەکە و خودی ئاسایشی عێراقیش بخاتە بەردەم مەترسییەوە. بەڵام یەکێتی سۆڤێت بە پلەی یەکەم پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ عێراق و جیهانی عەرەب درێژە پێداوە و تارادەیەکی زۆر بەتەواوی خۆی تەنیا لە پێدانی پشتیوانیی مەعنەوی بۆ کوردەکان قەتیس کردووە. گومانی تێدا نییە کە یەکێتی سۆڤێت بەشداربووە لە بانگەشەکردن و تەنانەت لە هەموارکردنی رێکەوتننامەکەی ساڵی ١٩٧٠.

٥٩. لـە مـاوەی لێکۆڵینەوەکـەدا، کـوردەکان بەشـێوەیەکی بـاش یەکبەرەییـان پاراسـتووە و ڕێگەیـان نـەداوە حکومـەت چارەسـەری سـەربازییان بەسـەردا بسـەپێنێت. بـەڵام دابەشـبوون لەنـاو ڕیزەکانیانـدا هەیـە و لەوانەیـە لەگـەڵ بەدیهاتنـی ئاشـتیی بەردەوامـدا، ئـەم جیاوازییانـە جـددی ببنـەوە. جگـە لـە کێبڕکێـی خێڵەکـی، دابەشـبونی سـەرەکیی لەنێـوان کەسـە خێڵەکییـەکان بـە سـەرکردایەتی مـەلا مسـتەفا بارزانـی و ڕۆشـنبیرە شارنشـینە توندڕەوەکاندایـە کـە جـەلال تاڵەبانـی و ئیبراهیـم ئەحمـەد نوێنەرایەتییـان دەکـەن.

هاوپێـچ: وەرگێڕانـی بەشـێک لـە ڕێکەوتننامەکـەی ئەنجومەنـی سـەرکردایەتی شۆڕشـی عێراقـی تێدایـە کـە لـە ١١ی ئـازاری ١٩٧٠دا بـڵاو کراوەتـەوە.

تێبینـی: تـەواوی لێکۆڵینەوەکـە خراوەتـە بـەردەم ئـەو کەسـانەی کـە زۆر ڕێـی تـێ دەچێـت کـە وردەکاریـی و تێبینییەکانیـان جێگـەی بایـەخ بێـت. بـە پێـی داواکارییەکانتـان ئـەوا کۆپـی لێکۆڵینەوەکـە دەنێردرێـت.

هۆبەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست،<br>بەشی لێکۆڵینەوە،<br>فەرمانگەی دەرەوە و کۆمۆنوێڵز

**نهێنی**
**کوردستان، عێراق و ئێران، هەڵوێستەکانی بەریتانیا**
**هەڵوێستی فەرمیی دەوڵەتی بەریتانیای مەزن سەبارەت بە یاخیبوونی کوردەکان**

هەڵویستی ئاشکرای دەوڵەتی بەریتانیای مەزن لەلایەن سەرۆک وەزیرەوە لە وەڵامی پرسیارێکدا لە پەرلەمان لە مانگی حوزەیرانی ١٩٦٥ دا خرایەڕوو:

« دەوڵەتی بەریتانیای مەزن بەداخە لە شەڕەکانی کوردستان، هەروەک چۆن بەداخە لە بەرامبەر بوونی هەموو نائارامییەک لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا، بەڵام پێمان وایە کێشەی کورد بابەتێکی ناوخۆیی عێراقییە کە بۆ ئێمە شایستە نیە دەستی تێ وەربدەین.».

بەهەمان شێوە (شەڕکردن لە کوردستان لە ئێستادا ئەگەرە نەک واقیع)، ئەمەش هەڵوێستی فەرمیی دەوڵەتی بەریتانیای مەزنە.

## هۆکارەکانی پشت ئەم هەڵوێستە:

٢. ڕەنگە بتوانرێ هۆکارەکانی پشت ئەم هەڵوێستە بەمجۆرەی خوارەوە پوخت بکرێتەوە:

(ا) کوردانی عێراق لەدژی حکومەتێکی یاسایی لە بەغدا یاخی بوون کە ئێمە بەفەرمی دەیناسین و چاوەڕوانیمان وایە (یاخود لە ٦٨/١٩٦٧ وابووە) کە پەیوەندیی دیپلۆماسیی ئاساییان لەگەڵدا دەست پێ بکەینەوە.

(ب) باشترین ڕێگا بۆ گەشەپێدانی بەرژەوەندییە سیاسیی و بازرگانییەکانمان لە عێراقدا ئەوەیە: ڕاستەوخۆ مامەڵە لەگەڵ حکومەتی بەغدادا بکەین. پەیوەندی ڕاستەوخۆ یاخود پشتیوانیکردنی کوردەکان تا ئەو ڕادەیەی کە لەبەرچاوی حکومەتی بەغدامان بخات دەبێتە هۆی زیانگەیاندن بەو بەرژەوەندییانە.

(ج) ئەگەر ئێمە پشتیوانی لە کوردانی عێراق بکەین، لەوانەیە ئێران و تورکیا و سوریاش کە کەمینەی کوردیان هەیە پێی نارەحەت ببن.

(د) ئاڵۆزییەکان و سروشتە گۆڕاوەکەی ئەو دەسیسە و هاوپەیمانییانەی لە پرسی کوردەوە ئالاون، ئەوا خۆیان دورخەرەوەیەکی بەهێزن کە وامان لێ دەکەن هیچ بەشدارییەک لەم پرسەدا نەکەین. حکومەتەکانی عێراق و ئێران و باڵەکانی بارزانییەکان و تاڵەبانییەکانی ناو کوردەکان لایەنە سەرەکییەکانن، بەڵام لایەنی دیکە (بۆ نموونە کۆماری عەرەبی یەکگرتوو، ئیسرائیلییەکان و، شا حسێن) یش جار جارە دەستی تێ وەردەدەن.

٣. لەکاتێکدا حکومەتێکی خۆشگوزەران و یەکگرتووی عێراقمان بەلاوە باشە، بەڵام لە ساڵی ١٩٥٨ەوە، ئەگەرە درێژخایەنەکانی ئەم یەکگرتوویی و خۆشگوزەرانییەمان بەلاوە باش نەبووە. بوونی شۆڕشی کوردەکان هەڕەشەی جددی نەخستۆتە سەر بەرژەوەندییەکانمان و ئەزموون دەریخستووە کە: خودی کوردەکان کەمترین هەڕەشەن بۆ سەر جوڵەی نەرمی نەوت لە کێڵگە نەوتییەکانی باکوری عێراق دا. تا چەندە یاخیبوونی کوردەکان توانای عێراق بۆ هێرشکردنە سەر کوەیت لاواز بکات، ئەوەندە لە بەرژەوەندی ئێمەیە. هەرچەندە لەنێوان ئێستا و مانگی ئایاری ١٩٧١دا کە ماوەی پابەندییمان بە کوەیتەوە کۆتایی دێت، هۆکاری سەرقاڵبوونی عێراق و (عەرەب بەگشتی) لەگەڵ ئیسرائیلدا ڕەنگە سەرەکیترین ڕێگر بێت لەبەردەم پلانەکانی عێراقدا بۆ کوەیت.

## پەیوەندی نێوان بەریتانیا و کوردەکان:

٤. سیاسەتی تێوەنەگلانمان ڕێگەی ئەوەی لێ نەگرتووین کە لە رووە مرۆییەکەوە هاوسۆزییەکی نهێنیمان بەرامبەر بە کورد و نارەحەتییەکانیان هەبێت، هەر وەک چۆن ڕێگەشی لێ نەگرتوین کە لەسەر ئاستی تاکەکەسی پەیوەندی لەگەڵ کەسانی کورددا بکەین بەجۆرێک کە لەگەڵ پەیوەندییەکانمان لەگەڵ حکومەتی عێراق یاخود کاربەدەستەکانیدا دژ نەبووبێت. ئەرکە دیپلۆماسییەکانی عێراق لە دەرەوە زۆر بە وردی چاودێریی چالاکییەکانی رەوەندی کوردی و شاندەکانیان دەکەن و، دژ بەیەکیەکە لەوەدایە کە ئەمە ناچاری کردووین پەیوەندییەکانمان لەگەڵیاندا لە لەندەن یاخود شوێنەکانی دیکە شاراوەتر بێت لەو پەیوەندییەی کە لە بەغدا لەگەڵ کوردەکاندا هەمانە، لەوێ زۆرێک لەوانەی کە پەیوەندییان بە یاخیبووانەوە هەیە هێشتا بە ئازادی دەجوڵێن و تەنانەت بەشداری لە حکومەتیشدا دەکەن.

جارجارە وەفدەکانی مەلا مستەفای بارزانی هەوڵیان داوە برەو بەو تێزە بدەن کە بڵێن: پرسی کورد پرسێکی نێودەوڵەتییە و تەنیا لە چوارچێوەی پرسێکی ناوخۆیی عێراقدا قەتیس نییە، بۆ ئەمەش پشتیوانی بەریتانیا لە پرۆژە هەڵوەشاوەکەی دوای جەنگی یەکەمی جیهانی بە بەڵگە دەهێننەوە کە سەبارەت بە دروستکردنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی بوو (پەیمانی سیڤەر و تا دوایی). دەوڵەتی بەریتانیای مەزن سورە لەسەر ئەوەی کە کوردەکان بە دەوڵەت نەزانێت و رەتیشی کردۆتەوە کە مشتومڕ لەسەر ئەو هەڵوێستە بکات کە لەسەر بنەمای پەیماننامەکانی ساڵانی ١٩٢٠ەکاندا دامەزراوە. جار-جارە کوردەکان رای گشتی لە بەریتانیا و وڵاتانی دیکە لەپێناو دۆزەکەیاندا دەجوڵێنن (بەتایبەتی لەکاتی بەردەوامبوونی شەڕەکاندا کە کورد لە هەواڵەکاندا دەردەکەوێت) و توانیویانە بڕێکی کەم لە پشتیوانیی پەرلەمان بەدەست بهێنن. هەندێ جار بەهۆی لەبەرچاوگرتنی مرۆییەوە و

نـەوەک ئـەو چەکـەی دەدرێتـە عێـراق لـەدژی کوردانـی مەدەنـی بـەکار بهێنرێت، ئـەوا سیاسـەتی پێدانـی چەکمـان بـە عێـراق راوەسـتاندووە و ئەمـەش وای لـێ کردویـن لـە سـاڵی ١٩٦٥دا لـە رووی کارگێڕییـەوە لـە گەیاندنـی ئـەو موشـەک و بۆمبانـە دوابکەویـن کـە بەپێـی گرێبەسـت دەبـوو پێـوەی پابەنـد بیـن. سـەبارەت بـە کەسـانی کـورد، رێکارەکەمـان بـەم جـۆرەی لای خوارەوەیـە:

(أ) لـە بەغـدا، پەیوەندییـەکان لەژێـر چاودێـری باڵیـۆزی خاوەنشـکۆ «شـاژن» دایـە و بەنـدە بـە بارودۆخـی رۆژ و پێگـەی کەسـەکانەوە.

(ب) لە لەندەن، ئەندامانی بەشی خۆرهەڵات چەند وەفدێکیان بە نافەرمی و بە رەهایی لەسەر بنەمای «کۆمەڵایەتی» بینیووە (بۆ نمونە چاخواردنەوەیەک لە یانەی پۆڵ مۆڵ) لە دەرەوەی باڵەخانە فەرمییەکان. هەوڵدانی کوردەکان بۆ چاوپێکەوتن لەگەڵ وەزیرەکانیشدا هەر بەم تەکنیکە خۆی لێ لادراوە. لەو کاتەدا کە بە باش زانرابێت، ڤیزا بە کوردەکان دراوە و بە روونیی و بە راشکاوی هۆشداریی زارەکییان دراوەتێ کە لە شانشینی یەکگرتو بەشداریی هیچ چالاکییەکی سیاسیی نەکەن (بۆ نموونە: دەرکەوتنی جێی مشتومڕ لە تەلەفزیۆندا).

(ج) لــە نوســینگەکانی دیکــەی دەرەوەی وڵاتــدا، ئەگــەر وەفــدە کــوردەکان داوای چاوپێکەوتنیـان کردبێـت، ئـەوا بینـراون. ئـەو نامانـەی کـە بـۆ سـەرۆک وەزیـر یاخـود بـۆ وەزیرەکانـی دیکـە نوسـراون، قبـوڵ کـراون و نێـردراون بـۆ وەزارەتــی دەرەوە، بــەڵام لەبەرامبــەردا هیــچ ددانپیانانێــک یاخــود وەڵامێکــی نوســراویان پێنەدراوەتــەوە.

## شا و کوردانی عێراق:

٥. یەکێـک لـە «نهێنییـە ئاشـکراکان»ی خۆرهەڵاتـی ناوەڕاسـت ئەوەیـە: کـە لــەم دە ســاڵەی رابــردودا حکومەتــی ئێــران بڕێکــی بەرچــاو پــارە و کەلوپــەل و راهێنــان و پێداویســتیی و پەیوەنــدی نهێنــی بــۆ کــوردەکان (بــەزۆری بــۆ بارزانییــەکان) دابیــن کــردووە. شــا لــە چوارچێــوەی پەیوەندییەکانیــی لەگــەڵ

حکومەتـی بەغـدا، ئـەم بابەتـەی وەک (کارتـە «کوردی»یەکـەی) نـاوزەد کـردووە. پێدەچێـت پەیوەندییەکانیـی بارزانـی لەگـەڵ ئێرانییەکانـدا کەمێـک لاواز بووبێـت و پشــتگوێ خرابێــت، لەگەڵیشــیدا بــڕی پشــتیوانییەکانی ئێــران کەمبوونەتــەوە. لەقەڵەمدانــی بارزانــی وەکــو بوکەڵەیەکــی (شــا) کارێکــی هەڵەیــە، هــەر یــەک لـەم دووانـە هەوڵـی بەکارهێنانـی ئەویتـر دەدەن بـۆ مەرامەکانـی خۆیـان، بـەڵام کاراییەکــە تــا ڕاددەیەکــی زۆر لەگۆڕاندایــە و بەنــدە بــە بارودۆخــی گشــتی پەیوەندییەکـەی نێـوان حکومەتـی عێـراق و ئێـران و هەروەهـا پەیوەنـدی نێـوان حکومەتـی بەغـدا و بارزانــی لــەو ســاتە دیاریکـراوەدا.

## پەیوەندییەکانی ئێران / عێراق:

٦.جگـە لـە پرسـی کـورد بەشـێک لـەو هـۆکارە سـەرەکییانەی کـە پەیوەنـدی نێـوان ئێـران و عێـراق تێـک دەدەن بریتیـن لـە:

أ) رق و بــێ متمانەیــی زۆری (شــا) بەرامبــەر بــە نەتــەوە پەرســتی عەرەبــی شۆڕشــگێڕ و، هەروەهــا ئــەو ڕق و بێ متمانەییەشــی کە عەرەبە (شۆڕشــگێڕەکان) بەرامبــەر بــە (شــا) وەکــو ســەرکردەیەکی نەریتــی (و ســەرکەوتوو) هەیانــە.

ب) ئــەو دوژمنایەتیــی و رقــە نەریتییــەی کــە هــەردولا، عــەرەب و فــارس بەرامبــەر بەیەکتــری هەیانــە.

ج) ئـەو هەوڵـە بـەردەوام و تائێسـتا بـێ بەرهەمانـەی کـە حکومەتـی عێـراق بـۆ زیندوکردنـەوەی پرسـی کەمینـەی عەرەبـی لـە خوزسـتان داوێتـی ]بەعـەرەب کـردن[.

د) ئـەو ناکۆکییـە سـنوریەی لەسـەر ڕێـڕەوی ئاویـی شـەتولعەرەب، سـنوری دەریایـی لـە کەنـدا و هەنـدێ ناوچـە سـنورییەکان لـە ئـارادا هەیـە.

ە) بابەتــە ئاینییــەکان: بەشــێکی زۆری فارســەکانی ئێــران و نیــوە هــەزار و بــێ دەرەتانەکـەی عەرەبـی عێـراق سـەر بـە مەزهەبـی شـیعەن، ناکۆکـی هەیـە

لەسەر سەردانیکردنی مەزارگە شیعەکان لە هەردوو وڵاتدا، هەروەها عێراق سەرکردەیەکی ئاینیی گرنگی لە وڵاتەکەیدا جێ کردووەتەوە کە ناکۆکی لەگەڵ (شا)دا هەبووە.

و) ئەگەری رکابەریکردن لە کەنداوی فارس دا. بۆ نمونە، ئێران داگیرکردنی کوەیت وەکو لێدوانێکی کاریگەر لە بەرژەوەندیەکانی لەقەڵەمدەدات.

٧. هەرچەندە هیچ ئاماژەیەک بۆ چارەسەربوونی ئەم پرسانە لە ئارادا نییە، بەڵام حکومەتی ئێران و حکومەتی عێراق، بە سەختی توانیویانە پەیوەندییەکانیان لە چوارچێوەیەکی دروست و تەنانەت بە رواڵەت دۆستانەدا بهێڵنەوە، لەکاتێکدا کە کێشەکان لە زستانی ١٩٦٥/١٩٦٦دا لە (کەمترین) ئاستدا بوو. ئەم بێدەنگییە تەنانەت لە جەنگی ئیسرائیلیشدا لە ساڵی ١٩٦٧ بەردەوام بوو، کە لەوکاتەدا ئێران سەرکەوتوانە توانی خۆشحاڵی خۆی بەرامبەر بە نارەحەتی عەرەبەکان بشارێتەوە و برێک دەنگە دەنگی بۆ پشتیوانیکردنی هاوئایینە موسڵمانەکانی کرد، (ئەمەش لەکاتێکدا بوو کە پشکی خۆی لە هەناردەی نەوتی خۆرهەڵاتی ناوەراست زیاد دەکرد).

پرسی ناوبژیوانی/ نوێنەرایەتیکردن لەلایەن دەوڵەتی بەریتانیای مەزنەوە:

٨. جاروبار حکومەتی عێراق سکاڵای ئەوەی بردووەتە بەردەم دەوڵەتی بەریتانیای مەزن کە بە نوێنەرایەتی عێراق داوا لە (شا) بکات پشتیوانییەکانی بۆ کورد بووەستێنێت. ئێمە لەبەر ئەم هۆکارانەی خوارەوە خۆمان لەم کارە پاراستووە:

أ) هیچ کاتێک پێمان وانەبووە کە نوێنەرایەتی کردنی لەم جۆرە کاریگەریی هەبێت. (شا) لە سیاسەتیدا بەرامبەر بە کورد شوێن بەرژەوەندییەکانی خۆی کەوتووە نەک ئەوەی لەژێر فشاری خۆرئاوادا بێت.

ب) سەبارەت بە حکومەتە عەرەبە شۆڕشگێڕەکان، (شا) هەمیشە دەوڵەتی بەریتانیای مەزنی بە هاوپەیمانێکی ناواقیعی و (نەرم) لەقەڵەم داوە.

ج) بۆیە ئێمە هەر نوێنەرایەتییەک بکەین جگە لە نارەحەتکردنی (شا) هیچی دیکەی لێ ناکەوێتەوە.

د) ئێمە بەرژەوەندی گەورەی سیاسیی، ستراتیجیی، سەربازیی و ئابوریمان لە ئێراندا هەیە (بۆ نموونە مۆڵەتی فڕینی ئاسمانی بەسەر ئێراندا کە هێزەکانمان لە خۆرهەڵاتی دوور لە کەنداوی فارسی پشتی پێ دەبەستن و، هەروەها ئەو کێڵگە نەوتییانەی کە تاکە سەرچاوەی نەوتی خاوی ناعەرەبین لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست دا). ئەمەش بەتایبەت لەو سەردەمە سەختەی پێش و دوای کشانەوەمان لە کەنداو دا گرنگە، کە تیایدا هاوکاری/ ڕەزامەندیی ئێران بۆ هەرجۆرە مانەوەیەکی درێژخایەن گرنگییەکی سەرەکی هەیە. بۆیە ئێمە لەلای خۆمانەوە بەشێوەیەکی ڕێژەیی، شتێکی کەممان لە داواکانی ئێران بەدی هێناوە، بۆیە ناتوانین هیچ یەکێک لەو متمانانەی (کریدت)انەی کە لە لای شا هەمانە لە بابەتێکدا سەرفی بکەین کە بەرژەوەندییەکی گەورە و ڕوون و ئاشکرای بەریتانیای تێدا نەبێت.

ه) هەر متمانەیەک کە عێراقییەکان بەدەستی بهێنین ئەوا پێدەچێت کورتخایەن بێت و، پێشناچێت بە ئاستێکی خزمەتکردنی باش، خزمەت بە بەرژەوەندییە درێژخایەنەکانمان لە عێراقدا (بۆ نموونە: نەوت) بگەیەنێت.

ئێمە بەشێوەیەکی سروشتی لەگەڵ پەیوەندییەکی باش (یاخود لانی کەم ڕاست و دروست) لەنێوان ئێران و عێراقداین و، (شا) ئەمە دەزانێت. بەڵام خۆمان لەوە پاراستووە کە نوێنەرایەتی هیچکام لەم دووانە بکەین، جگە لەوەی لە زستانی ١٩٦٥/٦٦دا کردمان. لەوکاتەدا چەند ڕووداوێکی جددی لە سنورەکان هەبوون کە پەیوەندیان بە هێرشی ئەوکاتەی حکومەتی عێراقیەوە هەبوو بۆسەر کوردەکان و، ئەو دوو وڵاتە خەریکبوو گورز لە

یەکتـر بوەشـێنن. ئێمـە لەوکاتـەدا لەسـەر داوای هـەردوو وڵات، راوێژمـان بـە وڵاتەکـەی بەرامبـەردا کـە میانـەڕەوی بگرنەبـەر. تەنانـەت لەوکاتەشـدا ئـەم کارەمـان بـە نەرمـی ئەنجـام دا و لەوکاتـەوە بارودۆخەکـە بـە هیـچ جۆرێـک نەگەیشـتووەتە ئـەو ئاسـتە.

بەشی خۆرهەڵات، وەزارەتی دەرەوە
٢ی تشرینی یەکەمی ١٩٦٨

**باڵیۆزخانەی بریتانیا**
**ئەنقەرە**
**١٤ی تشرینی یەکەمی ١٩٦٨**
**١٩ /٤/١٤**

بەڕێز کیک
کاروباری کوردان:

وەکو هەواڵێکی سەرنجڕاکێش، ڕۆژنامەی (ئاکشەم)ی چەپگەرا لە ماوەی یەک مانگی ڕابردودا چەند وتارێکی (هەولوسو تورگوت)ی پەیامنێریانی بڵاوکردووتەوە کە بەم دواییانە لە ناوچە کوردییەکانی عێراق بووە و وتووێژی دوورودرێژی لەگەڵ سەرکردە کوردەکاندا ئەنجامداوە، بە مەلا مستەفا بارزانیشەوە. هیواداربوم کورتەیەک لەبارەی وتارەکانت پێ بدەم بەڵام وەک دەردەکەوێت ئەم کارە - وەکو شوێنی پێتیۆن - تا هەتایە بەردەوام دەبێت، بۆیە ڕەنگە حەز بکەیت گرنگترین خاڵەکان کە تائێستا بڵاوکراونەتەوە لەبەردەستتدا بێت.

٢. هەواڵە گرنگە ڕاستییەکە لە ڕۆژی ١٢ی ئەیلولدا لە ڕۆژنامەی ئاکشەمدا بڵاوکرایەوە کە چەند نامەیەکی لە بارزانییەوە وەرگرتووە تاوەکو بیاندات بە سەرۆک و سەرۆک وەزیری تورکیا. گرنگترین خاڵەکانی ئەم چەند نامەیە بریتی بوون لە:

أ) خواستی کوردی عێراق کە لەگەڵ عەرەبی عێراقدا مافی یەکسانییان هەبێت و جیهانی دەرەوەش لەم دۆزە بێدەربەستە.

ب) شکستهێنانی حکومەتی عێراق لە جێبەجێکردنی رێککەوتنامەکەی ساڵی ١٩٦٦ و لەبەر ئەمەش کورد بڕوای بە حکومەتی عێراق نەماوە.

ج) خواستی بەهێزکردنی پەیوەندییەکان لەگەڵ خەڵک و حکومەتی تورکیا «کە درێژکراوەی ئیمپراتۆریەتیی عوسمانیی ئیسلامین».

د) ئایین و مێژوو و ئامانجی هاوبەشی گەلانی تورک و کورد و ئەو راستییەی کە کۆماری تورکیا باشترین شایەتحاڵە بەرامبەر بە داگیرکارییەکانی خاکی کورد لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانییەوە.

ه) داوایەک بۆ حکومەتی تورکیا کە فشار بخاتەسەر عێراق کە کۆتایی بە ستەم و نادادپەروەری بهێنێت.

و) داوایەک کە دەبێت کوردێک بە فەرمی لەلایەن حکومەتی تورکیاوە پێشوازی لێ بکرێت تاوەکو بتوانێت بە وردی بابەتەکانی سەرەوە باس بکات.

٣. دەستبەجێی هەریەک لە وتەبێژانی سەرۆک وەزیر و وەزیری دەرەوە رەتیانکردەوە کە هیچ زانیارییەکیان لەبارەی ئەو نامانەوە هەبێت، کە ئەمەش نیشاندەری ئەوپەڕی هەستیاریی تورکە بەرامبەر بە کێشەی کورد. کاتێک پرسیارم لە جێگری بەڕێوەبەری گشتی بەشی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست لە وەزارەتی دەرەوە کرد لەبارەی نامەکانەوە، ئەو خۆی لە وەڵامدانەوە لادا و، پاشتر ئەو گوتی: کە بەشەکەیان ئەو نامانەی نەدیوە و ئاڕاستەی بەشێکی دیکەی کردم.

٤. لەگەڵ ئەوەشدا، دیارە حکومەتی تورکیا جارێکی دیکە بیری لەم بابەتە کردووەتەوە، چونکە کاتێک لە کۆنگرەی رۆژنامەوانی رۆژی ١٤ی

ئەیلولدا پرسیار لە سەرۆک وەزیران کرا، ئەو ددانی بە بونی نامەکاندا نا، بەڵام گوتی بە تەواوی دەستپێشخەریی بارزانی بووە. ئەو رایگەیاند کە: عێراق وڵاتێکی دۆستە و تورکیا دەست لە کاروبارە ناوخۆییەکانی وەرنادات و تورکیا هەڵوێستێک نانوێنێت کە زیان بە عێراق بگەیەنێت. «ئێمە کار لەگەڵ ئەو وڵاتانەدا دەکەین کە لەڕووی دیپلۆماسییەوە بە دانپیانراویان دەزانین ، بەڵام کاتێک نامەیەکمان پێ بگات ناتوانین رەتی بکەینەوە».

٥. سکرتێری تایبەتی وەزیری دەرەوە دواتر بۆی پشتڕاست کردمەوە کە بەڕاستییەکەی ئەو نامانە گەیشتونەتە دەستیان، هەروەک چۆن بەرپرسێکی دیکەی بەشی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست جەختی لێ کردنەوە. بەرپرسەکەی دووەمیان گوتی: زنجیرەکەی ئاکشام راگەیاندنێکی وروژێنەر و لایەندارە و هەڵوێستی حکومەتی تورکیا بەتەواوی ئەوەیە کە سەرۆک وەزیر پێناسەی کردووە. ئەو گوتی: حکومەتی تورکیا بە دیاریکراوی حەزی کردووە ئەم هەڵوێستە دروستە بە حکومەتی نوێی عێراق رابگەیەنێت کە بەلایانەوە هێشتا ژمارەیەکی نەناسراوە.

٦. هەرە سەرنجڕاکێشەکەیان لە ناو خودی زنجیرە وتارەکەدا بریتی بوو: لە چاوپێکەوتنێکی دوورودرێژ لەگەڵ بارزانی. بارزانی دوای ئەوەی پەژارەی خۆی لەبارەی جیابونەوەیانی لە «برا تورکەکانمان و گەلی عوسمانی» راگەیاندووە بەپێی راپۆرتەکە گوتویەتی: کورد گەلێکی بێتاوانە و هیچ نیازێکی نییە بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆیی. ئەوان تەنیا شەڕی سوپای عێراقیان کردووە. ئەو داوا لە حکومەتی تورکیا دەکات هاوکاریی ماددی راستەوخۆیان بداتێ. بارزانی بۆ بەدەستهێنانی رەزامەندیی تورکەکان دەڵێت: «تورکیا تاکە سەرکردەیە لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و یاخود لە جیهانی ئیسلامیدا و ئێستا کاتی ئەوەیە کە هەموو دەوڵەتە مسوڵمانەکان

لەژێـر سـەرکردایەتی تورکیـادا یەکبگـرن بـۆ ئـەوەی بتوانـن بەرەیـەک لـە بەرامبـەر ( یـان لـە دژ؟) جیهانـی مەسـیحیدا دروسـت بکـەن». ئـەو کوردەکانـی تورکیـای بـە تـورک دانـاوە. ئـەوە دەسـتکەوتی ئەتاتـورک بـووە کـە تورکیـای نـوێی بـە لەیەکدانـی چەندیـن رەگـەز پێکـەوە دروسـت کـردووە. کـوردەکان چوونـە ریـزی عەرەبـەوە تاوەکـو دەوڵەتـی عێـراق دروسـت بکـەن، بـەڵام عەرەبـەکان ناپاکییـان لـە کـورد کـرد و هەوڵیـان دەدا لەپێنـاو نەتەوەخوازیـی عەرەبیـدا بونیـان بسـڕنەوە.

دڵسۆزی هەمیشەییت،
جۆن دۆ دس

وێنەیەک بۆ: بەڕێز بەغدا و بەڕێز تاران.

**نهێنی**
**باڵیۆزخانەی بەریتانیا**
**بەغدا**
**١٩ی تشرینی یەکەمی ١٩٦٨**

**بەڕێز دەیڤد،**
**کوردەکان**

پێیان راگەیاندوم و، شایستەی ئاگادارییە، کە ئەو کەسانەی لە ئێستادا سەردانی باکور دەکەن بۆ ماوەی دوو هەفتە رێگەیان پێ دەدرێت بمێننەوە و دوای ئەو ماوەیە پێویستە بگەڕێنەوە ئەو شوێنانەی کە لێوەیەوە هاتون. مانا رونەکە ئەوەیە: لەوانەیە لە ماوەی دوو هەفتەی داهاتودا شتێک روو بدات. زانیارییەکی پشتڕاستنەکراوەشم بیستووە کە مەلا مستەفا بارزانی هۆشدارییەکی داوەتە حکومەت کە ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بنێت:

(١) هەمو هێزە نانیزامییەکان («فورسان») چەک بکات.
(٢) هەموو لایەنگرەکانی تاڵەبانی چەک بکات.
(٣) وا بکەن کە باکور لەماوەی مانگێکدا «پێش کەوتن بەخۆیەوە ببینێت».

مەلا مستەفا هۆشداری ئەوەشی پێ داون کە ئەگەر ئەم داواکارییانە جێبەجێ نەکرێن، ئەوا ئامادەیە لە شەڕکردن سود وەربگرێتەوە.

٢. لــە مانگــی ئایــارەوە کــە ئێمــە هاتوویــن، ئــەوا راپۆرتــەکان بــەردەوام بــاس لــە ئەگــەری نزیکبوونــی ڕوودانــی شــەڕ دەکەنــەوە. ڕەنگــە هۆکارەکــەی ئەمجارەیــان ئــەوە بێــت شــتێکی جددیتــر روو بــدات، بــەڵام بــە بۆچونــی مــن ئــەم کاتــەی ســاڵ بــۆ حکومــەت زۆر بێمانایــە کــە خــۆی لــە شــەڕی باکــورەوە بگلێنێــت، ڕەنگــە ئامانجیــان زیاتــر ئــەوە بێــت کــە: کــوردەکان لــە دژی یەکتــری هــان بــدەن و خۆیــان لــە ڕووبــەڕوو بونــەوەی عەرەب/کــورد بپارێــزن.

دڵسۆزی هەمیشەییت،
ئەی. ئی. ساوندەرز

وێنەیەک بۆ
بەڕێز یو. ماکینسۆن
بەشی خۆرهەڵات

**بەڕێز دی. مۆنتیگۆمری**
**بەشی خۆرهەڵاتی نزیک، وەزارەتی دەرەوەی کۆمۆنویڵز، لەندەن، SW1**
**وێنەیەک بۆ: بەڕێزان**
**بەغدا**
**تاران**
**UKMiS نیویۆرک**
**مستەر ئەی. تی. گریگۆری**
**وەزارەتی وزە**
**تەیمس هاوس ساوز**
**میل بانک، لەندەن، SW1**

## بەشی خۆرهەڵاتی نزیک

ئەم پاشنیوەڕۆیە باڵیۆزی عێراق تەلەفونی بۆ کردم بۆ ئەوەی پێم بڵێت کە لە ڕێگەی BBC یەوە زانیویێتی لە بەرنامەیەکی ئەمشەوی BBC2 لەبارەی کەمینەکانەوە، تەلەفزیۆنی BBC ڕایگەیاندووە کە ئەمشەو دوو فیلم بڵاو دەکاتەوە کە گوایە ئەڵمانیا بەرهەمی هێناون (بەڵام بە ڕوونی نازانرێت ئەڵمانیای خۆرهەڵاتە یان خۆرئاوا) و لەبارەی سلۆڤاکەکانە لە چیکۆسلۆڤاکیا و کوردەکانیشە لە عێراق. هەروەها، باڵیۆزەکە لەوە تێ گەیشتووە کە فیلمەکان لێدوانی BBCیان دەخرێتە سەر و هەندێ لەو کوردانەی کە لە لەندەن دەژین لە بەرنامەکەدا بەشداری دەکەن و وەڵامی ئەو پرسیارانە دەدەنەوە کە لەبارەی جەنگەکە و داواکارییەکانی کورد و شتی لەو جۆرەوە لێیان دەکرێت.

٢. باڵیۆزەکە رایگەیاند: نیگەرانە لەوەی کە پێناچێت هیچ کام لەم شتانە لەم قۆناغەی ئێستادا خزمەت بە پەیوەندییەکانی شانشینی یەکگرتو / عێراق بکات، پێدەچێت کە شەرمەزاریی دروست بکات هەم بۆ خۆی و هەم بۆ مستەر ئیڤانس کە لە بەغدایە. راشیگەیاند: سەرەڕای سەختییەکان هەستی کردووە ناچارە ئەم بابەتە بە من رابگەیەنێت و پرسیاری کرد کە ئایا دەتوانین هیچ کارێک لەمبارەیەوە بکەین.

٣. بە باڵیۆزم راگەیاند: پێم وایە هیچ رێگایەک نیە بە BBC رابگەیەنین کە ئەم بەرنامەیەی ئێوارەیان هەڵوەشێننەوە چونکە لە بابەتی لەمجۆرەدا کەناڵەکە خۆیان گەورەی خۆیانن. باڵیۆز دوای ئەوەی رایگەیاند کە هیوای خواستووە کە پەیوەندییەکانی نێوان بەریتانیا و عێراق بەرزتر رابگیردرێن، وتەکانی قبوڵ کردم. لەسەر ئەوە رێککەوتین کە من ئەم بۆچونانەی ناوبراو تۆمار بکەم و سوپاسم کرد کە ئەم بابەتەی خستۆتە بەردەم سەرنجی من.

دێنیس ئالێن

٢٢ی تشرینی یەکەمی ١٩٦٨

وێنەیەک بۆ: بەشی سیاسەتی راگەیاندن

**نهێنی**

**بۆ بەغدا**

**راپۆرتی ژمارە ٣٦٥**

**رۆژی ٢٣ی تشرینی یەکەم**

**وێنەیەک بۆ ئەنقەرە، تاران**

**کوردستان**:

رۆژی ٢٢ی تشرینی یەکەم BBC لە میانەی بەرنامەی "ئەوروپا"ی کەناڵی BBC2 دا فلیمێکی بەڵگەنامەیی تەلەفزیۆنی ئەڵمانیای خۆرئاوای لەبارەی کوردەوە پەخش کرد. بەشێکی زۆری فلیمەکە مێژوویی بو و لە سەردەمی پەیماننامەی سیڤەرەوە تا ئێستای دەگرتەوە و، تا راددەیەکی باش بێلایەن بوو. فلیمەکە باسی لەو رێوشوێنە توندانەش دەکرد کە تورکەکان لەنێوان دوو جەنگەکە و ئێرانییەکانیش لەدوای جەنگی دووەمی جیهانییەوە کوردە جوداخوازەکانیان پێ سەرکوت کردبوو. فلیمەکە لە باسکردنی ئێستا و رابردوی نزیکدا باسی لە دوودڵیی حکومەتە یەکلەدوای یەکەکانی بەغدا کرد لەوەی ئۆتۆنۆمی بدەنە کوردەکان و دوودڵی کوردەکانیشی باس کرد لەوەدا کە: هیچ باوەڕێکیان بە حکومەتەکان و کردەوەکانیان هەبێت و هەروەها باسی لە بنبەستە سەربازیی و سیاسییەکەی ئێستاش کرد. باسی لە رۆڵی بارزانیی لەدوای جەنگی دووەمی جیهانییەوە کرا و چەند دیمەنێکی ڤیدیۆیی خۆی و پارتیزانەکانی نیشان دا. بێژەرەکەی BBC (ئۆلیڤیەر تۆد) پێشەکییەکی پێشکەش کرد کە رەنگە بەلای حکومەتی عێراقەوە بە لایەندار

بزانرێت، بەڵام هیچ دانیشتنێکی ستۆدیۆیی تێدا نەبوو، بۆ نمونە، لەگەڵ ئەو کوردانەی کە لە وڵاتەکەدا دەژین و جارجارە لە بەرنامەی لەمجۆرەدا ڕوونە کە دیمەنی لەوجۆرەشی تێدایە.

٢. باڵیۆزی عێراق پێشوەخت لەبارەی ئەم بەرنامەیەوە تەلەفونی بۆ سێر د. ئالێن کردووە و نیگەرانیی خۆشی دەربڕیوە کە ڕەنگە ئەم بەرنامەیە شەرمەزاربونی خۆی و زیانی بۆ ئەو هەوڵانە لێ بکەوێتەوە کە لە پێناو گەشەکردنی پەیوەندییەکانی نێوان بەریتانیا / عێراقدا دەخرێنە گەڕ. ئالێن پێی ڕاگەیاند: کە BBC تەنیا خۆی لە بەرنامەکانی بەرپرسیارە، بەڵام تێبینییەکانی باڵیۆز تۆمار دەکات و سوپاسی کرد کە ئەم بابەتەی خستە بەر سەرنجی.

ئەی. ئاڕ.

١٠/٢٣

**نهێنی**
**سایفەر / پۆلینی ئەلف & لەلایەن باگەوە**
**رۆتین وەزارەتی دەرەوە و کۆمۆنویڵز**
**برووسکەی ژمارە ٣٦٥**
**بۆ بەغدا**
**٢٣ی ئۆکتۆبەری ١٩٦٨**
**(NEQ)**
**نهێنی**

**نێردراوە بۆ بەغدا راپۆرتی ژمارە ٣٦٥ ی رۆژی ١٠/٢٣ بۆ زانیارتان دووبارە کرایەوە.**

**وێنەیەک بۆ ئەنقەرە، تاران.**
**کوردستان.**

رۆژی ٢٢ی تشرینی یەکەم BBC لە میانەی بەرنامەی "ئەوروپا"ی کەناڵی BBC2 دا فلیمێکی بەڵگەنامەیی تەلەفزیۆنی ئەڵمانیای خۆرئاوای لەبارەی کوردەوە پەخش کرد. بەشێکی زۆر فلیمەکە مێژوویی بوو و لە سەردەمی پەیماننامەی سیڤرەوە تا ئێستای دەگرتەوە و، تا رادەیەکی باش بێلایەن بوو. فلیمەکە باسی لەو رێوشوێنە توندانەش دەکرد کە تورکەکان لەنێوان دوو جەنگەکە و ئێرانییەکانیش لەدوای جەنگی دووەمی جیهانییەوە کوردە جوداخوازەکانیان پێ سەرکوت کردبوو، فلیمەکە لە باسکردنی ئێستا و رابردووی نزیکدا باسی لە دوودڵیی حکومەتە یەکەلەدوای یەکەکانی بەغدا دەکرد لەوەی ئۆتۆنۆمی بدەنە کوردەکان و دوودڵی کوردەکانیشی باس

کـرد لـەوەدا کـە هیـچ باوەڕێکیـان بـە حکومەتـەکان و کردەوەکانیـان هەبێـت و، هەروەهـا باسـی لـە بنبەسـتە سـەربازی و سیاسـییەکەی ئێسـتاش کـرد. باسـی لـە ڕۆڵـی بارزانـی لـەدوای جەنگـی دووەمـی جیهانییـەوە کـرد و چەنـد دیمەنێکـی ڤیدیۆیـی خـۆی و پارتیزانەکانـی نیشـان دا. بێژەرەکـەی BBC (ئۆلیڤیـەر تـۆد) پێشـەکییەکی پێشـکەش کـرد کـە ڕەنگـە بـەلای حکومەتـی عێراقـەوە بـە لایەنـدار بزانرێـت، بـەڵام هیـچ دانیشـتنێکی سـتۆدیۆیی تێـدا نەبـوو، بـۆ نموونـە: لەگـەڵ ئـەو کوردانـەی کـە لـە وڵاتەکـە دەژیـن و، ڕوونـە جارجـارە لـە بەرنامـەی لەمجـۆرەدا دیمەنـی لەوجـۆرەی تێدایـە.

٢. باڵیـۆزی عێـراق پێشـوەخت لەبـارەی ئـەم بەرنامەیـەوە تەلەفونـی بـۆ سـێر د. ئالێـن کـردووە و، نیگەرانیـی خۆشـی دەربڕیـوە کـە ڕەنگـە ئـەم بەرنامەیـە شـەرمەزاربونی خـۆی و، زیانـی بـۆ ئـەو هەوڵانـە لـێ بکەوێتـەوە کـە لـە پێنـاو گەشـەکردنی پەیوەندییەکانـی نێـوان بەریتانیـا / عێراقـدا دەخرێنـە گـەڕ. ئالێـن پێـی ڕاگەیانـد: کـە BBC تەنیـا خـۆی لـە بەرنامەکانـی بەرپرسـیارە، بـەڵام تێبینییەکانـی باڵیـۆز تۆمـار دەکات و سوپاسـی کـرد کـە ئـەم بابەتـەی خسـتە بـەر سـەرنجی.

ستیوارت
دابەشکردنی بەشەکان
بەشی خۆرهەڵاتی نزیک
بەشی عەرەبی
بەشی ئەوروپای باشور
بەشی سیاسەتی ڕاگەیاندن

**راپۆرت لەسەر پرسی کورد:**
**بۆ بەردەم نەتەوە یەکگرتووەکان - تشرینی دووەمی ١٩٦٨**

نەتەوەی کورد هێشتا لەژێر سێبەری مەترسییەکی گەورەی لەناوچوونی جەستەیی تەواودایە. تا ئێستاش مەترسی گەورە لەسەر ئەم نەتەوەیە ماوە و، لەپشت ئەم ئارامییە رێژەییشەوە، کە تەنیا شتێکی خەیاڵییە، ئەوا بڕێکی زەبەلاحی گرژیی شاردراوەتەوە کە ئەگەر هۆشدارییەکی پێشوەخت نەکرێت لەوانەیە توندترین تەقینەوەی لێ بکەوێتەوە و ئەو جینۆسایدە بەدوای خۆیدا بهێنێتەوە کە حکومەتە یەکلەدوای یەکەکانی عێراق لە ساڵی ١٩٦١ەوە لە دژی کوردەکان جێبەجێی دەکەن.

مێـژوی کـوردەکان دەگەڕێتــەوە بـۆ ســەردەمانێکی کـۆن. ئێســتا دەزانرێـت کــە لــە مــاوەی نێــوان ٦٠٠٠ تــا ٩٠٠٠ی پێـش زاییـن، کـوردەکان لــە ئابوریــی بەکارهێنانــەوە گۆڕانکارییــان ئەنجامــدا و خۆیــان لــە چوارچێــوەی ئابوریــی بەرهەمهێنانــدا رێکخســتەوە.

نەتەوەی کورد، کە لە رووی نەتەوەییەوە دەچنەوە سەر نەتەوە هیندۆ ئەوروپاییەکان و لەڕوی زمانەوانییشەوە سەر بە کۆمەڵەی زمانە ئێرانییەکانن، مێژویەکی پرشنگداریان هەیە کە لەسەر بنەما بەهادارەکانی نەریتی مرۆڤەکان بنیاد نراوە. لە ماوەی لانی کەم بیست و پێنج سەدەی رابردوودا ئەم نەتەوەیە لەژێر فەرمانڕەوایی ٢٥ پادشادا بووە کە هەموویان سەر بە یەک بنەماڵە بون.

ئێسـتا عێـراق ٢ ملیـۆن کـوردی تێدایـە (تێکـڕای دانیشـتوانی عێـراق ٧ ملیـۆن کەسـە) و لـە ناوچەیەکـدا دەژیـن کـە روبەرەکـەی ٨٠ هـەزار کیلۆمەتـر دوجایـە (تێکـڕای روبـەری عێـراق ٤٤٤٤٢ کیلۆمەتـر دوجایـە).

مێژووی کورد چیرۆکی ژیانی قارەمانێتییە و، مێژووە هاوچەرخەکەشی شایەتی ئەو خەباتە هەمیشەییەیە کە لەپێناو چارەی خۆنووسیندا ئەنجامیان داوە. لێرەدا مەبەستەکە بریتی نییە لە باسکردنی پەرەسەندنی مێژووی کورد بەڵکو دەمانەوێت بە کورتی باس لەو جەنگی جینۆسایدە بکەین کە حکومەتی عێراق لە ساڵی ١٩٦١ەوە، سەرەڕای گۆڕانی رژێمەکان، لە دژی کورد ئەنجامیان دەدات.

لە ساڵی ١٩٦١دا و، لەماوەی دو ساڵەکەی دوای ئەوەش دا، هێزە چەکدارەکانی عێراق کە باشترین چەکە هاوچەرخەکانیان پێیە -هەر لە فرۆکەوە تاوەکو تۆپ- شەڕێکیان دەست پێ کرد کە ئامانج لێی قڕکردنی گەلی کورد بوو. بۆیە هیچ سەیر نییە کە هەموو گەلی کورد لەژێر ئالای ئەو شۆڕشەدا کۆبوونەوە کە جەنەراڵ مستەفا بارزانی هەڵگری بوو. بەهۆی پێگەی قارەمانانەیان لەو جەنگانەی بەسەریاندا سەپێنرا بوو، کوردەکان ئەو ئەنجومەنی نیشتمانییەی شۆڕشی عێراقیان ناچار کرد کە لە ئازاری ١٩٦٣دا ددان بە "مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد"دا بنێت.

کوردەکان بڕوایان بە بەڵێنەکان هەبو و دەستیان بەوە کرد لەپێناو بەدیهێنانی بەڵێنەکاندا پەیوەندی دروست بکەن. بەڵام دەرکەوت ئامانج لە هەموو ئەو پەیوەندیی و قسانە خەڵەتاندنی کوردەکان بووە. لە مانگی شوباتی ١٩٦٥ دا وەزیری ناوخۆی عێراق کە بەڕێز سوبحی عابد ئەلحامد بوو رایگەیاند: "عێراق نیازی نیە ئۆتۆنۆمی بدات بە کورد، نە ئێستا و نە لە داهاتووش دا" و، شەڕێکی نوێ هەڵگیرسا کە تیایدا کوردەکان لە خاکەکەیاندا قارەمانانە لەڕووی هێرشە وەحشییەکاندا وەستانەوە کە سوپای عێراق بەوپەڕی بەربڵاوییەوە دەستی دابویە. کوردەکان سەرەڕای ئەو قوربانییە زۆرەی بەریان کەوت ئامادە نەبوون خۆیان بەدەستەوە بدەن

و، سەرکردایەتی عێراقیان ناچار کرد کە ددان بە شکستە سەربازییەکەیدا و شکستهێنانی لە بێدەنگکردنی دەنگی کورددا بنێت.

لە رۆژی ٢٩ی حوزەیرانی ١٩٦٦دا، سەرۆک وەزیری پێشوو کە عەبدولرەحمان بەزاز بوو رێکەوتنێکی لەگەڵ سەرکردەکانی شۆرشی کورددا واژوو کرد کە لە بنەرەتدا بریتی بوو: لە دداننان بە مافی ئۆتۆنۆمی کورددا و، هەروەها بەڵێنی دا کە رێز و شەرەفی هەبێت بەرامبەری. کودەتایەک "بەزازی" لەناو برد و حکومەتەکانی دوای ئەو، ئەم پابەندییەیان بە نەتەوەی کوردەوە قبوڵ نەکرد.

دوو ساڵ تێپەریوە و لەو کاتەوە لە عێراق حکومەت و رژێمەکان گۆراون. سەرکردەکانی عێراق هەوڵ دەدەن ناسنامەی نەتەوەی کورد بسرنەوە و بەردەوام ئەو مافەیان رەت دەکەنەوە کە ژیانێکی ئۆتۆنۆمیان هەبێت. کوردەکان داوای جیابونەوە لە عێراق ناکەن. تەنیا داوای ئەوە دەکەن کە بتوانن وەکوو کەمینەیەکی نەتەوەیی بژین (نزیکەی ٣٠٪ی دانیشتوانی عێراق پێک دەهێنن)، هەروەها بتوانن بە زمانەکەی خۆیان قسە بکەن، قوتابخانەی خۆیان بکەنەوە و، کاروباری خۆیان بەرێوە ببەن. بەڵام ئەم مافە بنەرەتییانەیان بەلای حکومەتی دەسەڵاتداری بەغداوە زیادەرەوی تێدا کراوە.

لەم شەرەدا، کە لە ساڵی ١٩٦١ەوە چەند جارێک سەری هەڵداوەتەوە، نەتەوەی کورد زیاتر لە ٦٠ هەزار قوربانی داوە و زیاتر لە ٣ هەزار گوندی خاپور کراوە. ئەم ژمارانە خەیاڵی نین. ئەو هەواڵنێر و چاودێرە بیانییانەی کە لەم ساڵانەی دواییدا سەردانی کوردستانیان کردووە شایەتی ئەم راستییەن.

لە رۆژی ٢ی تەموزی ١٩٦٣دا کۆماری خەڵکی مەنگۆلیا بریاری دا ئەو تاوانی جینۆسایدەی کە حکومەتی عێراق لەدژی نەتەوەی کورد ئەنجامی دەدات بخاتە

بەردەم کۆبونەوەی داهاتوو (دانیشتنی ژمارە ١٨)ی کۆمەڵەی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان. هەروەها، لە رۆژی ٩ی تەموزی هەمان ساڵ، سەرۆکی وەفدی سۆڤیەت لە دانیشتنی ژمارە ٣٦ی ئەنجومەنی ئابوریی و کۆمەڵایەتیی نەتەوە یەکگرتووەکاندا کە لە جنێف دەبەستریٚ، لە نامەیەکی فەرمیدا داوای کرد کە "ئەو سیاسەتیی جینۆسایدەی کە حکومەتی کۆماری عێراق دژی نەتەوەی کورد پیادەی دەکات" بخرێتە ناو بەرنامەی کاری دانیشتنەکەوە. هەروەها جێگەی بەبیر هێنانەوەیە کە مستەر رۆبەرت ماکنامارای وەزیری بەرگری ئەمریکا لە وتەیەکیدا لەبارەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستەوە ئاماژەی بەوە داوە کە: یەکێک لەو سێ پرسەی کە حکومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان نیگەران دەکات بریتییە لەو رەفتارە خراپەی لەگەڵ نەتەوەی کورددا دەکرێت.

تەنانەت لە سەردەمی هاوچەرخیشدا مافی بوونی کورد وەکوو نەتەوە لەلایەن زامنە یاسایی و نێودەوڵەتییەکانەوە ددانی پێدا نراوە. پەیماننامەی سیڤەری ساڵی ١٩٢٠ لە برگەیەکدا بە ناونیشانی "کوردستان" و لە ماددەکانی ٦٢ و ٦٣ و ٦٤ دا باسی لە هەنگاوە پێویستەکانی دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی کردووە. ماددەی ٦٤ دەڵێت: وڵاتانی هاوپەیمان هیچ نارەزاییەکیان نابێت بەرامبەر بەئەندامبوونی خۆبەخشانەی ئەم دەوڵەتە کوردییە سەربەخۆیە، کە دەوڵەتی کوردانی باشورە (لە عێراق). لەم بەشەی کوردستانیش دا دژایەتی حەزی کوردەکان کراوە و لە رێگەی رێوشوێنی سیاسییەوە لە چوارچێوەی عێراقدا هێڵراونەتەوە.

لە راگەیەنراوێکی هاوبەشی حکومەتی بەریتانیا و رژێمی بەغدا کە لە ٢٤ی کانونی یەکەمی ١٩٢٢دا بە فەرمی ئاراستەی کۆمەڵەی گەلان کراوە، ئەم مەرجانەی لای خوارەوە بۆ پێدانی ئۆتۆنۆمی بە کوردانی باشور لە عێراقدا باسیان لێوە کراوە:

"حکومەتــی شــکۆداری بەریتانیــا و حکومەتــی عێــراق ددان بــە مافــی ئــەو کوردانــەدا دەنێــن کــە لــە ســنوری عێراقــدا دەژیــن کــە لــە چوارچێــوەی سنورەکەیاندا حکومەتێکـی کـوردی درووسـت بکـەن. هیوایـان وایـە کـە گروپـە جیـاوازە کوردییـەکان بـە زوتریـن کات لەنـاو خۆیانـدا لەسـەر شـێوازی ئـەو حوکمەتــەی پەســەندی دەکــەن و لەســەر ســنوری قەڵەمڕەوەکەیــان بگەنــە ڕێککەوتـن. ئـەوان وەفدگەلـی بەرپرسـیاریان بـۆ دەنێـرن کـە لەبـارەی پەیوەندییە ئابـوری و سیاسـییەکانیان لەگـەڵ حکومەتـی شـکۆمەندی بەریتانیـا و حکومەتـی عێراقـدا وتوویـێـژ بکـەن".

حکومەتـی عێـراق لـەلای خۆیـەوە هەمـوو هەنگاوەکانـی جێبەجێکردنـی ئـەم ڕاگەیەنـراوەی ڕاگرتـووە و هەرگیـز هیـچ هەنگاوێکـی لـەم ڕووەوە نەنـاوە. چەند ڕاپەڕینێکـی کوردیـش لەپێنـاو دروسـتکردنی ناوچەیەکـی ئۆتۆنۆمـی کـوردان لـە چوارچێـوەی عێراقـدا ئەنجـام دراون، بـەڵام هەموویـان بـە زەبـری هێـز و دوای خوێنڕشـتنێکی زۆر لەلایـەن حکومەتـی بەغـداوە سـەرکوت کـراون.

سـاڵانێکی زۆر سـەرکردەکانی نەتـەوەی کـورد هەوڵیانـداوە سـەرنجی دامـەزراوە نێودەوڵەتییـەکان ڕابکێشـن کـە بەهانایانـەوە بچـن و هۆشـیاری نێودەوڵەتیـی دروسـت بکـەن تاوەکـو فشـار بخەنـە سـەر حکومەتـی عێـراق کـە پێـش ئـەوەی درەنـگ ببێـت و شـەڕێکی نـوێ بەرامبەریـان هەڵگیرسـێت، مافـە سـەرتاییەکانی مـرۆڤ بـە نەتـەوەی کـورد ڕەوا ببینێـت.

ئەمیر کامەران ئەی. بەدرخان

نوێنەری ئەنجومەنی فەرماندەیی شۆڕشی کورد لە کوردستانی عێراق

**هۆتێل سەینت مۆرتیز**
**٥٠ سێنترالْ پارک ساوز**
**نیویۆرک، ئێن. وای.**
**١٨ی تشرینی دووەمی ١٩٦٨**

**بەڕێز یو پانت**
**سکرتێری گشتی**
**نەتەوە یەکگرتووەکان**
**نیویۆرک، ئێن. وای.**

بەڕێز:

لەو راپۆرتەدا کە شەرەفی ئەوەم هەبوو لە رۆژی ١٥ی تشرینی دووەمی ١٩٦٨دا بیخەمە ڕوو، سەرنجی بەڕێزتانم سەبارەت بەو دۆخە مەترسیدارە راکێشا کە لەنێوان کورد و حکومەتی بەغدا لەئارادایە و هۆکارەکەشی ئەوەیە: کە حکومەت ڕێز لە پابەندییەکانی ناگرێت.

وەک بەڕێزتان دەزانن، زیاتر لە نیوەی خاکی کورد (ناوچەیەک بە نزیکەی روبەرەکەی ٨٠ هەزار کیلۆمەترە) لەژێر کۆنترۆڵی تەواوی کوردەکاندایە و لە ساڵی ١٩٦١ەوە ئیدارەیەکی ئۆتۆنۆمی دیفاکتۆیان تێدا دامەزراندووە. بۆیە ئەم ناوچەیە لەژێر سەروەریی کوردەکاندایە و هیچ کەسێک تەنانەت وەزیرەکانی عێراقیش ناتوانن بەبێ ڕێگەپێدانی دەسەڵاتدارانی کورد سەردانی بکەن. ئەم بارودۆخە تا ئێستا حەوت ساڵی خایاندووە.

لەبەر رۆشنایی ئەم راستییانەدا، هەر حکومەتێکی عێراقی کە بڵێت پرسی

کـورد بابەتێکـی ناوخۆییـە، ئـەوا مەبەسـتی چەواشـەکردنە. ئـەم راسـتییانە دەیسـەلمێنن کـە حکومەتـی عێـراق نەیتووانیـوە ئیـرادەی گەلـی کـورد تێـک بشـکێنێت بـۆ بەدەسـتهێنانی مافـە شـەرعییەکانیان لـە ئۆتۆنۆمییەکـی رەهـادا. هەمـو ئـەو کارەی حکومەتـەکان کردویانـە ئـەوە بـووە کـە بـە لێدانـە ئاسـمانییە بێهەڵاوێرکردنەکانیـان، نارەحەتیـی و وێرانکاریـی بـۆ خەڵکانـی سـیڤیل بـەدی بهێنـن.

ئێمـەی کـورد نەتەوەیەکیـن کـە حەزمـان بـە ئاشـتییە و تـۆی بەرێزیـش پیاوێکیـت لـە بەرزتریـن ئاسـتی دەسـەڵات و بەرپرسـیارێتیدایت بەرامبـەر بـە پاراسـتنی دادپەرورەیـی و ئاشـتیی لـە سەرانسـەری جیهـان. بۆیـە، بەنـاوی ئەنجومەنـی سـەرکردایەتیی شۆرشـی کـورد و سـەرکردەکەی کە بەرێـز جەنەراڵ مسـتەفا بارزانییـە، داوا لـە بەرێزتـان دەکـەم کـە لـە نەتـەوە یەکگرتووەکانـەوە ناوبژیوانێـک دەستنیشـان بکەیـت وەک چـۆن بەشـێوەیەکی حەکیمانـە سـەبارەت بـە بابەتگەلـی هاوشـێوە ئەنجامتـان داوە، بـۆ ئـەوەی بێـت و پرسـی کـورد بـە شـێوەیەکی دادپەروەرانـە و ئاشـتییانە چارەسـەر بـکات.

تکایە ئەوپەڕی رێزم قبوڵ بفەرمون.

لەگەڵ رێزدا،

ئەمیر د. کامەران ئەی. بەدرخان

**ئەلف. جیهانی عەرەب و ئیسرائیل**

**پەخشەکانی (دەنگی کوردستانی عێراق)**

**(دەنگی کوردستانی عێراق) بە زمانی عەرەبی، ١٥:٤٠ گرینیچ لە رۆژی ١٦ی کانونی یەکەمی ١٩٦٨**

**(ا) کورتەی راپۆرتەکان لەبارەی پێکدادانەکەی رۆژی ١١ی کانونی یەکەمەوە:**

ئەو کاتەی یەکێک لە یەکەکانمان لە رۆژی ١١ی کانونی یەکەمدا ناوچەی (جەباری) دەپشکنی، کاروانێکی سەربازی لەسەر شەقامی سەرەکی رێگەیان لێ گرت و تەقەیان بۆ سەر پێشمەرگەکان (سەربازانی کورد) دەست پێ کرد. هێزەکانمان ناچار بوون بەرگری لە خۆیان بکەن و وەڵامی تەقەکردنەکەیان دایەوە. لە ڕووبەڕوو بوونەوەیەکدا کە چوار کاتژمێری خایاند، ١٠ سەربازی دوژمن کوژران و ١٥ ەشیان بریندار بوون و، ئوتومبیلێکیش سووتێنرا. یەکێک لە پیاوەکانمان، شێخ میرزا عەبدولڕەحمان وەهاب، بە سوکی بریندار بوو.

لە هەمان کاتدا، کەسێکی ڕێ لێ ونبوو بەناوی "عەلی حەسەن" گەڕایەوە بۆناو هێزەکانمان و لەگەڵ خۆیدا چەکێکی پێ بوو لەگەڵ ١٠٠ فیشەک و دوربینێک. ناوبراو پابەندی خۆی بۆ شۆڕش و سەرکردەکەی "بارزانی" دەربڕی.

**(ب) کورتەی چەند بەشێک لە هێرشەکان بۆسەر ئیبراهیم-جەلال:**

کاتێ داگیرکەرێک وڵاتێک دەگرێت یاخود خۆسەپێنێک دەسەڵات بەسەر ئیرادەی خەڵکدا دەسەپێنێت، هەوڵێکی زۆر دەدات کە پشتیوانی لەناو خەڵکەوە بەدەست بهێنێت. کاتێ پشتیوانێک پەیدا دەکات، خەسڵەتەکانی نیشتمانپەروەریی و بوێریی و رەسەنایەتیی و هیتر دەداتە پاڵی. سەرکردایەتی حزبی بەعس دوای ئەوەی دەسەڵاتی گرتە دەست، بە کارکردن لەسەر ئەم بنەمایە هەوڵی دا چەند (سەرکردە!)یەک لەناو ئەو کەسانەدا دروست بکات کە بە گەرموگوڕییەوە خۆیان بەخت کردووە و ئامادەن فەرمان لە هەر کەسێک وەربگرن کە پارەیان دەداتێ، بەبێ گوێدانە شێوازەکەی.

"سەرکردایەتی حزبی بەعس بە زوویی تاقمێک ناپاکی دۆزییەوە کە دوژمنی گەلی کورد بوون. دوو لایەنەکە دواتر لەسەر ئەم پیلانە گڵاوە رێک کەوتن: ناپاکەکان، تاقمەکەی ئیبراهیم-جەلال، دنەی بنکەکانی پێشمەرگە دەدەن بۆ ئەوەی ئاسایش تێک بچێت و بارودۆخێکی دژوار و نائارام دروست بکەن".

"پاشان، کاتێ قارەمانەکانمان، بەرگریکارە بەهێزەکانی کوردستان، لە رووی ئەو شەڕەنگێزییەدا وەستانەوە و ڕێیان لە شەڕخوازەکان گرت کە دزە بکەنە ناوچە ئازادکراوەکانەوە، دەسەڵاتی بەعس ئەم بابەتەی وەکوو پێشینەیەک بەکارهێنا تاوەکو لەڕێگەی تابووری پێنجەمەوە درۆ بڵاو بکاتەوە و، خۆی بۆ هەنگاوی دووەم ئامادە بکات کە بریتییە لە: هەڵگیرساندنەوەی شەڕ و شەڕی براکوژی لە عێراق دا".

"ئەمە ئەو سیاسەتە حەکیمانەیە کە حکومەتی بەعس دەیەوێت لە بەرامبەر پرسی کورددا بیگرێتە بەر. ئەمە نەک هەر سیاسەتێکی ڕووهەڵماڵراو و دزێوە، بەڵکوو سیاسەتێکە کە شکستە حەتمییەکەی بە لەبەرچاوگرتنی ئەزموونەکانی رابردوو، لای هەمووان ئاشکرایە".

حەز دەکەین جارێکی تر ئەو پێنج جەنەراڵە عێراقییە ئاگادار بکەینەوە کە هەر هەوڵێک لەپێناو سەرکوتکردنی شۆڕشی جەماوەری بدرێت، سیاسەتێکی تەواو گێلانەیە. تاقمەکەی ئیبراهیم-جەلال، کە شەرەفی خۆیان هەرزانفرۆش کردووە، لە (حەربا) زوتر رەنگیان گۆڕا. ئەقڵەکەی پشت ئەم تاقمە ئیبراهیم ئەحمەدە کە بەوە ناسراوە لەگەڵ بارودۆخەکاندا بەخێرایی بیروباوەڕەکەی دەگۆڕێت. "پێش ساڵی ١٩٥٠ یش، ئەم فەیلەسوفی ناپاکی‌یە شۆڕشگێڕێکی توندڕەو بوو کە بە هیچ شتێک کەمتر لە جیابوونەوە و سەربەخۆیی تەواوی کوردستان قایل نەدەبوو، کەچی دواتر بوو بە کەسێکی هەلپەرست".

(تێبینی: دەنگی کوردستانی عێراق لە وتارەکەی کاتژمێر ١٥:٤٠ی گرینیچی رۆژی ١٤ی کانونی یەکەمدا بە زمانی عەرەبی رایگەیاند: کە شۆڕشی کورد لەپێناو مافە نەتەوەییەکاندا داوای جیابونەوە لە عێراق ناکات، بەڵکو داوا دەکات کوردەکان مافیان پێ بدرێت خۆیان کاروبارە ناوخۆییەکانیان بەڕێوە بەرن. هەروەها رایگەیاند: کە گەلی کورد دەچێتە پاڵ هەر هێز یاخود حزبێکی نەتەوەیی و دیموکراتیی عێراق کە کار بۆ خۆشگوزەرانی هەموو عێراقییەکان بکات).

**بەڕێز پی. ئار. هینچکلیف،**
**بەشی خۆرهەڵاتی نزیک،**
**وەزارەتی دەرەوە و کۆمۆنوێڵز**
**مستەر بلاکبێرن و کوردەکان:**
**١٩٦٩**

وا دیـــارە مســـتەر بلاکبێـــرن خـــووی پێـــوە گرتبێـــت کـــە هەمـــو ڕۆژێـــک تەلەفونێکـم بـۆ بـکات. لـە قسـەکردنی ئـەم دواییانەمانـدا باسـی لـەم بابەتانـە کـرد:

ا) نیـازی وایـە ڕاپۆرتێکـی وردمـان بـۆ بنێرێـت سـەبارەت بـەو وتوویـژەی کـە لەگـەڵ مسـتەر ئارسـەردا هەیبـووە. ئـەو دواتـر پێـی ڕاگەیانـدم کـە ناردنـی ڕاپۆرتەکـە یـەک بـۆ دوو ڕۆژ دوا دەکەوێـت و هیـوادار بـوو کـە مـن ئـەم دواکەوتنـەم بـەلاوە ئاسـایی بێـت. دڵنیـام کـردەوە کـە بەتـەواوی لـەوە تێدەگـەم کـە زۆر ئەرکـی دیکـەی لـە ئەسـتۆیە کـە ڕایانپەڕێنێـت و خۆشـم هـەر بـەو شـێوەیەم.

ب) ئـەو پەیوەندیـی لەگـەڵ دامـەزراوەی گوڵبەنکیانـدا هەبووە و گەشـبینییەکی باشـی هەبـوو کـە دامەزراوەکـە یارمەتـی ئـەم بـدەن بـۆ ئـەوەی یارمەتـی کـوردی پـێ بـدات.

ج) پەیامێکـی لـە مـەلا مسـتەفاوە پـێ گەیشـتووە بـاس لـەوە دەکات کـە تـێ دەگـات لـەوەی پێویسـتیی بـە کاتـی زیاتـرە. مـەلا مسـتەفا ئەوەشـی گوتـووە کـە (مسـتەر ئارسـەر) ئەگـەر بیەوێـت جارێکـی تـر بچێتـە دەرەوە ڕێگـەی پێـدراوە، بـەڵام پێویسـتە پێشـوەخت ئاگـاداری بکاتـەوە بەتایبـەت ئەگـەر کەسـێکی دیکـەی لەگەڵـدا بێـت. مسـتەر بلاکبێـرن پێـی وابـوو: کـە ڕێوشـوێنی سـەردانەکانی لەگەڵ

ئێرانییەکانـدا ریکخرابێـت.

د) مسـتـەر بلاکبێـرن گەیشـتبووە ئـەو دەرەنجامـەی کـە بـە هیـچ جۆرێـک نابێـت توندوتیژیـی بـەکار بهێنرێـت. شـتێکی ناقۆڵایـە ئەگـەر دامـەزراوە نەوتییـەکان بتەقێنرێنـەوە. مـن لـەم بۆچونەیـدا پشـتیوانییم کـرد.

ه) لەسـەر هاندانـی مـن، مسـتەر بلاکبێـرن جەختـی لـەوە کـردەوە کـە ئەگـەر جارێکـی تـر سـەردانی مـەلا مسـتەفای کـردەوە یاخـود ئەگـەر هـەر پەیامێکـی تـری بـۆ نـارد، ئـەوا بەتـەواوی لـە چوارچێوەیەکـی نهێنیـدا ئەنجامـی دەدات. ئـەو بـە هیـچ شـێوەیەک خـۆی وەک گوێـزەرەوەی پەیامـەکان بـۆ حکومەتـی خاوەنشـکۆ "شـاژن" نیشـان نـەداوە.

ئەی. ئەی. ئەکلاند.

**نهێنی**
**سایفەر/ جۆری A**
**بەغدا بۆ وەزارەتی بەرگری**
**FOH 978530Z**
**بەمجۆرە: ئازاری ١٩٦٩**

**نهێنی**

ئاراستە کراوە بۆ وەزارەتی بەرگری FOH 978530Z بەمجۆرە ئازاری ١٩٦٩ بۆ پێدانی زانیاریی بە وەزارەتی دەرەوە و کۆمۆنوێڵز.

لە پاشکۆی سەر بەوەزارەتی بەرگرییەوە لە بەغداد بۆ DI4

هێرش بۆسەر دامەزراوەکانی IPC لە کەرکوک. راپۆرتی بەغدا ژمارە ٢٦٢ی رۆژی ٣ی ئازار باس لەوە دەکات کە شەوی ١ لەسەر ٢ی ئازار بە هاوەن هێرش کراوەتە سەر دامەزراوەکانی IPC و زیانی پێگەیەنراوە. لەمبارەیەوە BBC لەدوای ٤٨ کاتژمێر لە رووداوەکەوە، راپۆرتێکی بڵاوکردەوە کە لە لقی IPC ی لە بەیروتەوە سەرچاوەی گرتبوو.

٢. لەمیانەی قسەکردنمدا لەگەڵ فەرماندەی هێزی ئاسمانی عێراق لە رۆژی ٦ی ئازاردا ئەوەم پێ راگەیەنرا کە هێرشکەران دەرسێکیان دادراوە کە هەرگیز بیریان نەچێتەوە. گریمانەی ئێمە وایە کە هێرشکەرەکان کورد بن، بەڵام فەرماندەکە باسی نەکردووە.

٣. فەرماندەکە گوتی لەلایەن فرۆکە هێرشبەرەکانەوە لەکاتی شەودا

هێرشــی تونــد ئەنجــام دراوە.

٤. لەبەرئــەوەی ئــەو هێرشــەی کــە هاوەنــی تێدابــەکار هاتــووە ئــەوا تەنیــا یــەک کاتژمێــری خایانــدووە و لــە ســێیەم شــەوی پێنــج ڕۆژ پشــووی یــەک لــەدوای یەکــدا ئەنجــام دراوە، بۆیــە پێناچێــت کــە فڕۆکــەکان توانیبێتیــان لــەو تاریکــە شــەوەدا شــوێنی هێرشــکەرەکانیان دەستنیشــان کردبێــت و لێیــان دابــن.

٥. ئەگــەری ئــەوە زیاتــرە کــە هێرشــە ئاســمانییەکان ئاراســتەی ئــەو بنکانــە کرابــن کــە پێیــان وابــووە هێرشــبەرەکان لەوێــوە هاتبــن. ئەگــەری زۆرە هێرشــی ئاســمانی ببێتــە هــۆی دەســتپێکردنەوەی دوژمنایەتــی ئاشــکرا لــە باکــور.

٦. فەرمانــدەی هێــزە ئاســمانییەکان بەروونــی لــە ڕاپۆرتەکــەی BBC نــاڕازی بــوو و بــە نیشــانەیەکی دیکــەی لەقەڵەمــدەدا کــە گوایــە ئێمــە دەمانەوێــت وێنەیەکــی ڕەش لەبــارەی پێشــهاتەکانی عێراقــەوە نیشــان بدەیــن. هــەر ڕاپۆرتێکــی ڕۆژنامەیــی یاخــود ڕادیۆیــی لەبــارەی هێرشــە ئاســمانییەکانەوە لەلایــەن ســەرچاوە بەریتانییەکانــەوە بڵاوبکرێتــەوە، ڕەنگــە کاریگەریــی خــراپ لەســەر پەیوەندیەکانــی بەریتانیــا - عێــراق دابنێــت و هەروەهــا وا دەکات حوکمــی پێشــوەخت بخاتــە بــەردەم پەیوەندییەکانــی پاشــکۆی ســەر بــە وەزارەتــی بەرگــری لەگــەڵ فەرماندەکــەدا. بۆیــە دڵنیــام لــەوەی کــە ئــەم زانیارییــە ناچێتــە دەرەوەی بازنــە فەرمییەکانــەوە.

٧. بەڕێز باڵیۆز لەسەر ئەم بابەتە ڕەزامەندە.

نێــردرا بــۆ: DC.C. ، مســتەر ئیڤانــس، دۆســیەکان بــۆ: بەشــی خۆرهەڵاتــی ناوەڕاســت، بەشــی باکــوری ئەفریقــا، بەشــی عەرەبــی، بەشــی نــەوت، بەشــی سیاســەتی بەرگــری، DT و ST، بەشــی سیاســەتی ڕاگەیانــدن، بەشــی لێکۆڵینەوەی ڕاگەیانــدن، بەشــی هــەواڵ، بەشــی نەتــەوە یەکگرتــووەکان، مســتەر هێیمــان، مســتەر ئارســەر، سێر ئــی. پێک، مســتەر بیــرۆوس و، ســکرتێری تایبــەت P.U.S..

**باڵیۆزخانەی بریتانیا**

**بەغدا**

**٢٠ی ئازاری ١٩٦٩**

**٢/١٢**

**نهێنی**

**نەوتی عێراق**

تکایە بگەڕێنەوە بۆ نامەکەی دۆناڵد هاولێی ژمارە (٢/١٢)ی ڕۆژی ١٥ی ئازار

٢. من لە ١٦ی ئازارەوە و لەوکاتەوەی لە گەشتەکەم لە بەسرە و باشور گەڕاومەتەوە دوو جار هان (Hahn)م بینیوە.

٣. وەک دەزانیت، بەم دواییە پەیوەندییەکانی نێوان کۆمپانیای نەوتی بەسرە و حکومەتی عێراق ئاماژەی دڵخۆشکەری بەرەوپێشچونی بەخۆوە بینیووە، بەشێکی ئەمەش بەهۆی هەوڵەکانی ویلەرەوە بووە کە بەڕێوەبەری گشتی کۆمپانیاکەیە و توانیوویەتی متمانەی دەسەڵاتە ناوچەییەکان بەدەست بهێنێت. موتەسەڕیف واتە پارێزگای ناوچەکە و هەروەها بەڕێوەبەری گشتیی بەندەرەکانیش لەم پرۆسەی بەرەوپێشچونەدا بەشدار بوون. ئەم دووانە هەردووکیان ئەندامی باڵا و بەدەسەڵاتی حزبی بەعسن. ئەوەی یەکەمیان کە برای وەزیری کار و کاروباری کۆمەڵایەتییە، وەکوو جێگری بەعس لە باشور پێشوازیی لێ کردم. بەڕێوەبەری گشتی بەندەرەکان کە دامەزراوەیەکی ئۆتۆنۆم بەڕێوە دەبات، ئەویش بە دڵنیاییەوە کەسێکی بەدەسەڵاتی ناوچەکەیە. هەردووکیان بایەخێکی جددییان سەبارەت بە کاروباری نەوت نیشان داوە و بۆچونەکانیان لەلای بەغدا ئاشکرا کردووە. موتەسەڕیف خۆی

پێی گوتم کە دەستی لە کەیسەکەی (بەیڵ) وەرداوە (رێکەوت ئەوەیە کە بەیڵەکان خۆیان مۆڵەتی دەرچونیان بەدەست هێناوە و رۆیشتوون، یارمەتییەکەی باڵیۆزی بەلجیکا رۆڵێکی گەورەی لەمەدا گێڕاوە و ئەمانەیش (بەیڵەکان) لەلای ئەو دەمانەوە، هەروەها بەڕێوەبەرە گشتییەکانی کەرکوک و سامەڕا ئازادکراون و گەڕاونەتەوە بۆ کێڵگەکانیان لە باکور، کە لەوێ ناوبراو پێشوازییەکی گەرمی لێ کراوە، نەک تەنیا لەلایەن ستافی کۆمپانیاکەوە، بەڵکوو لەلایەن دەسەڵاتدارە سەربازیی و سیڤیلەکانی عێراقیشەوە و، هەروەها لە مەسەلەی کرینە زۆرەملێیەکەی نوسینگەی سەرەکی کۆمپانیاکە لە بەغداش دەستی وەرداوە. ئەو بەعسییەکی توندە - بۆچونەکانی کە لەبارەی پرسی فەلەستینەوە هەیبوون هەر ئەوانەبوو کە چاوەڕوانمان دەکرد - بەڵام وەکو کەسێکی تارادەیەک زۆر پراگماتیی هاتە بەرچاوم. هەروەها، بەڕێوەبەرە گشتییەکەش بە دورودرێژی باسی کێشەی نەوتی بۆ کردم - ئەمەش لەوکاتەدا بوو کە بە سواری هەمان شەمەندەفەر بەسرەمان بەجێ دەهێشت.

٤. هەرچۆنێک بێت، لێرە لە بەغدا بەڕێوەبەرە گشتییەکە وتووێژێکی دورودرێژی لەگەڵ (هان) هەبووە - لەڕاستیدا دوای خواردنەوەی ویسکییەکی زۆر، ئەوا سەردانی کۆمپانیای نەوتی عێراقی کردووە. داوای لە (هان) کردووە کە پێشنیاری بخاتە بەردەم سەبارەت بە هەموو ئەو پرسیارانەی کە چاوەڕێی وەڵامن، بۆ نمونە: رومەیلەی باکور، دوبارە رومەیلەی باکور پێی گوتووە: کە کاردەکات بۆ ئەوەی کارگێڕانی حزبی بەعس پشتگیریی بکەن. ئەو ئاماژەی بە نامەیەکی دا کە لە کۆتایی ساڵی ١٩٦٧دا بۆ حکومەتی پێشوو نوسرابوو و پێشنیاری ئەوەی کرد کە دەبێت ئێستا پێشنیارەکان روون بکەنەوە. بە توندی پێی لەوەش دادەگرت کە کرێی بارکردن زیاد بکرێت (کە دەدرێت بە دەسەڵاتدارانی بەندەرەکە) چونکە بەم کارە دەستەکەی بەهێز دەبێت. ئەو کەم تا زۆر ددانی بەوەدا نا کە وەزیری نەوت رێکەوتنی ناوێت، یاخود لانی کەم پێی وا نییە کە رێکەوتن کارێکی

کردەیـی بێـت. رفاعـی (Rifai) پابەنـدی خـۆی بـە بەرهەمهێنانـی ٨ ملیـۆن تـەن نەوتـی خـاو یـان بڕێکـی نزیـک لـەوەوە لـە سـاڵی داهاتـودا لـە باکـوری رۆمێلـە نیشـانداوە و پێـی وابـووە کـە: (کەوتووەتـە نـاو داوەوە).

٥. لایەنـە پێچەوانەکـەی ئـەم دیـوە پرشـنگدارە ئەوەیـە: کـە (هـان) نامەیەکـی تونـدی لــە (عەمــاش)ی وەزیــری ناوخــۆی عێراقــەوە بەدەســت گەیشــتووە ســەبارەت بــە بارەگــای ســەرەکی کۆمپانیــای نەوتــی عێراقــەوە. دیــارە هۆکارەکەشــی ئــەو نامــە فەرمییــەی (هــان)ە (کــە تیایــدا بەرگــری لــە مافــە یاسـاییەکانی کۆمپانیاکـە دەکات)، لـە بەرامبـەر ئـەو نامەیـەدا کـە وەزیـری نـەوت نەیتوانیبـوو بەوشـێوەیەی (هـان) داوای لـێ کردبـوو، کـە شـێوازێکی فەرمـی بوو، روونکردنـەوەی لەسـەر بـدات. (هـان) دەسـتبەجێ داوای بینینـی عەماشـی کـرد و بەڕێوەبـەری گشـتی بەنـدەرەکان توانـی بـۆی ڕێکبخـات. لـە ڕاسـتییدا (هـان) دوێنـێ چـاوی بەعەمـاش کـەوت و کۆبونەوەیەکـی نائاسـایییان ئەنجـام دا کـە دوو کاتژمێـری خایانـد. عەمـاش تـا رادەیەکـی زۆر داوای لێبوردنـی کردبـوو بەرامبـەر بـەو رەخنانـەی لـە (هـان)ی گرتبـوون و بەرامبـەر بـەو گومانانـەی کـە لـە نامەکـەدا بەرامبـەر بـە وەفادارییـی (هـان) خسـتبونیەڕوو. عەمـاش گوتبووی: لـە هەمـوو لایەکـەوە شـتی باشـی لەبـارەی (هـان)ەوە بیسـتووە بـەڵام بەداخـەوە (گروپـەکان) شـتێکی جیـاوازن. هەندێـک لـە ئەندامانـی کۆمپانیاکـە پەیوەندییـان لەگـەڵ کوردەکانـدا هەیـە، ئـەوان و / یاخـود ئێرانیـەکان هانـی کوردەکانیـان داوە پەلامـاری کارگـەی چارەسـەرکردنەکەی کەرکـوک بـدەن، کۆمپانیاکـە لـە داهاتەکـەی لـە ٥٪ی راسـتەقینەش بـە عێـراق نـادات و، تەنانـەت پێوانەکردنـی ئــەو نەوتــە رەشــەی کــە باردەکرێـت بــە وردی دیــاری ناکرێـت. ئەگــەر بــەم هۆیــەوە بەرهەمهێنــان کــەم ببێتــەوە، بــۆ نموونــە: بەهــۆی هێرشــی زیاتــرەوە بۆســەر کەرکـوک، ئـەوا (عەمـاش) کۆمپانیـای نەوتـی عێـراق بـە خۆماڵـی دەکات. ئـەو گوتوویەتـی: کـە (پیاوێکـی تونـدە)، بـەڵام پیاوێکـە هەسـت و سـۆزی هەیـە

و شاعیرە! (هان) چەندی بۆ کرابوو خۆی لەم بۆکسانە لادابوو، بەڵام بەلایەوە نارەحەت بوو. سەبارەت بە بارەگاکانی کۆمپانیای نەوتی عێراق، (عەماش) گوتبووی: (هان) هەر شوێنێک لە بەغدا پەسەند دەکات دەیدرێتێ و بە ناراستەوخۆش گوتبووی: کە تا ئەوکاتەی بیناکەی تەواو دەبێت (عەماش) دەست بەسەر بارەگاکانی (هان)دا ناگرێت، بەڵام ئەوەشی گوتبوو کە رەنگە لە ماوەیەکی کوردتدا ناچاربێت ئەم کارە بکات.

٦. ئەم هەموو بابەتە سەریان لە (هان) شێواندبوو، ئەمەش شتێکی سروشتییە گومانەکانی لە وەزیری نەوت زیاد دەکات، بەڵام وا هەست دەکات کە ئەو کرانەوەیەی کە خەڵکی بەسرە لە بەرامبەریدا هەیانە دەبێت بەدواداچوونی بۆ بکرێت. (هان) ئەمرۆ دەگەڕێتەوە بەرەو لەندەن و هیواخوازە بتوانێت کۆمپانیاکە قایل بکات شتێک بکەن.

٧. لەراستیدا، چەند ئاماژەیەک هەیە کە بەندۆڵەکە بە ئاراستەکەی دیکەدا بجوڵێت، ئەوەش بریتییە: لەو کاردانەوانەی کە لەبەرامبەر ئەندامە پەرگیرەکانی حزبەکەدا لەئارادایە. رووداوەکانی سووریا رەنگە دەستەکەی میانڕەوەکان و بەتایبەتیش (تکریتی) بەهێز بکەن.

٨. نوسخەیەک لەم نامەیە دەنێرم بۆ پیتەر تریپ، بەڵام نوسخەی دیکەی لێ بڵاو ناکەمەوە.

تی. ئی. ئیڤانس.

بەڕێز ئار. ئێچ. ئێلینگۆرپ

بەشی پێویستییەکان و نەوت

وەزارەتی دەرەوە و کۆمۆنوێڵز

لەندەن، S.W.1

**نهێنی**
**باڵیۆزخانەی بریتانیا**
**بەغدا**
**٤ی نیسانی ١٩٦٩**
**(٨/١)**
**بەڕێز هینچکلیف،**

## هێرشی عێراق بۆ سەر کوردەکان:

سوپاس بۆ نامەکەت ژمارە 2/NEQ 1ی رۆژی ١٢ی ئازار کە تیایدا داوای هەڵسەنگانی ئێمەت کردبوو لەبارەی بارودۆخی عێراق و کوردەوە.

٢. لێرە لە هیچ سەرچاوەیەکەوە بەڵگەی ئەوەمان بەدەستەوە نیە کە بە هیچ جۆرێک جارێکی تر "شەڕی ناوخۆیی سەرتاسەری" لە باکور رویدا بێت وەک ئەوەی دەیلی تێلێگراف ئاماژەی پێ داوە. راپۆرتی بەردەوام هەن لەبارەی روداوگەلی جیاجیاوە، هەندێک لەم روداوانە کاریگەرییان هەیە بۆ سەر کۆمپانیای نەوتی عێراق و هێرشی سەر دامەزراوەکانی کۆمپانیای نەوتی عێراق لە کەرکوک (بڕوانە راپۆرتمان ژمارە ٢٦٢) کە جددیترینی ئەم هەڕەشانە بوو. ئێمە دەزانین کە لەدوای ئەم هێرشەوە، هێزی ئاسمانیی عێراق بە موشەک و ناپاڵم هێرشێکی سزادەرانەی کردە سەر گوندە کوردییەکان، هەموو ئەمانە دەکرێ هۆکاری ئەو وێرانکارییە بن کە پەیامنێرەکەی دەیلی تێلێگراف باسی لێوە کردووە و ئەو بڕوایەی لەلا دروست کردبیت کە ئەمە شێوازێکی ئاسایی روداوەکانە. جگە لەم

هێرشە ئاسمانییە تۆڵەسێنانە، پێکدادانی چەکداریی لەنێوان کوردانی بارزانی لەلایەک و کوردانی تاڵەبانی لەگەڵ هێزەکانی حکومەتدا لەلایەکی ترەوە هەر وەک رابردوو بەردەوامە. هیچ راپۆرتێک لەبەردەستدا نیە کە عێراقییەکان تۆپخانەی قورس یاخود تانکیان بەکارهێنابێت و، هیچ ئاماژەیەکیش نیە کە ژمارەی قوربانییان ئەوەندە زۆر بێت وەک نیشانەی شەڕێکی قورس لێک بدرێتەوە.

٣. بەڵام ئەمە نابێتە هۆی نادیدەگرتنی ئەو ئەگەرەی کە بەرنامە بۆ شەڕی بەهارە دابڕێژرێت و، لە راستیدا دەنگۆی بەردەوام لەناو بازنە سەربازییەکانی عێراقدا هەن کە باس لەو ئەگەرە دەکەن. پێدەچێت ئەو راپۆرتەی لە عەمانەوە رەوانە کراوە و تیایدا باس لەوە دەکات عێراق داوای کردبێت بۆ ماوەیەکی کاتی سەربازەکانیان لە بەرەی ئیسرائیل ئازاد بکەن بۆ ئەوەی بەرامبەر کورد بەکار بهێنرێن (برووسکەی D.A. عەمان ژمارە FOH/181135Z MAR) پشتیوانیی ئەم تێڕوانینە دەکات بەرامبەر بە نیازەکانی حکومەت. هەرچەندە ئەم نیازە لەگەڵ ئەو قسانەی لێرە بە ئاشکرا و لە دانیشتنی تایبەتدا لەبارەی نەکێشانەوەی هێزەکانیان لە ئەردەن دەیکەن، یەک ناگرێتەوە. عێراقییەکان لە باکور ٣ فیرقەیان هەیە کە نزیکەی ٦٠ هەزار سەرباز لەخۆ دەگرێت و پێدەچێت ئەو هێزە بەس بێت کە بەبێ پاڵپشتیی و هێزی زیاتر بتوانێت دەست بە شەڕەکە بکات، بەڵام ئەگەر ئەم شەرە بۆ داهاتویەکی نزیک بەرنامەڕێژی بۆ کرا بێت، ئەوا پێم وایە: دەبوو هەڵمەتێکی راگەیاندن هەبوایە کە پاساو بۆ هێرشە چاوەڕوانکراوەکە بهێنێتەوە. تاکە ئاماژەی ئەم بابەتە ئەوەیە: کە رۆژنامەی ئەلنور کە رۆژنامەی تاڵەبانییەکانە لەجاران راستەوخۆتر باسی لە پشتیوانییەکانی ئیسرائیل بۆ بارزانی کردووە و وەکو پیلانێکی ئیمپریالیستیی لە دژی عەرەبەکان ناوزەدی کردووە. بەڵام دەکرێت ئەم بابەتە بە لێدوانێکی

رۆژنامەوانیی سەبارەت بە رۆژی نەورۆزی ئەم دواییە هاوسەنگ بکرێتەوە کە دەڵێت: رۆژی نەورۆز لەپێناو رێزگرتن لە کەلتوری کوردەکاندا کراوەتە پشوی گشتیی.

٤. ئەگەری زۆرە کە نەبوونی ئاماژەی تۆکمە سەبارەت بە مەبەستەکانی حکومەت بەهۆی ئەوەوە بێت کە هێشتا نەیتوانیبێت بڕیاری یەکلاکەرەوە بدات. کێشەی کورد جڵەو ناکرێت و سەیر نیە ئەگەر بۆچونی جیاواز هەبن لەبارەی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەم کێشەیەدا.

دڵسۆزی هەمیشەییت،

پی. مەککیارنێی

**باڵیۆزخانەی بریتانیا**

**بەغدا**

**٥ی نیسانی ١٩٦٩**

**(١/٨)**

**بەڕێز هینچکلیف**

## هێرشەکانی عێراق بۆسەر کوردەکان

لە نامەکەمدا ژمارە ٨/١ لە رۆژی ٤ی نیساندا ئەوا چاوەڕوان دەکەین ئاماژەی هەڵمەتێکی راگەیاندن ببینین کە پاساو بۆ هێرشێکی سەرتاسەری سوپای عێراق دژی کوردەکان بهێنێتەوە.

٢. لەمبارەیەوە رەنگە گرنگ بێت بزانین کە بەشێکی گەورەی ئەو چاوپێکەوتنە تەلەفزیۆنییەی لەگەڵ عەزیز ئەلحاجدا بلاوکرایەوە (هاوپێچکراوە) بۆ کێشەی کورد تەرخانکرابوو. ئەلحاج بەتایبەتی پرسیاری لەبارەی سەرچاوەی ئەو کۆمەکە سەربازییانە لێ کرا کە بە کورد دەدرێن. کاتێک ئەلحاج پرسیاری ئەوەی لێ کرا کە ئایا بارزانی چەک لە سەنتۆ (CENTO) وەردەگرێت، ئەلحاج تەنیا گوتی: کە چەکەکان لە ئێرانەوە دێن. کاتێک گوشاری خرایەسەر، ئەلحاج گوتی: لە کەمپەکەی بارزانیدا راوێژکاری ئێرانیی و رەنگە ئەمریکیشی هەبن و، بەبێ هیچ هاندانێک گوتی: کە هیچ زانیارییەکی دیاریکراوی لەسەر بوونی ئەفسەری ئیسرائیلی لەبەردەستدا نییە.

٣. پرسیارەکە گوشاری توندی خستەسەر ئەلحاج کە ناچاری بکات پەیوەندی لەنێوان کورد و ئیسرائیل/ سەنتۆدا باس بکات. ئەمە هاوتەریبە لەگەڵ ئەو لێدوانەی (ئەلنور) کە لە راپۆرتی پێشوومدا باسم لێوە کردبوو، هەروەها هاوتەریبە لەگەڵ وتارێکی دیکەی ئەلنوردا کە ئەمڕۆ بڵاوکراوەتەوە و باس لەوە دەکات کە بزوتنەوەی کورد پەیوەندی لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکان و ئیسرائیلدا هەیە.

٤. هێشتا نەزانراوە، کە مەبەست لەم قسانە: هێرشی سەربازیی بەهارەیە یاخود درێژکراوەی ئەو هەوڵانەیە کە بۆ مامەڵەکردنی سیاسییانە لەگەڵ بارزانیدا دەگیرێنەبەر، واتە رەشکردنی روخساری، بەتایبەتیی بە فلچەی ئیسرائیلی، لە ئارادان. بە دڵنیاییەوە، شکستهێنانی رژێم لە رێککەوتن لەگەڵ ئێراندا، ئەوا رژێم لە بەهێزترین چەک لە دژی کوردە بارزانییەکان دادەماڵێت. بەڵام ئەمە بەو مانایە نایەت کە رژێم ئەوەندە ژیر نەبێت رێگا بە کورد نەدات بە هێواشی بکوڵێت لەبری ئەوەی کە هەوڵێکی سەربازی بدات.

دڵسۆزی هەمیشەییت

پی. مەککارنێی.

ME/3064/A/17

## گوللەبارانکردنی سەربازان لە کەرکوک

دوێنێ دوو سەربازی تاوانبار لەلایەن تیمی گوللەبارانکردنەوە لە مەیدانی تەقەکردنی (بالاوا) لە کەرکوک گوللەباران کران. ئەو دوو کەسە شۆفێر بوون و ناویان "یوسف جەمال و محەمەد حەسەن قادر" بوو. ئەم تاوانبارە لەلایەن دادگای شۆڕشەوە بە تاوانی دانانی بۆمب لە ئوتومبیلی سەربازیدا و بە مەبەستی کوشتنی ئەفسەرانی کۆماندۆ لە کەرکوک دادگایی کرابوون. بەهۆی تەقینەوەکەوە ئوتومبیلە سەربازییەکە لەناوچوو. لاشەی دوو کەسەکە لەبەردەم بارەگاکانی پۆلیسی سەربازی فیرقەی دوو هەڵواسران.

(ئاژانسی هەواڵی عێراق ١٠:٥٠ی گرینیچ، ١ی ئایاری ١٩٦٩)

**خۆرهەڵاتی نزیک و ناوەڕاست**
**١١ی گرینیچی بۆ ١١/٥ی گرینیچی**
**٦ی ئایاری ١٩٦٩**

## شەڕ لە باکوری عێراق

رادیــۆی ئیســرائیل لــە کاتژمێــر ١٧ بەکاتــی گرینیچــی رۆژی ٥ی ئایــار رایگەیانـد: کـە ٥٠ کەسـی کـورد بەهـۆی هێرشـە ئاسـمانییەکانی عێراقـەوە بـۆ سـەر کـوردەکان کـوژراون و لـە تۆڵـەدا کـوردەکان دامـەزراوە نەوتییەکانـی (سـەر بـە شـاخ)یان لە ناوچـەی هەولێـر و هەروەهـا لـە کەرکـوک تەقاندووەتەوە.

لـە کاتژمێـر ١٨ی گرینیچیشـدا رادیـۆی بەیـروت رایگەیانـد: کـە فەرمانـدەی لیـوای بەغـدا لـە راگەیەندراوێکـی رۆژنامەوانیـدا رایگەیانـدووە "ئەمـڕۆ حکومەتی عێـراق رایگەیانـدووە کـە خێڵـە کوردەکانـی باکـوری عێـراق شـەڕ لـە دژی حکومەتیـان دەسـتپێکردووەتەوە".

**پوختەی رۆژنامەکانی بەغدا**
**باڵیۆزخانەی بەریتانی لە بەغدا**
**سێشەممە - ٢٠ی ئایاری ١٩٦٩**

**سەروتارەکان:**
ئەلنور: گرنگیی زامنکردنی مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد:

سەروتارەکە باس لەو شەڕە دەکات کە ئێستا لەنێوان عەرەبەکان و گەلانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست لە بەرەیەک و، ئیمپریالیزم و زایۆنیزم و شوێنکەوتووانی لە بەرەی بەرامبەریان دەکات. سەروتارەکە دەڵێت: لەبەرئەوەی کوردستانی عێراق لە ناوچەی شەڕەکەدایە، بۆیە کاریگەریی شەڕەکەی کەوتووەتە سەر. کوردستانی عێراق لەمڕۆدا لە چالاکییەکی سەرنجڕاکێشی بەرجەستەبووندایە لەنێوان هێزە پێشکەوتنخوازەکان و هێزە "خراپەکار و دواکەوتووخوازەکان" دا. هاوسۆزییەکی تەواو بۆ بزووتنەوەی رزگارییخوازی کورد لەژێر سەرکردایەتی (حیزب)دا دەبینرێت چ لەلایەن چین و توێژە خەباتگێڕ و چ لەلایەن رۆشنبیرە شۆڕشگێڕەکانەوە، هەروەک چۆن تێبینی تەریکبوونی ژمارەیەکی زۆر لە هێزە چەکدارەکانی مەلا مستەفا و پەیوەندییکردنیان بە (سریە) نیشتمانییەکانی ژێر فەرمانی (حیزب) دەکرێت. لەلایەکی دیکەوە، تێبینی دەکرێت کە هەموو ئەو بەکرێگیراوە دەرەبەگ و ناپاک و دواکەوتووخوازانەی کە بەرژەوەندیی ماددییەیان بە کەسانی بیانییەوە بەستراوەتەوە پەیوەندی بە مەلا مستەفاوە دەکەن.

سەروتارەکە باس لەو هەنگاوە نیشتمانییانەش دەکات کە حکومەتی ئێستا گرتوویەتییە بەر و ئەو رۆڵە دیارەش لەپێناو بەهێزکردنی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستاندایە و ئەمەش لە قایلکردنی کۆمەڵانی خەڵکی کورد دا دێت لەپێناو پشتیوانیکردن لە ئەو خەباتە رەوایەی کە دژی گەلانی عەرەب کراوە. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەم هەنگاوانە کە جێبەجێ کردنی لایەنە کەلتورییەکەی راگەیەنراوەکەی رۆژی ٢٩ی حوزەیران و هەروەها دروستکردنی لیوای دهۆک و بەشداریی کارای کوردە لە بوارە ئابوریی و کۆمەڵایەتیی و کەلتورییەکانیی عێراق هێشتا کاری زیاتری دەوێت. پابەندی بە بنەما پێشکەوتنخوازەکان و ددانپیانانی حکومەتی ئێستا بە قەوارەی کوردیدا لە عێراق وا دەخوازێت کە رژێم هەنگاوی خێراتر بنێت بۆ لابردنی هەموو ئەو لەمپەرانەی کە لەبەردەم هەڵنانی هەنگاوی لەوجۆرەدان.

ME/3082/A16

بەڵێنەکەی عەمید سەعدون غەیدان سەبارەت بە یاسادانان بۆ کوردانی عێراق.

**پوختەی راپۆرتەکان:**

عەمید سەعدون غەیدان کە ئەندامی ئەنجومەنی فەرماندەی شۆڕش و فەرماندەی هێزەکانی بەغدایە، لەئێستادا سەرقاڵی گەشتێکە لە ناوچەکانی باکور، ناوبراو لە رۆژی ٢١ی ئایار لە کەرکوکەوە گەشتە هەولێر و چاوی بە ژمارەیەک لە کاربەدەستانی پارێزگاکە کەوت (ئاژانسی هەواڵی عێراق بە زمانی عەرەبی ١٠:١٦ گرینیچ ٢٢ی ئایاری ١٩٦٩).

عەمید سەعدون غەیدان لە ٢٢ی ئایاردا لە هەولێر رایگەیاند: یاسای پارێزگان بەم نزیکانە دەخرێتە کار، غەیدان لە لێدوانێکدا بۆ پەیامنێری ئاژانسی هەواڵی عێراق ئەمڕۆ لە هەولێر گوتی: ئەنجومەنی فەرماندەی شۆڕش بە نیازە مەسەلەی کورد بەشێوەیەکی ئاشتییانە و رەوا و هاوئاهەنگ لەگەڵ راگەیەندراوەکەی ٢٩ی حوزەیراندا چارەسەر بکات، کە ئەمەی دواییان ئەنجومەنەکە بەڵێنی داوە رێزی لێ بگرێت.

هەروەها ڕاشیگەیاند: حکومەت چەند پڕۆژەیەکی گرنگ لە پارێزگاکە جێبەجێ دەکات، بۆ نموونە: بنیادنانی کارگە و دامەزراوەی پەروەردەیی، هەموو ئەمانەش لەپێناو بەرزکردنەوەی ئاستی ئابوریی و کەلتوریی دایە بۆ هاوڵاتیان. ناوبراو ئاماژەی بە دروشمەکەی سەرۆک ئەحمەد حەسەن

ئەلبەکر دا (هەموو شتێک لەپێناوی جەنگدا) و رایگەیاند: ئەمە مانای ئەوەیە سەرەتا گرنگی بدرێتە بابەتە گرنگەکان و بابەتە لاوەکییەکان بوەستێنرێت، ئەمە خواستی حکومەت بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی پارێزگاکە نیشان دەدات.

(بەغدا بە زمانی عەرەبی ١٥:٥٥ گرینچی رۆژی ٢٢ی ئایاری ١٩٦٩).

ئەلجمهورییەش نووسیویەتی: رێکارە شۆڕشگێڕانەکانی ئەم دواییە، کاردانەوەیەکی زۆری لە نێوان ئەڵقەکانی ئیمپریالیزم و تاقمە زایۆنییەکان و دەوڵەتە دواکەوتووخوازەکاندا دروست کردووە، کە پلانیان هەبووە دژی نیشتمانی عەرەب و هێزە دژە شۆڕشەکان بووەستتنەوە. لەگەڵ ئەمەشدا حکومەتە شۆڕشگێڕەکە بەهەمان هێزەوە بەردەوام دەبێت بۆ دۆزینەوەی چارەسەری دادپەروەرانە بۆ پرسەکانی برا کوردەکانمان لە ناوچەکانی باکوری نیشتمان. ئەمە کۆتایی بە ئەنجامی نەرێنی رابردو و رەوشە نارەحەتەکە دەهێنێت و، کۆتایی بە کاریگەرییە خراپەکانی براکوژی دەهێنێت.

هەروەها رۆژنامەکە ئاماژە بەوەش دەکات: حکومەتی شۆڕشگێڕ سەرقاڵی ئامادەکردنی رەشنووسی یاسای پارێزگاکانە، کە لەگەڵ خستنەگەڕیدا دەتوانێت یەکێک لە داواکارییە سەرەکییەکانی کوردەکانمان چارەسەر بکات کە حکومەتی رابردوو لێی نیگەران بوو. ئەلجمهورییە دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە: هیوامان وایە کە برا کوردەکانمان لە عێراق پشتیوانی خۆیان بۆ حکومەتە نیشتمانییەکە بەهێز بکەن، بۆ ئەوەی بتوانێت ئەو هیوایانەیان بۆ بێنێتە دی کە سوورن لەسەری. دەستپێشخەرییەکەیان ئەو هەنگاوە شۆڕشگێڕانەیە بەهێزتر دەکات کە رووەو بنیادنانی عێراقێکی نوێیە، کە تیایدا عەرەب و کورد و هاوڵاتیانی دیکە هەموو مافەکانیان لە تێکڕای بوارەکانی ژیاندا بەدەستبهێنن.

(بەغدا بە زمانی عەرەبی ٥:٣٠ گرینیچی رۆژی ٢٣ی ئایاری ١٩٦٩).

**نهێنی**
**باڵیۆزخانەی بریتانیا**
**واشنتۆن دی.سی**
**٩/١٢**
**٢ی حوزەیرانی ١٩٦٩**

**بەڕێز دەیڤد،**

## هەڕەشەی کوردەکان لەسەر دامەزراوە نەوتییەکانی عێراق

تالکۆتی سیسلی (بەرپرسی عێراق لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا) پێی ڕاگەیاندم کە دوو ئەمریکی بە ڕەگەز کورد کە بەم دواییە چەند ڕۆژێک لە کوردستان ماونەتەوە و لە کۆتایی مانگی نیساندا چاویان بە مەلا مستەفا کەوتووە، لەلایەن مەلا مستەفاوە داوایان لێ کراوە کە لەگەڵ خۆیاندا پەیامێک بهێننەوە بۆ حکومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان. ناوەڕۆکی پەیامەکە ئەوەیە: مەلا مستەفا دەیەوێت ئەمریکییەکان لەوە تێ بگەن کە ناوبراو لەژێر گوشارێکی زۆردایە بۆ ئەوەی هێرش بکاتە سەر دامەزراوە نەوتییەکانی عێراق و ڕەنگە بەناچاریی ئەنجامدانی ئەم کارە لە داهاتوودا بە جددییەوە لەبەرچاو بگرێت، لەبەر ئەوەی داهاتی نەوتی عێراق بۆ کڕینی چەک و تەقەمەنیی و بەکارهێنانیان لە دژی کورد خەرج دەکرێت.

٢. پەیامەکە داوای هیچ کردارێک لە ئەمریکییەکان لەخۆ ناگرێ و، تا ڕاددەیەکیش ویلایەتە یەکگرتووەکان و وەزارەتی دەرەوە لە پاڵنەرەکەی

پشـت ئـەم پەیـام ناردنـەی مـەلا مسـتەفا تـێ ناگـەن. لەگـەڵ ئەوەشـدا کۆمپانیـا نەوتییـە ئەمریکییەکانـی IPCایـان لـە ناوەرۆکـی پەیامەکـە ئاگـادار کردۆتـەوە.

دڵسۆزی هەمیشەییت،

ئەی. بی. ئوورویک

**EN CLAIR**

**ئەنقەرە**

**بروسکەی ژمارە ٨٣٨**

**بۆ وەزارەتی دەرەوە و کۆمۆنویڵز**

**١٤ی حوزەیرانی ١٩٦٩**

نهێنی نی‌یە.

بۆ راپۆرتی وەزارەتی دەرەوە و کۆمۆنویڵز، ژمارە ٨٣٨ رۆژی ١٤ی حوزەیران دووبارە کراوەتەوە بە مەبەستی زانیاری بۆ بەغدا؟

راپۆرتی رۆژنامەکانی تورکیا باس لەوە دەکەن کە لە رۆژی ١٢ی حوزەیراندا فرۆکە عێراقیەکان شوێنی هێزەکانی بارزانییان لەودیوی سنوری تورکیا لە پارێزگای چوکورچە بە حەوت بۆمبی ناپاڵم بۆردومان کردووە. هیچ قوربانییەکی لێ نەکەوتووەتەوە. سکرتێری گشتیی وەزارەتی دەرەوە لە رۆژی ١٣ی حوزەیراندا باڵیۆزی عێراقی بانگ کردووە.

سێر ئەی. ئالن

دابەشکردنی بۆ بەشەکانی: بەشی خۆرهەڵاتی نزیک، بەشی باشوری ئەوروپا، بەشی سیاسەتی بەرگری، بەشی هەواڵ، بەشی RES، بەشی نەتەوە یەکگرتووەکان و، MOD (ناوخۆیی).

**بەڕێز پی. ئێچ. ئێن. هینچکلیف**
**بەشی خۆرهەڵاتی نزیک**
**وەزارەتی دەرەوە و کۆمۆنوێڵز**
**١٧ی ئەیلولی ١٩٦٩**

هاوپێچ نامەیەکی سکاڵا ڕەوانە دەکەم کە هەرئێستا لە کارمەندێکی کۆمپانیای نەوتی عێراقم وەرگرت کە ناوی "تەحسین محەمەد ئەمین هەورامانی"یە. نامەکە باس لەوە دەکات کە ناوبراو نیگەرانی باوکە بەتەمەنەکەیەتی کە بە گوتەی ناوبراو سزای دە ساڵ زیندانی بۆ بڕاوەتەوە بەرامبەر بەو چالاکییە یاخیگەرانەیەی لەنێوان سنوری ئێران و عێراقدا ئەنجامی داوە. باوکەکە ناوی "محەمەد ئەمین سوڵتانی" هەورامانی (لهۆن)ە.

٢. زۆر بەگومانم لەوەی ئێمە بتوانین هیچ شتێک بۆ "تەحسین" یاخود بۆ باوکی بکەین. بەڵام ئەم کەسە ساڵانێکی زۆر "سەرچاوەیەکی متمانەپێکراوی باڵیۆزخانە" بووە بۆ بەدەستهێنانی زانیاری لەبارەی باوردۆخی کوردستانەوە لە باکوری عێراق دا. لەوانەیە ئەم کەسە بێتە باڵیۆزخانە لە بەغدا (ئەگەر لەوکاتەدا بارودۆخی ئاسایش باشتر ببێت) و بیەوێت قسە لەگەڵ تیمێکی باڵیۆزخانەکەدا بکات. هەرچەندە ناوبراو خۆبەخشانە دێتە پێشەوە کە زانیاری لەبارەی بارودۆخی کوردەوە بدات، بەڵام خەمی سەرەکییەکەی ئەوەیە کە هەواڵێکی لەبارەی باوکییەوە بزانێت.

ئێس ئێڵ. ئیگەرتۆن
بەڕێز مایکڵ ئێستۆن
باڵیۆزخانەی بەریتانیا
تاران

وێنەیەک بۆ
بەڕێز ئەی. ئی. ساندرێس، باڵیۆزخانەی بەریتانیا لە بەغدا، بەڕێز ئێل. ئەپڵیارد، بەشی خۆرهەڵاتی نزیک، وەزارەتی دەرەوە و کۆمۆنوێڵز.

ME/3191/A/1

**أ) جیهانی عەرەب و ئیسرائیل**
**راپۆرتەکانی (دەنگی کوردستانی عێراق)**
**(دەنگی کوردستانی عێراق بە زمانی عەرەبی ١٦:٤٠ گرینیچ)**
**٢٨ی ئەیلولی ١٩٦٩**

بەشێک لە راپۆرتێک لەبارەی کردەوە سەربازییەکان.

هێزەکانمان تائێستاش کۆنترۆڵی تەواویان بەسەر عەمادییەدا هەیە. هێزەکانی دوژمن هێشتا لەژێر گەمارۆدان و کۆمەکیان پێ ناگات .. فڕۆکەی عەفلەقییەکان هێرشی کردۆتە سەر گوندەکانی ( قەسرێ، ڕێزان و دەڵاڵە) بە ناپاڵم و موشەک لە رۆژەکانی ٢٦ و ٢٧ ی ئەیلولدا، بەڵام هێرشەکان هیچ قوربانییەکیان لێنەکەوتەوە.

## لە بنکەی ژمارە یەکەوە:

زانیاریمان لە سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوەوە پێگەیشتووە، کە ئەو تۆپبارانەی کردمانە سەر بنکەکانی (دیبەگە ئەلعدوان)، ئەم زەرەرو زیانانەی بە دوژمن گەیاندووە، کوژرانی ١٣ سەرباز و برینداربوونی دووان، وێرانبوونی دوو کۆگای سەربازی. چەکەکانی بنکەی یەک لە رۆژی ٢٣ی ئەیلولدا ئەم بارەگایانەیان تۆپباران کرد لە دوای ئەوەی ئەو هێزانە بەردەوام کردەوەی شەڕەنگێزیان بەرامبەر بە خەڵکی ناوچەکە ئەنجام دەدا.

ME/3191/A/1

**ب) (دەنگی کوردستانی عێراق) بە زمانی عەرەبی، ١٦:٤٠ گرینیچ لە رۆژی ٢٩ی ئەیلولی ١٩٦٩**

**(١) چەند بڕگەیەک لە بلاۆکراوەی مەکتەبی ژمارە ١ی شۆڕشی کوردەوە، (ئەنجومەن) بۆ هاووڵاتیانی پارێزگاکانی دهۆک و موسڵ:**

داوا لە هاووڵاتیان دەکرێت کە لەمڕۆوە تا ئاگاداری داهاتوو ئەوا رێگای نێوان "موسڵ، دهۆک، و عەمادیە" بەکار نەهێنن. ئەم ناوچەیە و بەتایبەتی رێگاکانی ئێستا مەیدانی چالاکییەکانی هێزە بوێرەکانمانن. بەپێی زانیاریی سەرچاوە باوەڕپێکراوەکان، سەربازانی دوژمن و ناپاکە بەکرێگیراوەکان و دوژمنە ئاژاوەگێڕەکان دەیانەوێت وەکوو گەشتیار لە ئۆتۆمبیلی مەدەنیدا خۆیان لەدەست سوپا شۆڕشگێڕەکەمان قوتار بکەن.. هیواداریین کە هاووڵاتیان رێگای دەربازبونیان پێ نەدەن، ئەگەرنا بەداخەوە ناچار دەبین تەقە لە هەر ئۆتۆمبیلێک بکەین کە بەو رێگایانەدا تێپەڕ دەبێت.

**(٢) چەند بڕگەیەکی داواکارییەک لە زانایانەوە:**

زانا پایەبەرزەکانی عێراق، هەم شیعە و هەم سوننە، پیاوانی هەموو ئایینەکان، دادوەران، و پارێزەران ...، ئێمەی زانایانی شەریعەتی ئیسلام لە کوردستانی عێراق – "مامۆستایان و، وتاربێژان و پێشەوایان" کە زیاتر لە ٢٥٠ کەسین – بڕوامان وایە: کە ئەرکێکی ئایینیی و مرۆییە لەسەرمان کە داوا لە ئێوە بەتایبەتیی و لە هەموو ئەو کەسانە بکەین کە بڕوایان وایە دەبێت مرۆڤ بە ئاشتی بژی لە چوارچێوەی ئەو یاسایانەدا کە کەرامەت و ماف

و ئازادییەکانی دەپارێزن، داواتان لێ دەکەین کە دەنگتان هەڵبڕن دژی ئەو نادادپەروەریی و ئەو قەسابخانە خوێناوییە تۆقێنەرانەی کە لەلایەن باڵی راسترەوی لەدینهەڵگەڕاوەی بەعسەوە دژ بە گەلە ئاشتیخوازەکەمان ئەنجام دەدرێت. نموونەی ئەمەش سوتاندنی ٦٧ کەسە لە ئەشکەوتێکی بچوکی گوندی دوکان کە زوربەیان منداڵ بون...، هەروەها نزیکەی ١٢٩ مزگەوت بەهۆی تۆپبارانەوە وێران کراون. فڕۆکەکانی بەعس بێ بەزەییانە ناوچە مەدەنییە قەرەباڵغەکان بۆردومان دەکات...

**(٣) دەقی ڕاگەیەنراو:**

لە رۆژی ١ی تشرینی یەکەمەوە پەخشەکەمان لەجیاتی کاتژمێر ٦ی ئێوارە، لە ٧ی ئێوارەوە دەست پێ دەکات. شەپۆلەکان وەک خۆیان دەمێننەوە.

ME/320/6/1

**أ) جیهانی عەرەب و ئیسرائیل:**

**دەنگی کوردستانی عێراق لەبارەی پەیوەندییەکانی بەریتانیا و عێراق، (دەنگی کوردستانی عێراق) بە زمانی عەرەبی ٤٠:١٥ گرینیچ رۆژی ١٥ی تشرینی یەکەمی ١٩٦٩.**

**بەشێک لە پەخشەکە:**

.... ئەگەر بزانین دوژمنەکانی بەعس کێن، ئەوا دەتوانین دۆستەکانی دەستنیشان بکەین. ئاشکرایە کە بەریتانیا دوژمنی بەعسیەکان نیە. بەڵگەی ئەمەش ئەو راستییەیە کە بەعسییەکان لە ئامانجەکانی خەباتیاندا پرسی کاریگەریی کۆمپانیا گەورەکانی بەریتانیایان لە عێراق وەلا ناوە. لەبری ئەوە سەدان کەسییان کردووەتە قوربانی لەو هێرشانەیاندا کە ئامانج لێی ناچارکردنی (پێشمەرگە)یە بۆ ئەوەی لە ناوچە نەوتییەکان دوربکەوێتەوە، چونکە دەترسن لەوەی ئەو ناوچانە وێران ببن.

رادیۆی بەعسیەکان بە هیچ شێوەیەک باس لە چالاکییە سیخوڕییەکانی بەریتانیا لە عێراقدا ناکات، بەهەمان شێوە (BBC) کە کۆمپانیایەکی گشتییە هیچ راپۆرتێک سەبارەت بە کردەوەی بەعسییەکان یاخود لەبارەی شەڕەکانی کوردستان بڵاو ناکاتەوە، کەچی پەلەی ئەوەیەتی راپۆرت لەسەر سەردانی کاربەدەستە پلە نزمەکانی عێراق بکات و بە وشەی جوان پیایاندا هەڵپژاوە، بۆیە گوێگری بەڕێز دەتوانێت ئاستی هەماهەنگیی و هاوکاری ئەو دوولایەنە لەنێوان بەعسییەکان و حکومەتی

بەریتانیادا ببینێت کە حکومەتێکە لە هەموو ئەوانی دیکە زیاتر بە ترسان لەڕای گشتی بەناوبانگە.

مستەر ئۆکلاند

## عێراق و کوردەکان:

بەم دواییانە رۆژنامەکان بایەخێکی زۆریان خستووەتە سەر ئەم بابەتە و بە گوێرەی ئەو وتارەی نیویۆرک تایمز کە هاوپێچ کراوە، ئەوا لە کۆتایی مانگی ئەیلولدا عێراقیەکان هێرشێکی تازەیان ئەنجام داوە.

٢. دەستکەوتنی بەڵگەی بەرجەستە کارێکی گرانە. بەپێی ئەو راپۆرتانەی کە بەدەستمان گەیشتووە، وا پێدەچێت کە بە درێژایی وەرزی هاوین شەڕەکە هێواش هێواش لە باکور بەردەوام بوو بێت. لە یەکێک لە قۆناغەکاندا ئەو دەنگۆیە لەئارادا بوو کە رەنگە هێزەکانی عێراق لە ئەردەن پاشەکشێیان پێ کرابێت (بێ ئەوەی شوێنیان پڕکرابێتەوە) بۆ ئەوەی لە هەڵمەتەکەدا سودیان لێ وەربگیرێت، بەڵام پێم وانی‌یە کە ئەم دەنگۆیە راست بێت.

٣. سەبارەت بەوەی: کە کێ براوە دەبێت، دیسانەوە زانیارییەکی متمانەپێکراومان لەبەردەستدا نی‌یە. پێم وایە: بارودۆخەکە وەکو ئەوەی ساڵانی رابردووە. عێراق لە وەرزی هاویندا دەست بەسەر هەندێک ناوچەدا دەگرێت و هەموو ئەو ناوچانەش لە زستاندا لەدەست دەداتەوە. رژێم بەڵێنی زارەکی بەرامبەر چەند داوایەکی کوردەکان دەربڕیووە. پێشتر لەم وەرزی هاوینەدا رایانگەیاندبوو کە لە باکور پارێزگایەکی نوێ دادەمەزرێنن کە تارادەیەکی زۆر لەلایەن کوردەکان خۆیانەوە بەڕێوە ببرێت و لە ٩ی تشرینی یەکەمدا رایانگەیاند کە کۆمەڵێک بڕیاریان داوە بۆ بەرەوپێشبردنی رەوشی زمانی کوردی.

٤. یەکێک لە پێشهاتە سەرنجڕاکێشەکان دیارنەمانی جەلال تاڵەبانییە لە شانۆی سیاسیی دا. حکومەتی بەعس هەوڵ دەدات ناوبراو وەکو (کوردی باش) لە بەرامبەر مەلا مستەفای بارزانی دا دروست بکات (کە چەند ساڵێک ناکۆکییان لەنێواندا هەبوو). ئەم هەوڵە سەری نەگرت چونکە تاڵەبانی ئەوەندە نەرم نەبوو کە ڕژێم هیوای بۆ دەخواست. هەرچۆنێک بێت، تاڵەبانی بە بەراورد لەگەڵ مەلا، شوێنکەوتووەکانی زۆر کەمترە.

پی. ئاڕ. ئێم. هینچکلیف
١٦ی تشرینی یەکەمی ١٩٦٩

**لەگەڵ باشترین سوپاسگووزاری**
**شەفیق قەزاز**
**١٤٢٠ هامپشێر وێست کۆرت**
**سیلڤەر سپرینگل**
**ماریلاند ٢٠٩٠٣**
**١٤٢٠ هامپشێر وێست کۆرت**
**سیلڤەر سپرینگ، ماری لاند ٢٠٩٠٣**
**٢٧ی تشرینی یەکەمی ١٩٦٩**

بەڕێزان جەنابی لۆرد کارادۆن (GCMG، KCVO)
وەزیـری دەوڵـەت بـۆ کاروبـاری دەرەوە و کۆمۆنوێڵـزی نوێنەری هەمیشـەیی لە نەتـەوە یەکگرتـووەکان
845، Third Aveaye نهۆمی New York 10022.10

## ئەرکی شانشینی یەکگرتووە لە نەتەوە یەکگرتووەکان:

بەڕێـز: هەشـت سـاڵە گەلـی کـوردی عێـراق ناچارکـراون چـەک هەڵگـرن و پارێزگـاری لـە مافـە نەتەوەییەکەیـان و ئازادییەکەیـان بکـەن. لەگـەڵ ئەوەشـدا لەگـەڵ گەڕانـەوەی حکومەتـی بەعـس بۆ سـەر دەسـەڵات لـە عێراق، شـەڕ لە دژی گەلـی کـورد خراوەتـە قۆناغێکـی نوێوە. ئـەم بەڵگەنامـە و وێنانە کـە هاوپێچکراون بەروونـی دەریدەخـەن کـە نـەک تەنیـا مافـە نەتەوەییەکانـی کـورد لەبـەردەم هەڕەشـەدان بـوون و مانـەوەی گەلـی کوردیـش لەبـەردەم مەترسـیدایە. بگـرە نارەحەتـی بارودۆخەکەمـان لـەو هەقیقەتـەدا بەرجەسـتە دەبێـت کـە حکومەتـی

بەعسی ئێستای عێراق بەشێوەیەکی سیستماتیکی هەوڵی قڕکردنی گەلی کورد دەدات، لەبری ئەوەی پرسی کورد بەشێوەیەکی ئاشتیانە چارە بکات.

بەڕێز، ئێمە لەدوای هەشت ساڵ لە هەوڵدانمان لەگەڵ حکومەتە جیاجیاکانی عێراق کە قایلیان بکەین بۆ گەیشتن بە چارەسەرێکی ئاشتیانە بۆ پرسی کورد، ئێستا گەیشتووینەتە ئەو بڕوایایەی کە هیچ ئەگەرێک بۆ گەیشتن بە چارەسەرێکی لەوجۆرە لەئارادا نییە، بەتایبەت لەگەڵ حکومەتی بەعسی ئێستا دا. ئێمە کە زۆر نیگەرانی ئاسایشی خەڵکی کوردستانین و بڕوای تەواومان بە رەوایی پرسەکەمان هەیە، رووەدەکەینە بەڕێزتان و کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان کە لەوێ تەنیا چەند هەفتەیەک لەمەوبەر وەفدێکی یەک کەسی بارودۆخی کوردی بەجۆرێک باس کرد کە دەبێت نەتەوە یەکگرتووەکان بایەخی پێ بدات.

بەڕێز، ویژدانی مرۆڤایەتیی کە لە نەتەوە یەکگرتووەکاندا بەرجەستە بووە، پێویستە لە پاراستنی دەنگی گەلی کورددا ببیسترێت کە گەلێکن هیچ سەرچاوەیەکی دیکەیان نییە جگە لە پەنابردن بۆ ئێوە و کۆمەڵە شکۆمەندەکەتان. داوا لە بەڕێزتان دەکەین کە بە پشتیوانی کردنی ئەو راپۆرتەی کە پێشکەشی سەرۆکی کۆمەڵەی گشتی کراوە، هەروەها لە بەکارهێنانی دەنگی وڵاتەکەتان بۆ کۆتایی هێنان لەو شەڕەی لە کوردستاندا هەیە بۆ بەدیهێنانی چارەسەرێکی دادپەروەرانە و ئاشتییانە بۆ پرسی نەتەوەی کورد بایەخی خۆتان نیشان بدەن.

بەڕێز، من زۆر خۆشحاڵ دەبم و پێزانینم دەبێت ئەگەر دەرفەتێک هەبێت رووبەڕوو بارودۆخی کوردتان بۆ باس بکەم. تکایە بەڕێز ئەوپەڕی رێزم قبوڵ بفەرموو.

لەگەڵ رێزدا
شەفیق قەزاز
وتەبێژی شۆڕشی کورد لە ویلایەتە یەکگرتووەکان

هاوپێچەکان:
راپۆرتێک لەبارەی کارەساتی "داکان"
نوسخەیەک لەو راپۆرتەی پێشکەشی
سەرۆکی کۆمەڵی گشتی دەکرێت.

**٣ی تشرینی دووەمی ١٩٦٩**

**١٨٧/٢٥/١**

بەوپەڕی بایەخەوە نامەکەی ڕۆژی ٢٧ی تشرینی یەکەمتم خوێندەوە.

دڵنیـام چاوەڕوانـی ئـەوەم لـێ ناکـەی کـە بـە وردەکارییـەوە لێـدوان لەسـەر ئـەو هاوپێچـە بـدەم کـە لەگـەڵ نامەکەتـدا رەوانـەت کردبـوو، پێدەچێـت ئـەو جـۆرە ڕووداوانـەی باسـتکردوون بەشـێوەیەکی ئایدیایـی لـە ڕێگـەی سـکرتێری گشـتییەوە بـە هەماهەنگـی لەگـەڵ چالاکییەکانـی ئـەو دامەزراوەیـەی کـە لـە بـواری مافەکانـی مرۆڤـدا کاردەکات بخرێتـە بـەردەم نەتـەوە یەکگرتـووەکان.

وێنـە بـۆ: بەشـی خۆرهەڵاتـی نزیـک، وەزارەی دەرەوە و کۆمۆنوێڵـز، بەڕێزان: ئەنقـەرە، بەغـداد، تـاران، واشـنتۆن، سـەئولان باتـور و، ڕێیک جافیـک (کارادۆن).

ME/3221/C/2

## داواکاریی ئەفسەرە کوردەکان بۆ بەدەستهێنانی پەنابەرێتی سیاسیی

بەپێی راپۆرتێک کە لە رۆژنامەکانی ئەمڕۆدا ]٣ی تشرینی دووەمی ١٩٦٩[ بڵاوکراوەتەوە، دوو ئەفسەری بارزانی بە ناوەکانی "نەقیب عەبدۆ دنیا و مولازم عیسمەت میر" چوونەتە بنکەی سنوری سلۆپی و داوای پەنابەرێتییان کردووە لە تورکیا. وا دەزانرێت کە ئەم دوو هەڵهاتووە بە تۆمەتی ناپاکی بڕیاری لەسێدارەدانیان بۆ دەرکرا بێت.

(ئاژانسی ئەنادۆڵ بە زمانی تورکی ١٣ی گرینیچ ٣ی تشرینی دووەمی ١٩٦٩)

**(٢١ی تشرینی دووەمی ١٩٦٩)**

NEQ 1/2

نوسخەی نامەکەی دکتۆر شەفیق قەزازمان بۆ رەوانە کرا، کە وتەبێژی شۆڕشی کوردە لە ویلایەتە یەکگرتووەکان، وەڵامەکەی رۆژی ٣ی تشرینی دووەمی لۆرد کارادۆنیشمان پێگەیشت.

٢) هەرچەندە کە دەبێت بەوپەڕی وریاییەوە مامەڵە لەگەڵ ئەم بەناو نوێنەری کوردانەدا بکەین و، هەڵوێستی بنەڕەتیمان ئەوەبێت: کە پرسی کورد بابەتێکی ناوخۆی عێراقە. ئەوا گومانم نییە کە ئەمەش هەر سیاسەتیی خۆمانە کە هەرکاتێک شێوازێکی بەردەوام لە پێشێلکاری مافەکانی مرۆڤ بەدی کرا، ئەوا نەتەوە یەکگرتووەکان دەتوانێت لەڕێگەی ئەو دامەزراوەوە کە سەروکاریان لەگەڵ مافەکانی مرۆڤدایە بەشێوەیەکی یاسایی بارودۆخەکە لەبەرچاو بگرێت.

٣) لەگەڵ ئەوەشدا دڵنیام لەوەی کە تۆش کۆکیت لەگەڵمدا لەوەی: کە ئێمە نامانەوێت هانی کوردەکان بدەین (تەنانەت لەوەش کەمترە کە وا دەربکەوین کە هانیان دەدەین) بۆ ئەوەی کێشەکەیان لە کۆمسیۆنی مافەکانی مرۆڤ بوروژێنین. ئەگەر ئەمە رووبدات توشی دایلەمایەکی زۆر راستەقینە دەبین. لەکاتی پشتیوانیکردنمان لە دۆزی کورد، لەلایەک بڕێکی باش هاوسۆزی بۆ کوردەکان دروست دەبێت لەڕووی مافەکانی مرۆڤەوە، بەڵام لە لایەکی دیکەوە ئەم کارە پەیوەندییەکانمان لەگەڵ عێراق و ئەو

بەرژەوەندییە بازرگانییانەی لەویَ هەمانە رووبەڕووی کارەسات دەکاتەوە. لەراستیدا رەنگە رووبەڕووی چەندین شەرمەزرای دیکە بکرێینەوە، لە لایەن ئێرانییەکان و تورکەکانەوە ئەگەر بێت و ئەوانیش لەوکاتەدا ببنە ئەندامی کۆمسیۆنی مافەکانی مرۆڤ یاخود لیژنە لاوەکییەکانی ئەو کۆمسیۆنە. رەنگە بتوانین بە کەمیی لەم بابەتە بدوێین و لەپێش ئەوانی دیکەوە خۆمان پەنابدەین، هەرچەندە ئەمە هەڵوێستێکی زۆر بوێرانە نابێت، بەڵام من پێم وایە: زۆربەی ئەندامان وا دەخوازن کە ئەم بابەتە بە شاراوەیی بهێڵنەوە. کوردیش لەلای خۆیەوە هیچی دەستگیر نابێت جگە لەوەی زیاتر تورە دەبێت.

٤) بەگشتی، (لەکاتێکدا کە دەزانین مەبەست لە دارشتنی وەڵامەکەی لۆرد کارادۆن ئەوەبووە پاساو بۆ نەدانی لێدوانی راستەوخۆ لەبارەی پرسی کوردەوە بهێنێتەوە)، بۆیە وا بەباش دەزانین خۆمان لەو مەترسییە بپارێزین کە وا لە کوردەکان بگەیەنین پێیان وابێت پرسەکەیان دەخرێتە بەردەم دامەزراوەکانی مافی مرۆڤی نەتەوە یەککگرتووەکان، بەڵکوو تەنیا هەموو پەیوەندییەکانی داهاتوو وەربگرین و دان بە وەرگرتنیدا بنێین، بەبیَ ئەوەی هیچ لێدوانێکی لەبارەوە بدەین. وەک چۆن لە برگەی ٤ (ج)ی نوسراوەکەی مانگی تشرینی یەکەمی ١٩٦٦ کە بەشی خۆرهەڵات ئامادەی کردووە (نوسخەیەک لە راپۆرتەکەم هاوپێچ کردووە) بۆت دەردەکەوێت کە ئەوەی تائێستا کراوە ئەوەبووە هیچ جۆرە نوسراوێک بە کوردەکان نەدراوەتەوە، بەڵام هیچ نارەزاییەک هەست پیَ ناکەین کە لە داهاتوودا دانپیانانێکی سادەیان ئاراستە بکرێت.

وێنەیەک بۆ بەرێزان: ئەنقەرە، بەغداد، تاران، واشنتۆن

ئەرکی شانشینی یەککگرتووە

بۆ نەتەوە یەکگرتووەکان
Third arenue
845
New york Ny

مستەر هایمان
یەکەی پەرلەمانی:

وەڵامێک بۆ پرسیارە پەرلەمانییەکەی مستەر رۆز رەوانە دەکەم، هاوپێچ لەگەڵ تێبینی تەواوکاری و نوسراوێکی پاشخان. ئەم نوسراوانە بە هاوکاریی لەگەڵ بەشی خۆرهەڵاتی نزیکدا ئامادەکراون.

(ئێچ. دەبلیۆ. کینگ)
بەشی (ئابوری و کۆمەڵایەتی)ی نەتەوە یەکگرتووەکان
١٣ی کانوونی یەکەمی ١٩٦٩

وێنەیەک بۆ: مستەر ئارسەر
مستەر تریپ (سەرۆکی N. E. D)

**پرسیاری پەرلەمانیی:**

نەتــەوە یەکگرتــووەکان (ETS) بــۆ وەڵامــی زارەکــی لەبــارەی مســتەر پــاوڵ بــی. رۆز (مانجســتەر، بــلاک لێــی).

پرســیارەکە ئەوەیــە لــە وەزیــری دەرەوە بــۆ کاروبــاری دەرەوە و کۆمۆنویڵــز، کــە ئایــا هێشــتا دەیەوێــت لــە کۆمســیۆنی مافەکانــی مرۆڤــی نەتــەوە یەکگرتــووەکان بــاس لــە مەترســییەکانی ســەر ئاشــتی لــە خۆرهەڵاتی ناوەڕاســت بــکات کــە بەهــۆی ئــەو بۆمبارانکــردن و کارە بــێ بەزەییانــەوە دروســت بــووە کــە حکومەتــی عێــراق دژی کــوردەکان پیــادەی دەکات؟

(١٥ی کانونی یەکەمی ١٩٦٩)
واژوو (مستەر مارمایس فۆڵی)

نەخێر بەڕێز
پێــم وانی‌یــە کــە کارێکــی گونجــاو بێــت بــۆ دەوڵەتــی بەریتانیــای مــەزن کــە لەبــارەی باســکردنی ئــەم بابەتــەوە لــە نەتــەوە یەکگرتــووەکان دەســتپێشــخەری بــکات. هەڵوێســتمان لەبــارەی هــەر کردەوەیــەک لــە نەتــەوە یەکگرتــووەکان، کــە تیایــدا ئــەم بابەتــە لــە کۆمســیۆنی مافەکانــی مــرۆڤ بخرێتــە بەربــاس، بەنــدە بــەو بابەتــەی کــە دەخرێتــەڕوو.

أ. دەقــی پرســیاری پەرلەمانیــی وەڵامــی ســەرۆک وەزیــر لــە رۆژی ١٧ی حوزەیرانــی ١٩٦٥.

ب. پرسیاری پەرلەمانیی و وەڵامی مستەر جۆرج تۆمسن لە رۆژی ١ی کانونی ١٩٦٥.

ج. دەقی پرسیاری پەرلەمانیی و وەڵامی مستەر جۆرج تومسن لە رۆژی ١١ی تەموزی ١٩٦٦.

د. پرسیاری پەرلەمانیی و وەڵامی مستەر گۆرۆنی رۆبێرتزی رۆژی ١٤ی ئازاری ١٩٦٩

**تێبینی شارەزایی**:

١) هەڵوێستی دەوڵەتی بەریتانیای مەزن سەبارەت بە ئەگەری وتووێژ لەسەر ئەم بابەتە لە کۆمسیۆنی مافەکانی مرۆڤ. بە دڵنیاییەوە ئێمە هەوڵی دامەزراوەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ نموونە کۆمسیۆنی مافەکانی مرۆڤمان بەلاوە پەسەندە کە کار لەسەر ئەو بابەتانە بکەن، کە بەرونی دیارە کە دەکەوێتە چوارچێوەی لێهاتووییەکانیانەوە. سەبارەت بە هەر وتووێژێک لەبارەی کوردەکانەوە لە کۆمسیۆنی مافەکانی مرۆڤ ئەوا دەبێت ئێمە بە وریاییەوە هەڵوێستی خۆمان لەبارەی تایبەتمەندیەکانی ئەو کەیسەوە لەبەرچاو بگرین کە پێشکەش دەکرێت.

٢) ئەگەری سەرکۆنەکردنی کردەوەکانی حکومەتی عێراق دژی کوردەکان لەلایەن دەوڵەتی بەریتانیای مەزنەوە.

هاورێی بەرێزم، سەرۆک وەزیر لە وەڵامی پرسیارێکدا کە لە رۆژی ١ی حوزەیرانی ١٩٦٥دا لە پەرلەمان لێی کرا [col. 110]، ئەوا گوتی: کە دەوڵەتی بەریتانیای مەزن بەداخە لە شەرەکانی کوردستان ، وەک چۆن بەداخە

لەهەر ناسەقامگیرییەکی دیکەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا، بەڵام بەلای ئێمەوە پرسی کورد بابەتێکە کە بۆ ئێمە نەشیاوە خۆی تێ دا هەڵقورتێنین. هیچ بەڵگەیەکم نیيە دەریبخات کە دەوڵەتی بەریتانیای مەزن وەڵامێکی جیاوازی بۆ ئەم پرسیارە هەبێت.

٣) ئەرکی ئەخلاقیی دەوڵەتی بەریتانیای مەزن لەبەر پەیوەندییە دوورودرێژەکەیانەوە لەگەڵ عێراق و پەیوەندییە دۆستانەکەی جارانیان لەگەڵ کوردەکاندا ئەوەیە کە: تاوەکوو لە ناکۆکییەکەیان لەگەڵ حکومەتی عێراقدان هەندێک یارمەتییان بدات.

دەوڵەتی بەریتانیای مەزن بەداخە لەهەر شەڕێک کە رەنگە لە باکوری عێراقدا رووبدات. تاکە چارەسەری کردارییی بۆ ئەم ناکۆکییە ئەوەیە کە بەرێککەوتنی هاوبەش لەنێوان حکومەتی عێراق و کوردەکاندا هاتبێتەکایەوە. دەست تێوەردان لەلایەن دەوڵەتی بەریتانیای مەزن یارمەتیدەر نابێت.

**پاشخان:**

لەکۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانییدا، ئەو ناوچەیەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست کە کوردەکانی تێدا نیشتەجێن بەسەر سنورە نێودەوڵەتییەکاندا دابەش کرا و، کوردەکان خۆیان لەوەدا بینییەوە کە بەسەر چەند جڤاتێکی دابڕێنراودا لەناو سنوری وڵاتانی تورکیا و ئێران و عێراق و سوریادا دابەش کراون.

پەیماننامەی سیڤر (١٩٢٠) مافی ئۆتۆنۆمیی بۆ کورد رەوا بینیووە، بەڵام پەیماننامەکە بەهۆی نارەزایی تورکیاوە هەرگیز قبوڵ نەکرا. لە ساڵی ١٩٤٦ز، لەژێر سەرکردایەتی بارزاندا کە سەرکردەی کوردەکانی عێراقە، کۆمارێکی سەربەخۆی کورد بەڵام کورتخایەن، لە باکوری خۆرئاوای ئێران دامەزرێنرا. کوردانی عێراق هەرگیز خەونی نیشتمانێکی سەربەخۆیان

فەرامـۆش نەکـردووە و لـە سـاڵی ١٩٥٨ەوە لـە چەنـد شـەڕێکی پچـڕ پچـڕدا لـە دژی حکومەتـی عێراقـدا بەشـدار بـوون، ئەمـەش لەپێنـاو دامەزرانـدن، یاخـود بەدەسـتهێنانی ڕێپێـدان بـۆ دامەزراندنـی دەوڵەتێکـی نیمچـە سـەربەخۆ.

٢. کـوردەکان بـەردەوام هەوڵیـان داوە دەوڵەتـی بەریتانیـای مـەزن لـەم ناکۆکییـەوە بگلێنـن، بـەڵام ئێمـە بـە تونـدی بـەو هەڵوێسـتە ئاشـکرایەمانەوە پابەنـد بوویـن کـە سـەرۆک وەزیـر لـە وەڵامـی پرسـیارێکی پەرلەمانـدا لـە حوزەیرانـی ١٩٦٥ باسـی لێـوە کـرد: "دەوڵەتـی بەریتانیـای مـەزن بەداخـە لـە شـەرەکانی کوردسـتان، هـەروەک چـۆن بەداخـە لەهـەر نائارامییـەک لـە خۆرهەڵاتـی ناوەڕاسـتدا، بـەڵام ئێمـە وەک پرسـێکی ناوخۆیـی عێـراق لـە پرسـی کـورد دەڕوانیـن، کـە شایسـتە نیـیـە بـۆ ئێمـە خـۆی تـێ هەڵقورتێنیـن".

سیاسـەتی دەوڵەتـی بەریتانیـای مـەزن سـەبارەت بـە وورووژاندنـی پرسـی مافەکانـی مـرۆڤ لـە نەتـەوە یەکگرتـووەکان:

٣. لە نوسـراوی دووەمی تەواوکارییدا هەموو ئەو لێدوانەی کە سـەرۆک وەزیر لـە مانگی حوزەیرانی ١٩٦٥دا پێشکەشـی کـرد، تۆمار نەکراوە. بـە لەبەرچاوگرتنی ئـەو سیاسـەتەی کـە لـە حوزەیرانـی ١٩٦٦ەوە سـەبارەت بـە باسـکردن لە پرسـی مافەکانـی مـرۆڤ لـە نەتـەوە یەکگرتووەکانـەوە گیراوەتـە بـەر، چیتـر شایسـتە نیـیە کـە بڵێیـن: ئـەم پرسـە لـە بنەڕەتـدا ڕەت کراوەتـەوە بەتایبەت کـە دەربارەی "بابەتـی ناوخۆیـی" وڵاتێکـی ئەندامی نەتـەوە یەکگرتووەکان بێت. پێمـان وایە: کاتێ شـێوازێکی بەردەوامـی پێشـێلکاریی لەئـارادا بێت، بەجۆرێک کە وەک سیاسـەتێکی گشـتی بێتـە بەرچاو، ئـەوا نەتـەوە یەکگرتـووەکان دەتوانێت بەشـێوەکی شـەرعی (یاسـایی) بابەتەکـە لەبەرچـاو بگرێـت. ئەگـەر لـە شـێوازێکی بـەردەوام یاخـود لـە سیاسـەتێکی گشـتی کەمتـر بێـت، ئـەوا ڕەنگـە بتوانرێـت بخرێتـە چوارچێوەی بڕگـەی یاسـای ناوخۆیـی میپاقـی نەتـەوە یەکگرتووەکانـەوە (مـادەی ٢ (٧))، جگە

لـەو حاڵەتانـەی کـە ئـەو تاکـە نموونەی پێشـێلکاریە بەشـێک بێـت لە سیاسـەتێکی گشـتی. بۆچونمـان لەسـەر ئـەم پرسـە بەڕوونـی لەلایـەن وەزیـری دەرەوە و لـە لێدوانێکـیدا لەبەردەم کۆمەڵەی گشـتیدا لە ١٤ی تشـرینی یەکەمی ١٩٦٨ راگەیەنرا. ناوبـراو گوتـی: "مـادەی ٥٦ی میپاقەکـە بەڕوونی باس لەوە دەکات کـە هیچ وڵاتێک ناتوانێـت بڵێـت مافەکانـی مرۆڤـی هاووڵاتییەکانـی بە تـەواوی پرسـێکی ناوخۆییە، ئـەو وڵاتـەی کـە هاووڵاتییەکانی لە مافـە سـەرەتاییەکانی مرۆڤ بێ بـەش دەکات، ئـەوا بەپێـی مـاددەی ٥٦ بڕیـارە نێودەوڵەتییەکانـی پێشـێل کـردووە". لەبـەر ئـەم هۆکارانـەی کـە لەخـوارەوە باسـیان دەکەیـن، پێمـان وانییـە کـە شایسـتە یاخـود یارمەتیـدەر بێت کە ئێمە پرسـی کورد لە کۆمسـیۆنی مافەکانی مـرۆڤ بوروژێنین.

٤. دەتوانیـن هۆکارەکانـی ئـەم هەڵوێسـتەمان لـەم خاڵانـەی خـوارەوەدا کورت بکەینەوە:

أ) کوردەکانـی عێـراق لـە دژی حکومەتێکـی یاسـایی لـە بەغـدا یاخـی بـوون و ئێمـە ئـەو حکومەتـە بـە ددانپیانـراو دەزانیـن.

ب) باشـترین ڕێگـا بـۆ بەدیهێنانـی بەرژەوەندیـی یـە سیاسـیی و بازرگانییەکانمـان ئەوەیـە: کـە راسـتەوخۆ مامەڵـە لەگـەڵ حکومەتـی بەغـدادا بکەیـن. مامەڵەکردنـی فەرمـی لەگـەڵ کـورد یاخـود کۆمەککردنیـان دەبێتـە هـۆی نارەحەتکردنـی زۆری حکومەتـی بەغـدا و، بۆیـە رەنگـە دژ بـەو هەوڵانـە بێـت کـە لەپێنـاو گەشـەپێدانی ئـەو بەرژەوەندییانـە دەدرێـن.

ج) ئەگـەر ئێمـە یارمەتـی کوردانـی عێـراق بدەیـن، ئـەوا رەنگـە ئێـران و تورکیا و سـوریا کـە ئەوانیـش کەمینـەی کوردیـان هەیـە، لێکدانـەوەی نادڵخۆشـکەری بـۆ بکـەن.

د) ئاڵۆزییەکانی پرسی کورد و ئەو هاوپەیمانییانەی کە سەبارەت بە پرسی کورد لەئارادان، ئەوا پشتیوانییەکی بەهێز لەو بۆچونە دەکەن کە لە دژی بەشداریکردنمانە لەم پرسەدا.

**مستەر ئۆرچارد**
**مستەر ئارمیتاژ**
**کێشەی کورد لە عێراق، ١٩٦٣ - ١٩٧١**

١. رەشنوسـە هاوپێچکـراوەکان بـۆ چاپکـردن ئامـادەن. ( لـە پشـتەوەی هـەر یەکەیانـەوە دوو خشـتەی دابەشـکردنم دانـاوە).

٢. دەبێـت پلەبەندیـی هـەردوو رەشنوسـەکە "نهێنـی - تەنیـا بـۆ بەرچـاوی شانشـینی یەکگرتـوو" بێـت. (دەزانـم کـە رەنگـە زۆر جـار وا بـە پەسـەند بزانرێت کە"تەنیـا پوختـە"ی راپۆرتـەکان بـە "نهێنـی" دابنرێـن، بـەڵام لـەم حاڵەتـەدا ئەگـەر بێتـو ئامـاژە بـە لایەنـی توانـای سـەربازیی یاخـود لایەنـی تـری نـاو راپۆرتەکـە نەدەیـن، بەشـێکی زۆری گرنگیـی راپۆرتەکـە لەدەسـت دەچێـت).

٣. بـە لەبەرچاوگرتنـی داواکارییەکـەی بەشـی خۆرهەڵاتـی نزیـک، کـە دەیانەوێـت راپۆرتەکـە بەخێرایـی چـاپ بکرێـت و پێـش هاتنـی کریسـمس بـڵاو بکرێتـەوە، پێشـنیار دەکـەم کـە داوا لـە کارمەندانـی چـاپ بکرێـت کـە دەسـتوبرد لـەم کارەدا بکـەن.

سی. جەی. ئێس. رەندڵ
٣ی کانونی یەکەمی ١٩٧١

**باڵیۆزخانەی بەریتانیا**
**کوەیت**
**٨ی ئایاری ١٩٧٣**
**بەڕێز جی ئێس بێرتن**
**بەشی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست**
**وەزارەتی دەرەوە و کۆمۆنوێڵز**

بەڕێز گراهام،

١. ئێستا کە لە کوەیتم دەمەوێت چەند زانیارییەک کە لە بەغداوەیە ئەوا لە نامەیەکدا بۆت بنێرم.

٢. جموجوڵی هێزەکان. پیتەر فیلد ئێستا لە لەندەنە و رەنگە دەرفەتی ئەوەت ببێ ببیبنیت. ئەو دەتوانێت جەخت بکاتەوە لەوەی کە دەنگۆی گواستنەوەی هێزەکان کە لە مانگی ئایاردا لە سنورەکانی ئێرانەوە بەرەو سنورەکانی کوەیت / سعودیە رەوانە کران (بڕوانە برگەی ١٤ی نامەکەم لە رۆژی ٢٩ی ئازار) دەتوانرێ بە جوڵەی ئاسایی هێزەکان لەم کاتەی ساڵدا لێک بدرێتەوە. چونکە لەگەڵ هاتنی هاویندا، ئەنجامدانی راهێنان لە بیاباندا زۆر نارەحەتە.

٣. سەدام حسێن. ئەو (لەگەڵ عەبدولباقی)دا لە سەردانەکەی وەزیری دەرەوەی رۆمانیا و سەردانەکەی سەرۆکی (چاد)دا بۆ بەغدا ئامادە نەبون.

عەبدولباقی بە پاساوی گونجاوەوە لە سویسرا بوو، هەموان دەیانزانی ئامادە نیە بەڵام نەیاندەزانی بۆچی. ئامادەنەبونەکەی سەدام حسێن بەتەواوی ناڕونە. باشترین لێکدانەوە ئەوەیە کە لەگەڵ بارزانیدا خەریکی وتووێژن لەبارەی ئۆتۆنۆمی بۆ کورد و راپرسییەوە. نزیکەی شەش هەفتەیە کە رۆژنامەکانی بەغدا سەبارەت بە کورد بێدەنگن. بەڵام لەوانەشە حسێن لە پشویەکی کورتدا بێت -لۆمەی دانوستانەکانی پرسی نەوتی خستە سەر خۆی و لەو کاتەوە بەئاشکرا زۆر چالاکە.

٤. باکوری عێراق. لە سەرەتای مانگی نیساندا لەگەڵ زۆرێک لە هاوکارانم لە بەغدا سەردانێکی (زۆر درەنگوەختم) بۆ شارە سەرەکییەکانی باکوری عێراق ئەنجامدا. باکوری عێراق لە بەهاراندا جوانە. گەنم و جۆی هەراش دەبینرێن و شەتڵی برنج کەروێشکە دەکەن. کۆنترۆڵی پۆلیس لەسەر رێگە شاخاوییەکان بە وریاییەوە ئەنجام دەدرێت بەڵام ئێمە لە گەشتەکەماندا توشی کێشە نەبووین. زۆرێک لە بنکەکانی پۆلیس بە هاوبەشی لەنێوان پۆلیسی مەدەنی و سەربازییدا بەڕێوەدەبرێت و نوێنەرێکی کوردیشی لێیە. بۆ وەرزی هاوین چەندین کەپر دروست دەکرێن، تەنیا لە سەڵاحەدین ٣٥٠ کەپر دروست کراوە. هەمو شتێک پێشوەخت بەکرێ دراوە. خاوەندارێتی زەوی لە ناوچە کوردییەکان تایبەتە بە کورد، بۆیە عێراقییەکان تەنیا دەتوانن بە کرێیان بگرن.

٥. لە کاتی جەژنی بەهاردا موسڵ پڕ بووبوو لە سەردانکەر و دیپلۆمات (نوێنەرە ئاست نزمەکانی زوربەی باڵیۆزخانەکانی لێبوون). بەڵام من بە فەرمی بانگێشت نەکرابوم بەشداریی لە جەژنەکەدا بکەم، ئەندامێکی بەشی پرۆتۆکۆڵ هاوسەرەکەمی لە هەترە (HATRA) بینیبو و سەرەڕای رەتکردنەوەمان، بەڵام پێداگری کرد کە وەکو میوانی وەزارەتی کاروباری

دەرەوە بەشـداریی نمایشـەکەی ئێـوارە بکـەن کـە تیایـدا میسـرییەکان گۆرانییـان دەگـوت و سـەمایان دەکـرد. ئەمـە هەنگاوێکـی دۆسـتانە بـوو.

٦. کەشـوهەوا زاڵەکـە لـە لێـواری ئـەو ناوچـە کوردییانـەی کـە سـەردانم کـردن بریتییـە لـە: بەهێزیـی و متمانەبەخۆبونێکـی زۆر کـە لـە هیـچ دانوسـتانێکدا لەگـەڵ عێراقییەکانـدا بـەرەو خراپـی ناچـن.

دڵسۆزی هەمیشەییت،

ئای. مەککلۆنی

**لەگـەڵ تێکچوونـی ڕێککەوتـن لەگـەڵ عێراقـدا، کـوردەکان ئامـادەی دەسـتپێکردنەوەی شـەڕن**

**جیم هۆگلاند**

**حاجی ئۆمەران - عێراق، ٢١ی حوزەیران**

**واشینتۆن پۆست**

دوایەمیـن شـەڕی خۆرهەڵاتـی ناوەڕاسـت سـێ سـاڵ لەمەوپێـش لـە عێـراق کۆتاییهـات، دوای ئـەوەی عێـراق تاوەکـوو بنبەسـت لـە چیـا سـەختەکاندا شـەڕی جەنگاوەرەکانـی کوردسـتانی دەکـرد و، دواجـار لەسـەر ڕێککەوتنـی ئاشـتی قایـل بـوو کـە تیایـدا ئـەو ئۆتۆنۆمیـە بداتـە بەرگریـکارە کـوردەکان کـە بـە درێژایـی ئـەم سـەدەیە لەپێناویـدا جەنگـاون، بـەڵام مـەلا مسـتەفا بارزانیـی کـە کـە فەرمانـدەی پارتیزانـە کوردەکانـە لـە بارەگاکەیـدا لـە چیـا دوورەدەسـتەکانی باکـوری خۆرهەڵاتـی عێـراق بـاس لـە پەیوەندییەکانـی لەگـەڵ عەرەبـدا دەکات و دەڵێـت: لـە هەمـوو جێگایـەک سیاسـەتی نـە شـەڕ و نـە ئاشـتی گیراوەتـە بـەر ..

جەنـەراڵ بارزانـی کـە تەمەنـی حەفتا سـاڵە، بە درێژایی ئەم سـەدەیە سـەرقاڵی شـەڕی تـورک و فـارس و عێراقییـەکان و بەریتانیـا و ئـەو خێڵـە ناوچەییەیانـە بـووە کـە دژی دەسـەڵاتەکەی بـوون. ئـەو چیتـر هەسـتەکانی خـۆی ناشـارێتەوە لـەوەی کـە خەریکـە شـەڕێکی نـوێ لەنێـوان نیشـتمانپەروەرە کوردەکانـی چیـاکان و نەتەوەپەرسـتە عەرەبەکانـی بەغـدا ڕوودەدات. ڕێککەوتنەکـەی سـاڵی ١٩٧٠ کـە بەڵێنـی خۆبەڕێوەبەرێتیـی و پاراسـتنی بـۆ کـوردەکان تێـدا بـوو لـە لەناوچوندایـە و، پێشـمەرگە پارتیزانـەکان جوڵەیـان دەسـتپێکردووەتەوە.

## بەدەستهێنانی چەک:

چەکـی دژە فڕۆکــە بــە چــواردەوری ئــەو کەمپانــەدا جێگیرکــراون کــە لــە چــادری ســپی پێکهاتــوون. لــە دامێنەکانــی نزیکییــەوە پشــمەرگە تــازەکان راهێنان لەســەر ئــەو تۆپخانــە رووســیانە دەکــەن کــە لەپێشــتر دا لای عێراقییەکانــەوە دەســتیان بەســەردا گرتــووە.

کــوردەکان کــە گەلێکــی ئاریــن و مێژوویەکــی چــوار هــەزار ساڵەیان هەیــە و، لــە ناوچەیەکــی ســتراتیجی دەشــت و چیــادا دەژیــن کــە بــە ســنورەکانی تورکیــا و ســوریا و عێــراق و ئێرانــدا درێــژ دەبێتــەوە، ناوچەیەکــی کوردیــش لــە یەکێتــی ســۆڤیەت هەیــە. هەمــوو ئــەم حکومەتانــە بــە وریاییــەوە لــە کردارەکانــی جەنەراڵ بارزانــی دەروانــن.

جەنــەراڵ بارزانــی کــە لــە میوانخانــە رووتەڵەکەیــدا لــە حاجــی ئومــەران دانیشــتبوو، بایەکــی ســاردی شــەوانە بــە چیاکانــدا دەهــات، داوایەکــی راســتەوخۆی بــۆ پشــتیوانی ئەمریــکا نیشــان دا بــۆ "ئــەم گەلــە بچوکــە لــە خەڵکــی هــەژار و ســتەملێکراو. دەکرێــت ئــەم پشــتیوانییە سیاســیی یاخــود مرۆڤایەتیــی یاخــود ســەربازیی بێــت و، ئاشــکرا بێــت یــان نهێنــی".

لــە ئاشــکراکردنی ئــەوەی ... خۆماڵیکردنــی ئــەو کێڵگــە نەوتییانــەی کــە خۆرئاواییــەکان خاوەنــی بــوون ..

کاتێــک حکومــەت ســێ مانــگ لەمەوبــەر لەگــەڵ کۆمپانیــا نەوتییــە خۆرئاواییــەکان گەیشــتە .. جەنــەراڵ بارزانــی وتــی : .. "ئێمــە بەڕاســتی لەگــەڵ سیاســەتی ئەمریکادایــن بــۆ ناوچەکــە، ئەگــەر ئەمریــکا دژ بــە دورگــەکان بمانپارێزێــت، ئەگــەر ئــەو پشــتیوانیە ببــێ..... ئەمــە لــە ناوچــەی ئێمەدایــە...

## دژایەتی رووسییەکان:

جەنگــاوەرە بۆشــاییەکەی چیــاکان جەختــی لــەوە کــردەوە کــە: "ئێمــە لــە خۆرهەڵاتــی ناوەڕاســتدا پێگەمــان هەیــە". کــوردەکان بــە تونــدی دژی

بڵاوبوونـەوەی رووسـیان و بەشـێکی زۆری هێزەکـەی عێراقیـان ناچـار کـردووە کـە کات و پـارە و سـەرچاوەکانی لـە زەوییـە بەرزەکانـی کوردسـتاندا سـەرەف بـکات، کـە ئەگـەر وا نەبوایـە ئـەم هێزە لـە دژی ئێـران و کوەیـت یاخود ئیسـرائیل بەکاردەهێنـران.

کـوردەکان کـە لـە کێڵگـە بچوکەکانیانـدا دەژیـن لـە رێگـەی زمانـی هاوبەشـی هینـدۆ ئەوروپیـی و ئاینـی سـونەی ئیسـلام و نەتەوەگەرایـی و کلتورێـک پێکـەوە بەسـتراون، کـە چەندیـن سـەدەیە لـە نـاو کودەتـای خوێنـاوی و ناپاکـی دان ....

لـەدوای دارمانـی ئیمپراتۆریەتـی عوسـمانی ئـەو بەڵێنـەی کـە پێیـان درابـوو سـەبارەت بـە دروسـتکردنی نیشـتمانێکی ئۆتۆنـۆم لەلایـەن زلهێزەکانـەوە دەسـتبەجێ فەرامـۆش کـرا. تورکیـا خێڵـە کوردەکانـی لەتوپـەت کـرد و بەردەوامـە لـە رەتکردنـەوەی سـەربەخۆیی یاخـود ئۆتۆنۆمـی کلتـوری بـۆ ئـەو کەمینـە کوردییـەی کـە سـێ ملیـۆن کەسـە. ئێرانیـش کوردەکانـی لـە سیسـتمێکی سیاسـیی زۆر مەرکەزیـدا قەتیـس کـردووە.

بۆیـە جەنـەراڵ بارزانـی دەگاتـە ئـەو بەرئەنجامـەی کـە بڵێـت: خەونـە کۆنەکـەی کوردسـتانی گـەورە ئێسـتا مـردووە. ئامانجەکانـی بـە گوتـەی خـۆی لە عێراقدایـە کـە حکومەتێکـی لاوازتـری عـەرەب هەبێـت کـە نەتوانێـت دراوسـێکانی ناچـار بـکات کـە پرسـی نەتەوایەتـی کـورد سـەرکوت بکـەن.

کوردسـتانی عێـراق نیشـتمانێکی زۆر جوانـە و هـەژار و دواکەوتـووە. بەرزتریـن لوتکـەی چیاکانـی زاگـرۆس لـە وەرزی هاوینیشـدا بەفریـان پێوەیـە. جۆگەلـەکان بەنـاو دۆڵەکانـدا خورەیـان دێـت و بـە بەنداوەکانـدا تێپـەڕ دەبـن تـا دەگەنـە دەشـتە رووتەنـەکان، کـە تیایـدا گەورەتریـن شـارە کوردییـەکان جێگیربـوون.

لـە دەشـتەکاندا سـوپای عێراقیشـی لێیـە، شـارە کوردییەکانـی کۆنتـرۆڵ کـردووە و بـە وتـەی کـوردەکان بـە بـێ دەنگـی سـەرقاڵی دروسـتکردنی یەکـەی هەلیکۆپتـەر و پەڕەشـوتەوانە، کـە رەنگـە لـە مانگـی ئـازاری داهاتـوودا کـە کاتـی

جێبەجێکردنی ئۆتۆنۆمییە بەڵێندراوەکەیە بخرێنە گەڕ.

کوردەکان بۆچوونی خۆیان سەبارەت بە چۆنێتی ئۆتۆنۆمییەکە داوەتە بەغدا، بە گوتەی سەرکردەیەکی سیاسیی کورد مەحموود عوسمان و حەبیب کەریم، ئەوان پێشنیارییان کردووە کە ئەنجومەنێکی یاسادانان بۆ کوردستان هەڵبژێردرێت کە دەسەڵاتێکی ڤیتۆی سنورداری بەسەر چەند بڕیارێکی حکومەتی ناوەندیدا هەبێت.

جەنەراڵ بارزانی هیچ هیوایەک نابینێت کە داواکارییەکانی کورد قبوڵ بکرێن، ئەو ئامادەیە بەردەوامیی بە وتووێژەکە بدات بۆ ئەوەی کاتی دەست بکەوێت و هێزەکانی کۆبکاتەوە.

جەنەراڵ بارزانی دانی بەوەدا نا کە هێزەکانی یارمەتی سیاسیی و سەربازییان لە ئێران وەرگرتووە، بەڵام رەتی کردەوە وردەکاری زیاتر بدات.

چەند ئاماژەیەک هەن کە ناوبراو هەندێک یارمەتی سەربازیی و دارایی لە ئیسرائیل وەرگرتبێت. کاتێک لەم بارەیەوە پرسیاری لێ کرا، بەشێوەیەکی چاوەڕواننەکراو گوێی راگرت و دواجار گوتی: "هەندێک شت هەیە کە لەوانەیە راست بن، بەڵام وا باشترە کە قسەیان لەبارەوە نەکرێت".

لەگەڵ ئەوەشدا بارزانی بە ئاشکرا دانی بەوەدا نا کە ئامادەیە یارمەتییەکانی ئەمریکا لە رێگای ئێران یان ئیسرائیلەوە وەربگرێت.

ئەو دەڵێت: "ئەگەر ئەمریکییەکان ئەم کارە بە کارێکی لۆجیکی و کردەنی بزانن، ئەوا ئێمە قبووڵی دەکەین. بەڵام وا باشترە کە ویلایەتە یەکگرتووەکان راستەوخۆ یارمەتییەکە بدات".

**لیژنەی ئامادەکاریی پارتی شۆڕشگێڕی کوردستان**
**٢٦ی حوزەیرانی ١٩٧٣**

پارتی شۆڕشگێڕانی کوردستان لە بڵاوکردنەوەی ئەم چاوپێکەوتنە رۆژنامەوانییەدا جەخت لە هەڵوێستە رەواکەی دەکاتەوە بەرامبەر بە ملکەچبوونی رەهای بارزانی بۆ ئیمپریالیزم لەژێر سەرکردایەتی ویلایەتە یەکگرتووەکاندا، هەروەها دەربارەی بازرگانیکردنییەوە بە مەسەلەی کوردەوە و، خستنەڕووی بابەتەکە لە مەزاتخانە نێودەوڵەتییەکان و، دانانی لە خزمەت بەرژەوەندیەکانی ئیمپریالیزمدا و، دژایەتیکردنی بزووتنەوە رزگاریخوازەکانی کورد بەهۆی بیروباوەڕە پێشکەوتنخواز و دیموکراتیەکەیانەوە. لەبەر ئەم هۆکارە بارزانیی جەنگاوە و تا ئێستاش دەجەنگێت دژ بە هەموو ئەو کەسە راستگۆ و پێشکەوتنخوازانەی کە لە ریزەکانی شۆڕشی کورددان، یاخود لە ریزەکانی پارتی شۆڕشگێڕی کورددان کە پارێزی راستەقینەی گەلی کورد و بزوتنەوە رزگاریخوازەکەیەتی.

ئەمە یەکەمجار نییە بارزانی لێدوانی لەمجۆرە دەدات. رۆژنامە ناوەندییەکەیان لەپێش ئازاری ١٩٧٠دا لێدوانی دیکەی لەمجۆرەی بڵاوکردووەتەوە. بەڵام ئەمجارەیان بوێرییەکی زیاتری نیشان داوە چونکە ناسنامەی راستەقینەی خۆی هەڵماڵیوە .

بارزانی گوتوویەتی "وا پێدەچێت عەرەبەکان سیاسەتی نە شەڕ و نە ئاشتییان بەلاوە پەسەند بێت ...". ئەگەر ئێمە بارودۆخی کوردستانی عێراق لەبەرچاو بگرین ئەوا بە ڕوونی دەبینین کێ سود لەم سیاسەتی نە شەڕ و نە ئاشتییە دەبینێت لە کوردستاندا. ئەوکەسەش بارزانیی و تاقمەکەیەتی

چونکە لەڕێگەی سیاسەتێکی لەمجۆرەوە دەتوانێت دەسەڵاتی ڕەها بەسەر کوردستانی عێراقدا بسەپێنێت و بەوجۆرەی حەزدەکات بەڕێوەی بەرێت، جگە لەمەش، حکومەتی عێراق بڕێکی خەیاڵی دەداتێ بە ناوی جیاجیاوە هەر لە نەسرییەوە بۆ بارەگاکانی تاوەکوو موچەی پاسەوانی سنور، نەسرییە بۆ پێشمەرگە دورخراوەکان و بۆ خێزانی ئەوانەی لە شەڕەکاندا کوژراون، ئەمە سەرەڕای ئەو کۆمەکە داراییە دەرەکییانەی کە پێش بەیاننامەکەی ئازار و تائێستاش وەریدەگرێت ..

کەواتە، بارزانی چاوەڕوانی چی دەکات (شەڕێکی دیکە لەنێوان کورد و عەرەبدا)، لە کاتێکدا دەسەڵات لە کوردستان تەنیا و تەنیا دراوەتە دەست خۆی تاوەکوو لە ڕێگەی کوشتن و وەدەرنانی خەڵکەوە وێرانی بکات؟ پێدەچێت ئەم چاوەڕوانییانەی لە بازنە ئیمپریالیست و زانۆینیستەکانەوە پێگوترابێت کە حەز ناکەن ئارامیی و یەکریزی نەتەوەیی کورد ببینن و نایانەوێت کورد بە مافە یاساییەکانی خۆی لە عێراقدا شاد بێت.

بە پێی لێدوانەکەی بارزانی: "ئامانجەکانی تەنیا لە عێراقدا دەبینرێن". ئێمە هیچ گومانمان لەو راستییە نییە کە بارزانی هیچ ئامانجێکی نییە ... ئامانج ئەو ئاوات و ویستە نەتەوەییانەیە کە ئەگەر ئەو هەیبووایە دەبوو بەشەکانی دیکەی کوردستانیش لەبەرچاو بگرێت کە تائێستاش کورد تیایاندا لە سادەترین مافە نەتەوەییەکان و مافەکانی مرۆڤ بێبەشن، بە پێچەوانەی ئەو پارچەیەی کوردستانەوە کە کەوتووەتە ناو کۆماری عێراق و کورد مافی نەتەوەیی گەورەی پێ دراوە و، لەرێگەدایە کە لە چوارچێوەی کۆماری عێراقدا ئۆتۆنۆمی بەدەست بهێنێت، داوا جددییەکەی بارزانی بۆ ئەمریکا کە بە ناوی "نەتەوەی بچوکی کورد کە لە خەڵکانی زوڵم لێکراو و هەژار پێکهاتوون" بۆ درێژکردنەوەی هاوکاریی، ئامانج لێی کەڵەکەکردنی زیاتری پارەیە لە بانکەکانی جیهان بۆ تێرکردنی تەماحەکەیەتی کە کۆتایی نایەت ..

سەبارەت بە "رەتکردنەوەی ئەو خۆماڵیکردنە لە ناکاوەی کە لە کێڵگە نەوتییەکانی کەرکوک لە مانگی حوزەیراندا ئەنجامدرا"، ناوبراو بەڵێنی داوە هەرکاتێک دەستی بەسەردا بگرێت - بە هاوکاری ئەمریکا- بیگەڕێنێتەوە بۆ کۆمپانیایەکی ئەمریکی، ئەمەش شتێکی تازە نییە چونکە دوژمنایەتییەکەی ناوبراو بۆ بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد و بۆ هەموو شتە پێشکەوتنخوازەکان وای کردووە ببێتە جمکی ئەو کۆمپانیا ئیمپریالیستانەی کە هۆکاری سەرەکی ئەو نەهامەتییانەن کە لە مێژووی نوێدا بەسەر کورددا هاتوون.

سەبارەت بە راگەیەنراوی جەنگاوەرانی چیاکان، رۆژنامەنوسەکە دەڵێت "ئێمە لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا یەکێکین لە بکەرەکان .. کورد بە توندی دژی بڵاوبوونەوەی کاریگەری رووسیایە .. ئەوان بڕێکی زۆری سوپای عێراق ناچار دەکەن کە کات و پارە و سەرچاوەیەکی زۆر لە بەرزاییەکانی کوردستاندا سەرف بکات".

بزوتنەوەکەی بارزانی وەکوو پێکهێنەرێکی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، وەکوو لەوەرگایەک بۆ ئیمپریالیزم و بەکرێگیراوەکانی، هەروەها ئەو دوژمنایەتییەی کە بەرامبەر بە کاریگەریی رووسیا هەیەتی - کە لە کوردستانی عێراقیشدا بوونی نییە و- ئەو سەرنج و پەرتکردنەی سوپای عێراق کە هەموو وزەکانی لە شەڕی براکوژیدا سەرف بکات، هەموو ئەم شتانە ئەوەن کە بارزانی لەپشت بزوتنەوە خێڵەکییەکەوە دەیخوازێت. بەدیهێنانی ئۆتۆنۆمی بۆ کورد و دیموکراسیی بۆ عێراق شتێکە هەرگیز بە مێشکی بارزانیدا نایەت. دەستکەوتی لەم جۆرە بە پاڕانەوە لە ئەمریکا کە دوژمنی خەڵک و بزوتنەوە رزگاریخوازەکانە بەدەست ناهێنرێت ..

کۆمەڵانی خەڵکی شۆڕشگێڕ، پیلانی ئیمپریالیستەکان و زایۆنیستەکان و بەکرێگیراوانی دواکەوتووخوازیی و هاوپەیمانە دوژمنکارەکان لە دژی کۆماری عێراقمان یەکیان گرتووە بۆ ئەوەی حکومەتە پێشکەوتنخوازەکەی

عێـراق رابماڵـن و کاریگەریـی خۆیـان لـە رێگـای کۆمپانیـا نەتـەوە قۆرخکارەکانـەوە بسـەپێنن کـە سـامانەکانمان دەدزن و و بـە دەسـتکەوتەکانی گەلـی عێراقمـان "کـورد و عـەرەب" نارەحەتـن، بۆیـە پێویسـتە هەمـوو هێـزە پێشـکەوتنخوازەکان لـە یـەک بـەرەدا یەکبگـرن دژی ئـەم پیلانانـە و خۆیـان رێکبخـەن و پەلـە بکـەن لـە دامەزراندنـی بەرەیەکـی نیشـتمانیی پێشـکەوتنخوازدا، راگەیەندراوەکـەی ئـازار وەک خـۆی جێبەجـێ بکـەن، ئۆتۆنۆمـی بـە کوردسـتانی عێـراق ببەخشـن لـە رێگـای کۆمەڵانـی خەڵکـی شۆڕشـگێڕەوە نـەوەک لـە رێـی هێـزە دواکەوتووخوازەکـەوە کـە دژی رێوشـوێنە شۆڕشـگێڕەکان و هەمـوو چارەسـەرێکی ریشـەیی کێشـەکانە.

لیژنەی ئامادەکاریی پارتی شۆڕشگێڕی کوردستان
٢٦ی حوزەیرانی ١٩٧٣

**نهێنی**
**باڵیۆزخانەی شاهانەی سوید**
**هۆبەی بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا**
**بەغدا**

**بەڕێز جی. ئێس بێرتن**
**بەشی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست**
**وەزارەتی دەرەوە و کۆمۆنویڵز**
**لەندەن**
**رۆژ: ٢٨ی حوزەیرانی ١٩٧٣**

بەڕێز گراهام،
عێراق - کورد

١. هەندێ ورتەورت لەبارەی ناکۆکی لەنێوان بەعس و کوردەکاندا لەئارادایە.

٢. راپۆرتە پچڕپچڕەکان لەبارەی شەڕەکان لە باکوردا ماوەیەکە دەگەنە جێ. لە ناوەڕاستی ئایاردا وەزیری رۆشنبیریی ئەڵمانیای خۆرئاوا کاتێ سەردانی شارۆچکەی عەین سفنەی دەکرد، ئەوا خۆی لەناو ئابلۆقەی پەنجا چەکداری کورددا بینییەوەو، کاتێ (کارتڕایت) هەوڵی دا سەردانی هەمان شوێن بکات لە میانەی گەشتێکی بارزگانیدا لە ٥ی حوزەیراندا،

ئـەوا شـۆفێرەکەی ئامۆژگاریـی کـرد کـە ئـەو کارە نـەکات و پێـی گوتبـوو: بـۆ یارمەتیدانــی خەڵــک چــەک هێنراوەتــە نزیکــی شــارەکان.

٣. بـاس لـەوە دەکرێـت لـە ڕۆژی ٢٠ی حوزەیرانـدا دوو فڕۆکـەی میـگ بـە ناپاڵـم هێرشـیان کردۆتـە سـەر گوندێـک لـە نزیـک سـنڵێ (SINLE).

٤. دیـارە جەنـەراڵ بارزانـی چاوپێکەوتنێکـی ئەنجامـداوە لەگـەڵ پەیامنێرێکـی ئەمریکیـدا بەنـاوی هۆگلانـدەوە، کـە تیایـدا باسـی لـە هەڵگیرسـانی شـەڕێکی دیکـە کـردووە لەنێـوان کـورد و بەعسـدا و، بانگێشـتی ئەمریکییەکانـی کـردووە کـە یارمەتـی کـورد بـدەن و ئەگـەر پێویسـتی کـرد یارمەتییەکـە بـا لـە ڕێگـەی ئێـران و ئیسـرائیلەوە بێـت.

٥. تــا ئێســتا بەعــس بــە هێواشــیی بەرامبــەر بــەم هێرشــە یەکلایەنەیــە کاردانــەوەی نوانــدووە. حزبــی شۆڕشــگێڕانی کــورد (کــە نەیــاری پدکــە) ڕاگەیەنراوێکیــان بــڵاو کردۆتــەوە کــە وتارەکــەی هۆگلانــد ڕەت دەکاتــەوە و، ئەلســەورە ئــەو وتــارەی بــە زمانــی عەرەبــی بــڵاو کردۆتــەوە و داوای ڕونکردنــەوەی لــە بارزانــی کــردووە.

(تـا ئێسـتا لـە ئەلتەئاخیـدا کـە ڕۆژنامـەی پدکـە، هیـچ کاردانەوەیـەک نەبـووە، بـەڵام لـە سـەروتارێکی پڕلەکینـەدا کـە لەبـارەی سـەردانەکەی سـەرۆک بەکـر بـۆ بولگاریـا و پۆڵەنـدا بڵاوکراوەتـەوە پێشـنیاری ئـەوەی تێـدا هاتـووە کـە دەبـو تیمەکـەی سـەرۆک لـە عـەرەب و کـورد پێـک بهاتبایـە.)

دڵسۆزی هەمیشەییت،

ئای. مەککلۆنی

**وەرگێڕانی ئەلتەئاخی رۆژی ١ی تەموزی ١٩٧٣**
**ڕوونکردنەوەیەک بۆ رای گشتی عێراق و عەرەب**
**سەبارەت بە لێدوانێک کە دراوەتە پاڵ سەید ئەلبارزانی**

سەرچاوەیەکی رێگەپێدراو لە مەکتەبی سیاسیی پارتی دیموکراتی کوردەوە ئەم لێدوانەی بە رۆژنامەکەمان راگەیاند:
رۆژنامەی ئەمریکان هێراڵد تریبیون، لە ژمارەی رۆژی ٢٢ی حوزەیرانی ١٩٧٣ دا لێدوانێکی بەناوی سەید ئەلبارزانی، سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردمانەوە لەلایەن جیم هۆگلاندی پەیامنێرییەوە بڵاو کردۆتەوە.

بۆ ڕوونکردنەوەی راستییەکان، ئێمە رایدەگەیەنین کە ئەو وتووێژەی کە لەگەڵ پەیامنێری ناوبراودا هەبووە سەبارەت بووە بە رێکەوتنەکەی ئازار و راددەی جێبەجێکردنەکەی، هەروەها ئەو لەمپەرانەی لەبەردەم جێبەجێکردنەکەدان، بارودۆخی گەلی کوردمان لە عێراق و ئەو کێشە و دواکەوتویی و بێبەشییانەی پێوەی دەناڵێنن باس کرا، هەروەها باس لە پێویستبوونی کوردستان بە پەرەپێدان و بەرزکردنەوەی ستانداردی کلتوری رۆشنبیریی و کۆمەڵایەتیی هاووڵاتییانی کرا.

ئەو بابەتانەی دیکەی لە لێدوانەکەدا هاتووە و دراوەتە پاڵ سەید ئەلبارزانی، هەرگیز باسیان لێوە نەکراوە.
ئومێدەوارین هەمووان لەوە تێ بگەن کە بۆچوونەکانی بارزانی لە رابردودا روون و راستگۆیانە بووە سەبارەت بە پەیوەندییە برایانەکەی

نێوان عەرەب و کورد و، هەروەهاش دەمێنێتەوە، هەروەها هەوڵەکانی ناوبراو لەپێناو تۆکمەکردنی برایەتی نێوان ئەو دوو نەتەوەیە لەسەر بنەمای ددانپیانانی مافە نەتەوەییەکانی گەلی کوردمان لەچوارچێوەی یەکێتیی نیشتمانییدا بەردەوام دەبێت.

بروامان وایە کە خستنە پاڵی لێدوانی لەمجۆرە بە سەید ئەلبارزانی، ئەوا کار ناکاتە سەر ئەو هەوڵە راستگۆیانەیەی کە لە پێناو جێبەجێکردنی رێکەوتنەکەی ئازار و، پتەوکردنی یەکێتیی نیشتمانیی و، بەهێزکردنی برایەتی راستەقینە لەنێوان عەرەب و کورد و کەمە نەتەوەییەکانی تردا دەیدات.

**باڵیۆزخانەی شاهانەی سوید**
**هۆبەی بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا**
**بەغدا**

**بەڕێز جی. ئێس بێرتن**
**بەشی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست**
**وەزارەتی دەرەوە و کۆمۆنوێڵز**
**لەندەن**
**رۆژ: ٢ی تەموزی ١٩٧٣**

**بەڕێز گراهام،**
**عێراق – کورد**

١. سەبارەت بە نامەکەی رۆژی ٢٨ی حوزەیرانم، رۆژنامەی ئەلتەئاخی پارتی دیموکراتی کوردستان لێدوانی لەسەر وتارێکی هۆگلاند داوە بەوەی کە زۆرێک لە ناوەڕۆکەکەی بەهەڵە باسکردنە لە بارزانی.

٢. تەواوی وەرگێڕانەکە هاوپێچ کراوە. رستە گرنگەکە کە دەتوانرێت وەکو داواکارییەکەی بارزانی بۆ کۆمەکی ئەمریکا ئاماژەی پێ بکرێت ئەمەیە کە دەڵێت "سەبارەت بەو بابەتانەی دیکە کە لە راگەیەندراوەکەدا هەن و دراونەتە پاڵ سەید ئەلبارزانی، هەرگیز باسیان لێوە نەکراوە".

٣. یەک دوو دیپلۆماتکار لێرە پێشنیاری ئەوەیان کردووە کە: بارزانی لە ئێستادا بۆتە پیاوێکی پیر و رەنگە بە بەراورد بە ساڵی رابردو، سیاسەتمەدارێکی ئەوەندە جێی متمانە و شارەزا نەبێت.

دڵسۆزی هەمیشەییت،
ئای. مەککلۆنی

کۆتایی

وێنەیەک بۆ: بەڕێز تاران

**جی پی ئێس ١٥٠**
**بەپەلە**
**سی ئەی تی ئەی**
**لە تارانەوە ٠٢١٠٠٠٢**
**نهێنی**
**بەپەلە: بۆ وەزارەتی دەرەوە و کۆمۆنوێڵز ژمارە ٥٥٢ ی ٢ی تەموزی ١٩٧٣**

راپۆرتتان ژمارە ٣٣٣: ناوخۆی عێراق

١. راپۆرتــە رۆژنامەییــەکان لەبــارەی شــەڕی چڕوپــڕی نێــوان کــورد و عێراقییــەکان لــە باشــترین حاڵەتــدا زیادەڕەوییەکــی زۆری تێدایــە و لــە خراپتریــن حاڵەتیشــدا هەڵــە و دروســتکراوە. ئێمــە دەزانیــن کــە رۆژنامــە ئێرانییــەکان پێیــان گوتــراوە کــە ئــەم شــتانە دروســت بکــەن، بــەڵام بــە روونــی نازانیــن هــۆکاری ئــەم کارە چیــە. رەنگــە بــۆ ئــەوەی بێــت کــە عێراقییــەکان تــێ بگەیەنــن کــە کارتــی کــورد هێشــتا لــە دەســتی ئەماندایــە، ئەمــەش لەپێنــاو بەهێزکردنــی پێگــەی مامەڵەکردنــی ئێــران لــە دانوســتانەکانی داهاتویانــدا لەگــەڵ عێــراق.

٢. لــە وەڵامی پرســیاری رۆژنامەکانــدا هێڵێکــی بێلایەنمان گرتــووە و گوتومانە کــە هیــچ بەڵگەیەکمــان لــەلا نیــە کــە بڵێیــن: شــەڕەکە لــە کاتــی ئاســایی زیاتــر بــووە!، جــار جــارە لێــرەو لــەوێ شــەڕ لەنێــوان کــورد و هێزەکانــی حکومەتــدا رودەدەن.

٣. مانشـێتی ئەمـڕۆی رۆژنامـەکان لەبـارەی هەوڵـی کودەتایەکـەوەن کـە لـە عێـراق ئەنجـام دراوە بـەڵام بـە ئاشـکرا دەردەکەوێـت کـە ئـەم راپۆرتانـە هیـچ نەکەوتونەتـە ژێـر کاریگەریـی ئێرانییەکانـەوە. ئـەوان لـە بەیروتـەوەن و راگەیەنـدراوە فەرمییەکانـی عێـراق بـە بەڵگـە دەهێننـەوە.

ئێلینگوۆرت

دۆسیەکان

MED

PUSD

مستەر پارسنز

مستەر رۆز

بەشی هەواڵ

**نهێنی**
**باڵیۆزخانەی شاهانەی سوید**
**هۆبەی بەرژەوەندییەکانی بریتانیا**
**بەغدا**

**بەڕێز جی. ئێس بێرتن**
**بەشی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست**
**وەزارەتی دەرەوە و کۆمۆنوێڵز**
**لەندەن**
**رۆژ: ٦ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٣**

بەڕێز گراهام،
ئۆتۆنۆمی بۆ کورد

پێدانی ئۆتۆنۆمی بە کورد لە ١١ی ئازاری ١٩٧٠دا بە سەختترین و گرنگترین کێشە دادەنرێت کە لە ئێستادا حکومەتی بەعس لە بەغدا روبەڕوی دەبێتەوە. پوختەیەکی زۆر باشی هەڵوێستی هەردو لایەنەکە لە ناو بڵاوکراوەی "جیهانی عەرەبی"دا لە رۆژی ١٤ی ئەیلولی ١٩٧٣دا بڵاو کراوەتەوە. بۆ ئاسانکردنی ئاماژەپێکراوەکە، نوسخەیەک هاوپێچ دەکەم.

٢. وتارەکە لەو شوێنەوە دەست پێ دەکات کە حکومەت رەشنوسی پلانی ئۆتۆنۆمییەکەی پدکی رەت کردۆتەوە لەسەر ئەو بنەمایەی کە

کوردەکان خوازیار بون یاسا پێشنیارکراوەکانی خۆیان لە ناوچەکانی خۆیان دا کارپێکراو بن، ئەگەرچی لەگەڵ یاساکانی وڵاتدا ناکۆک بن. بەدڵنیاییەوە بەگشتی حزبی بەعس هەمو جۆرە پێشنیارێک رەت دەکاتەوە کە کوردەکان بخاتە پایەیەکی بەرزترەوە یاخود لە ئاستێکدابن کە لە دەرەوەی دەسەڵاتی دەوڵەتی عێراقییەوە بن.

٣. بەدڵنیاییەوە پدکیش "بەشداریکردنی بەرواڵەت"ی لە ئەنجومەنی گەل و بەرەی نەتەوەییدا رەتکردۆتەوە و بەو دەرفەتانە قایل نین کە لە رێگەی ئەنجومەنی وەزیرانەوە خراوەتە بەردەمیان. پێیان وایە: بەشداریکردن لە دامەزراوەی لەمجۆرەدا دەرفەتێکە بۆ بەعس کە کۆدەنگی و پشتیوانیی زیاتر بۆ سیاسەتەکانی خۆی بەدەست بهێنێت. پدک لە خاڵی هێزییەوە قسە دەکات، لەو رووەوە کە هێشتا چەند ناوچەیەکی شاخاوییان لە ناو وڵاتدا بەدەستەوەیە و پێناچێت دەستی لێ هەڵبگرن.

٤. بەڵام لەوەدا کە حکومەتی بەعسیش دەستپێشخەریی و پارەی بەدەستەوەیە ئەوا بەهێزە. ئێستا کە بەرنامەکەی پدک رەت کراوەتەوە، وتەی "کاربەدەستێکی باڵای عێراقی" وەرگیراوە کە دەڵێت "ئێمە بەرنامەکەی خۆمان ئامادە دەکەین" و ئەگەر پێویستیش بکات "لەو شوێنانەی لە کۆنترۆڵی ئێمەدان پیادەی دەکەین. ئەگەر هەندێ ناوچە یاخی بون، ئەوا جڵەویان دەکەین و دەیانهێنینەوە ژێر کۆنترۆڵی دەوڵەت." ئەم لێدوانە توندە ئامادەیی سوپا دەردەخات بۆ بەشداریکردن لە مامەڵەی سەربازییدا.

٥. پێدانی پشکی زیاتر بۆ کورد زیان بە حکومەتی ناوەند دەگەیەنێت، لەو رووەوە کە تا ئێستا رێگەیان داوە زۆرێک لە بەندەکانی مانیفێستۆی ١١ی ئازار جێبەجێ بکرێت. زمانی کوردی لە قوتابخانەکاندا دەگوترێتەوە، ئەو

خێزانانـەی نەهامەتیـان بەدەسـت شـەڕەکەوە چەشـتووە نیشـتەجێ کراونەتـەوە و قەرەبووشـیان پـێ دراوەتـەوە و، لـە ناوچـە کوردییەکانـدا کاربەدەسـتی کـورد دامەزرێنـراون. رەنگـە ئـەم هەنگاوانـە و لەگەڵیـدا پێدانـی دەرفـەت بـە پـدک کـە لـە حکومەتـی ناوەندیـدا بەشـداری بـکات لاوازبونـی پەیوەندییەکانـی نێـوان باڵـی مەدەنـی و باڵـی سـەربازیی حزبـی بەعسـی لـێ کەوتبێتـەوە، و هەروەهـا وای لـە کـورد کردبێـت متمانـەی بەخـۆی زیاتـر بێـت و کەمتـر هاوکاریـی بـکات.

٦. ئەگــەر یەکپارچەیـی حزبـی بەعـس بکەوێتــە مەترسـییەوە، ئــەوا رەنگــە بەعـس بەرنامــەی تایبەتـی خـۆی دابڕێژێـت و پیـادەی بـکات و، گوێ بـەوە نەدات کـوردەکان لـەو ناوچانــەی بەدەسـتیانەوەیە پێـی نـاڕازی دەبـن. ئەگـەری زۆرە ١١ی ئـازاری ١٩٧٤ ئەنجامێکـی لەمجـۆرەی لـێ بکەوێتــەوە. واتـە ئۆتۆنۆمییــەک بـۆ کـورد رابگەیەنـرێ و پیـادە بکرێـت کـە بەعـس بـە مەرجەکانـی قایـل بـن، لەکاتێکـدا بارزانــی و پدکیــش بگەڕێنــەوە بــۆ ناوچــە شــاخاوییەکانی قــەڵای قایمیــان و لــەوێ ببەسـترێنەوە.

دڵسۆزی هەمیشەییت
ئای. مەککلۆنی

ME/4431/A/24

**وتوویژ لەبارەی کوردانی عێراقەوە**

**ئاژانسی ناوخۆی بەغدا**

**(أ) ٠٥:٢٠ گرینیچ لە رۆژی ١٨ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٣**

**(ب) ٠٥:٣٠ گرینیچ لە رۆژی ١٩ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٣**

**دەقی راپۆرتەکە:**

دوێنێ کاتژمێر ١٩:٠٠ لە بارەگای ئەنجومەنی نیشتمانی، بەمەبەستی وتوویژکردن لەبارەی ئۆتۆنۆمی کوردستان، کۆبونەوەیەک رێکخرا. کۆبونەوەکە بە بەشداری کۆمەڵێک کەسایەتیی سەربەخۆی کوردی عێراق بوو کە ئەنجومەنی هەرێمی حزبی بەعس بانگێشتی کردبوون. کۆبونەوەکە چوار کاتژمێری خایاند و هەڤاڵ سەدام حسێن جێگری سکرتێری ئەنجومەنی هەرێمی حزبی بەعس و هەڤاڵانی ئەنجومەنی هەرێم: "نەعم حەدید و تایح عەبدولکەریم و، هەڤاڵان ئەندامانی سەرکردایەتی لقی بەغدا" بەشدارییان تێدا کرد. هەڤاڵ غانم ئەلجەلیل (ناوەکە نارِوونە) کە ئەندامی سەرکردایەتی لقی بەغدا و بەڕێوەبەری گشتی نوسینگەی جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕشە، سەرپەرشتی کرد.

جێـی وەبیرهێنانەوەیـە کـە رەشنووسـی بەرنامـە وتوویـژ لەسـەرکراوەکە لەلایـەن لیژنـەی بـاڵای بـەرەی نەتەوەیـی و نیشـتمانییەوە وتوویـژی لەسـەر دەکرێـت بەمەبەسـتی گەیشـتن بـە شـێوازێک کـە دواتـر بخرێتـە بـەردەم وتوویژکـردن لەگـەڵ پـدک دا.

ئەمــە چوارەمیــن کۆبوونەوەیــە کــە ئەنجومەنــی هەرێمــی حزبــی بەعــس داوای کــردووە بەمەبەســتی وتووێژکــردن لەســەر رەشنووســی یاســای ئۆتۆنۆمــی کوردســتان. پێشــتر ســێ کۆبونــەوە ئەنجــام دراوە کــە بیروبۆچونــی زیاتــر لــە ٢٠٠ کەســایەتی ســەربەخۆی ناوخۆیــی و دەرەکیــی لەســەر وەرگیــراوە. ئەمرۆش لــە بارەگــای ئەنجومەنــی نیشــتمانی، کۆبونەوەیەکــی دیکــە ئەنجــام دەدرێــت. کۆبونەوەکــەی ئەمــرۆ بــە بەشــداریی کەســایەتییە تورکمــان و ئاشــورییەکان ئەنجــام دەدرێــت و مەبەســت لێــی وتووێژکردنــە لەســەر بەرنامــەی ئاماژەپێکراو.

## (ب) دەقی راپۆرتی دەستپێکردن لەلایەن سەدام حسێنەوە:

سەدام حسێن کە جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆرش و جێگری سکرتێری ئەنجومەنی سەرکردایەتی حزبی بەعسە گوتوویەتی: ئەوە حساباتێکی کۆنە کە دەڵێت عێراق یەکە و نەتەوەکەشی یەک نەتەوەیە. ئەم لێدوانە لە میانەی ئەو وتارەیدا بوو کە ئاراستەی کۆبونەوەیەکی دوێنێ شەوی بارەگای ئەنجومەنی نیشتمانی کرد کە بەمەبەستی وتووێژکردن لەسەر بەرنامەی ئۆتۆنۆمی بۆ برا کوردەکانمان ئەنجام درا بوو. کۆبوونەوەکە لەلایەن سەرکردایەتی هەرێمی حزبی بەعسەوە داوا کرابو و هەریەک لە نەعیم حەداد ئەندامی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆرش و چەند ئەندامێکی سەرکردایەتی لقی بەغدا و زیاتر لە ٢٠٠ کەسایەتی تورکمان و ئاشوریی نیشتمانپەروەر بەشدارییان تێدا کرد.

ســەدام حســێن لــە وتارەکەیــدا جەختــی لــەوە کــردەوە کــە وتووێــژە کراوەکەمــان لەبــارەی بەرنامــەی ئۆتۆنۆمــی بــۆ گەلــی کــورد بەرئەنجامــی ئــەم چەمکەیــە. ئەمــە بەرنامەیەکــە کــە پەیوەنــدی بــە هەمــوو عێراقییەکانــەوە هەیــە بەبــێ هەڵاوێرکــردن و یەکێکــە لــەو رێکارانــەی کــە یەکێتیــی نیشــتمانیی بەهێزتــر دەکات و ئامانجیــش لێــی بەدیهێنانــی ئــەو داهاتــووە باشــترەیە کــە بــۆ هەمــوو گەلەکەمانــی دەخوازیــن.

حســێن روونــی کــردەوە: هەمــوو هاووڵاتییــەک، ســەر بــە هــەر نەتەوەیــەک

بێت، کە ئامانجی یەکەمی ڕێزگرتن نەبێت لە براکانی تری لە نەتەوەکانی تر، ئەو کەسە ناتوانێت خزمەتی ئەم گەلە بکات و دواجار زیانێکی گەورە بە گەلەکەی و نیشتمانەکەی دەگەیەنێت. حسێن بەشدارییە راستگۆییانە نەتەوەییەکەی بۆ وتووێژکردن لە بەرنامەی ئۆتۆنۆمییەکە بەرز نرخاند. ناوبراو رایگەیاند: ئەم کۆبوونەوانە نەک تەنیا زامنی ئەوە دەکات باشترین رێکار بۆ بەها و ئامانج و یەکێتیی نیشتمانیی و هەروەها بۆ بەرنامەی ئۆتۆنۆمییەکەی گەلی کوردمان هەڵبژێرین، بەڵکو ڕەگ و ڕیشەی متمانە لەنێوانماندا بەهێز دەکات، یەکڕیزیی و یەکێتیی و برایەتیی قوڵتر دەکاتەوە و درز و جیاوازییە حزبایەتییەکان ناهێڵێت و زۆر شت دەهێنێتە ئاراوە کە خزمەت بە بەرژەوەندییەکانی نیشتمان دەکات.

سەدام حسێن لەجیاتی ئەنجومەنی هەرێمیی حزبی بەعس سوپاسگوزاریی خۆی بۆ هەموو بەشدارانی وتووێژەکە دوپات کردەوە و، بەوە کۆتای بە وتارەکەی هێنا کە متمانەیەکی بەهێز و گەشبینییەکی گەورەی بە داهاتویەکی پرشنگدار هەیە. ناوبراو گوتی: ئێمە هەموومان سەربازی وەفاداری بەرژەوەندییەکانی هەموانین.

بەشدارانی کۆبونەوەکەی دوێنێ کە زیاتر لە سێ کاتژمێری خایاند، ئەو بەشدارییە مەزنەیان بەرز نرخاند کە شۆڕشی عێراق لە جەنگی چارەنوسدا پێشکەشی کردووە و لە سڕینەوەی دوایەمین بەرژەوەندیی ئیمپریالیزم لە سەرچاوە نەوتییەکانماندا خۆی دەبینێتەوە و، هەروەها بە پێزانینەوە باسیان لە بەشداریی تەواوی سوپا قارەمانەکەی عێراقیەکان لە جەنگی دژی دوژمنی زایۆنیستدا کرد.

جێگەی بەبیرهێنانەوەیە کە کۆبونەوەکەی دوێنێ، پێنجەمین کۆبوونەوەی ئەو زنجیرە کۆبوونەوانەیە کە بەمەبەستی وتووێژکردن لەسەر رەشنوسی بەرنامەی ئۆتۆنۆمی دەبەسترێت و دواتر ئەو رەشنوسە دەخرێتە بەردەم لیژنەی باڵای بەرەی نەتەوەیی و نیشتمانیی و، دواجار رێکارەکە لەگەڵ پدک گفتوگۆی لەسەر دەکرێت.

**نهێنی**
**باڵیۆزخانەی شاهانەی سوید**
**هۆبەی بەرژەوەندییەکانی بریتانیا**
**بەغدا**

**بەڕێز جی. ئێس بێرتن**
**بەشی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست**
**وەزارەتی دەرەوە و کۆمۆنوێڵز**
**لەندەن**
**رۆژ: ٢٠ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٣**

بەڕێز گراهام،
عێراق- کورد

سەرەڕای شەڕ لە ناو خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، ئەوا لە بەغداش هەوڵەکان بەردەوامن بۆ ئەوەی لە مانگی ئازاری داهاتوودا بناغەیەک بۆ ئۆتۆنۆمی کوردان بدۆزنەوە.

٢. لە رۆژانی ١٧ و ١٨ی تشرینی یەکەمدا، سەدام حسێن کۆبونەوەیەکی ئەنجامدا لەگەڵ "لایەنە جێی بایەخە" پاڵێوراوەکاندا. لە رۆژی ١٧ی تشرینی یەکەمدا نزیکەی ٢٠٠ نوێنەری کورد بۆ ئەنجومەنی نیشتمانی بانگ کران، و لە رۆژی ١٨ی تشرینی یەکەمدا هەمان ژمارە لە ئاشوری و تورکمانەکان

بانگکـران. ئەنجامــی کۆبونــەوەکان نەزانــراوە، بــەڵام پێــش ئــەوان رۆژنامــەی "ئەلتەئاخــی" پــدک ســکاڵای ئــەوەی دەکــرد کــە بەشــدارەکان نوێنــەر نیــن، و زۆرێـک لـە کەسـایەتییە خـاوەن کاریگەرییـەکان لـە لیسـتەکەدا دەرهێنـراون.

٣. ئەلتەئاخـی لـە رۆژی ١٦ی تشـرینی یەکەمـدا شـێوازی نوسـخەی ڕوانینـی پدکـی لـە بـارەی کوردسـتانەوە بـڵاو کـردەوە. دەبێـت ئـەم دەسـتورە بـەلای حکومەتــەوە قبوڵنەکــراو بێــت چونکــە داوای جێگرێکــی ســەرۆک کۆمــاری کـورد دەکات کـە لەلایـەن ئەنجومەنـی یاسـادانانی هەرێمییـەوە لەگـەڵ دادگـای بـاڵای دەسـتورییدا هەڵبژێردرێـت، کـە ئەندامەکانیـان بەیەکسـانی لـە ئەندامانـی حکومەتـە هەرێمییەکـە و حکومەتـی ناوەنـدی پێـک هاتبێـت. مـن دەقی سـەرەتایی وەردەگێـڕم و هاوپێچـی دەکـەم.

٤. پێشــهاتەکانی دیکــە ســەبارەت بــە کــورد لــەم چەنــد هەفتەیــەی رابــردودا بریتیــن لــە دانانــی کوردێــک کــە موحســین دزەییــە وەک وەزیــری کار و نیشـتەجێکردن. ئـەو لـە سـاڵی ١٩٦٩دا بـۆ ماوەیەکـی کـەم وەزیـری پەرەپێدانـی باکــور بــوو، بــەڵام لــە گۆڕانکارییــە وەزارییەکانــی تەمــوزی ١٩٦٩دا لادرا. لــە ســاڵی ١٩٧٠دا وەکـو باڵیـۆزی عێـراق لـە چیکۆسـلۆڤاکیا دەسـتنیشـان کـرا و لـە ســاڵی ١٩٧٢دا گواســترایەوە بــۆ کەنــەدا.

٥. هەروەهـا راپۆرتـی بـەردەوام هـەن لەبـارەی پێکدادنـی چەکـداری لەنێـوان کـورد و ئاشـورییەکان لـە سـنجار و دهـۆک.

دڵسۆزی هەمیشەییت،

ئای. مەککلۆنی

**نهێنی**
**باڵیۆزخانەی شاهانەی سوید**
**هۆبەی بەرژەوەندییەکانی بریتانیا**
**بەغدا**

**بەڕێز جی. ئێس بێرتن**
**بەشی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست**
**وەزارەتی دەرەوە و کۆمۆنوێڵز**
**لەندەن**
**راپۆرتمان: ٢/١**
**رۆژ: ٢٠ی تشرینی دووەمی ١٩٧٣**

بەڕێز گراهام،
عێراق: کورد

لە رۆژنامەی (رێگای گەل)ی شیوعییەکاندا لە رۆژی ١١ی تشرینی دووەم باس لەوە کراوە کە فەرماندەیی هێزە چەکدارەکانی پدک فەرمانێکیان دەرکردووە کە شیوعییەکان چەک بکەن و بیانبەزێنن. بەپێی راپۆرتەکان چەکدارەکانی کورد لەنزیک ئەو شارانە کۆبوونەتەوە کە شیوعییەکان و پشتیوانەکانیانی لێن. کوردەکان تۆپ و هاوەنیان پێیە. رۆژنامەکە ژمارەی کوردەکانی لە شاری دەربەندیخان بە ٢٥٠٠ چەکدار خەمڵاندووە کە چوار سەربازی کورد سەرکردایەتییان دەکەن بەناوەکانی: فەتاح ئاغا، حەمە

شـــەمێران، ســـاڵح بیـــداوی و مـــولازم نـــەوزاد.

٢. لەکاتـــی کۆبونەوەکانـــی نێـــوان بەعـــس و کوردەکانـــەوە لـــە ناوەڕاســـتی مانگـــی تشـــرینی یەکەمـــدا، لـــە ناوچەکـــە هیـــچ شـــتێک نەبیســـتراوە لەبـــارەی کێشـــەکانی ئـــەو دەســـتورە پەســـەندکراوەی کـــە بـــۆ ئۆتۆنۆمـــی کـــورد لـــە ١١ی ئـــازاری ١٩٧٤دا ڕاگەیەنـــراوە. حزبـــی بەعـــس پێشـــنیارەکەیان ئاشـــکرا نەکـــردووە.

٣. بەدڵنیاییـــەوە، پێشـــنیارە دورودرێژەکـــەی کـــوردم لەبەردەســـتدایە، هـــەروەک چـــۆن لەگـــەڵ نامەکـــەی ڕۆژی ٢٠ی تشـــرینی یەکەممـــدا هاوپێـــچ کـــراوە.

دڵسۆزی هەمیشەییت،

ئای. مەککلۆنی

**بەڕێز جی. ئێس بێرتن**
**بەشی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست**
**وەزارەتی دەرەوە و کۆمۆنوێڵز**
**لەندەن**
**راپۆرتمان: ٢/١**
**رۆژ: ٥ی کانونی یەکەمی ١٩٧٣**

بەڕێز گراهام،

**کورد و شیوعییەکان**:

پدک و حزبی شیوعی رێک کەوتوون کە بە دانوستان جیاوازییەکانیان چارە بکەن. نوسخەیەک لەو راگەیەنراوە هاوبەشە هاوپێچ دەکەم کە لە رۆژی ٢٠ی تشرینی دووەمدا بڵاویان کردۆتەوە و تیایدا رێککەوتون کە کار بکەن بۆ "بەرەوپێشبردنی پەیوەندییەکانیان لەداهاتودا" و هەروەها بۆ "پتەوکردنی پەیوەندییەکانی نێوانیان لەگەڵ هێزە نەتەوەییەکانی دیکە، بەتایبەتی ASBP".

هیچ زانیارییەکی دیکەم لەلا نیە لەبارەی ئەوەی ئەم ئاشتەواییە سەختە چۆن هێنراوەتە کایەوە یاخود تاچەند هیوای بەردەوامبونی هەیە. کەشوهەوا بۆ شەڕکردن لە چیاکاندا بەرەو ساردبون دەچێت. هەرچەندە هیچ ئاماژەیەک بۆ بەشدارییکردنی سوپا لەبەردەستدا نییە، بەڵام لەوانەیە خراپیی کەشوهەوا و گوشاری سەربازی هەردولای ناچار کردبێت کە لەگەڵ بەردەوامبونی ناکۆکییە راستەقینەکەیاندا، قایل بن بەوەی ماوەیەک لە ئاشتیدا بن.

ئای. مەککلۆنی

**نهێنی***

**ژمارە ٢٤٥/٣**

**مستەر ویەر**

**سێر ئەی. دەف**

## عێراق و کوردەکان

١. لەپاش گەڕانەوەی مستەر ئێنالس لە مانگی تشرینی دووەمدا لە عێراق و دوای کۆبوونەوەکەی، سێر ئەی. دەف داوای لێ کردم لەوە دڵنیاببمەوە کە ئایا هیچ چالاکییەکی IRD هەبووە کە بە هەرشێوەیەک بێت بووبێتە هۆی ئەوەی کە عێراق بریتانیا بە پشتیوانیکردنی کوردە یاخییەکان تۆمەتبار بکات یان نا.

٢. IRD پێی گوتین: کە بابەتەکانیان لە ساڵی ١٩٧٤دا تەنیا لە سێ بابەتدا سنورداربووە لەبارەی پلانەکانی یەکێتی سۆڤێت بۆ حزبی شیوعی عێراقی (حشع) کە وەکوو ڕێگەیەک بەکاریان بهێنێت لەناو ڕەوتی نەتەوەخواز و نەتەوەییە پێشکەوتنخوازەکاندا کە حزبی بەعس تیایدا باڵادەستە. لەم بابەتانەدا باس لە پەیوەندییەکانی یەکێتی سۆڤێت کراوە لەگەڵ حشع و حزبی بەعسدا لەچوارچێوەی خەباتی کورددا، بەڵام لە بابەتەکانیان بەهۆی

* شیاوی باسە، ئەم بەڵگەنامە نهێنییەش بێ-بەروارە، ئەگەر لە زانیارییەکانی ناوی وردبینەوە، باس لە ساڵانی ١٩٧٤ و ١٩٧٥ دەکات، هەروەها باس لە گەڕانەوەی مستەر ئێنالس دەکات لە مانگی ١١ دا لە عێراق و، دواتریش کۆبوونەوەی دیکەی ئەخاتەڕوو کە پاش گەڕانەوەی بۆ بەریتانیا لەگەڵ دبلۆماتکارانی ئینگلیز دا ئەنجامی داوە. بەم پێیە ئەم بەڵگەنامە نهێنییەش یان لە کۆتاییەکانی مانگی ١٢ ی ١٩٧٥ نووسراوە، یاخود ئەگەری زیاترە لە ساڵی ١٩٧٦ دا نووسرابێت، بۆیە بە پەسەندم زانی کە لە سەرەتای ڕیزبەندی بەڵگەنامەکانی ساڵی ١٩٧٦ دا دایبنێم، شەریف هەژاری.

حسابکردن بۆ حکومەتی عێراق ئەوا پشتیوانیی کوردەکانی نەکردووە. (لە چوارچێوەی کاری ئاژاوەگێڕیدا لە کەنداو، لێکۆڵینەوەی دیکە هەن کە باس لە پشتیوانیی عێراق دەکەن بۆ PFLO، بەڵام ئەمە بابەتی رەخنەلێگرتن لە عێراق نییە و بە هیچ شێوەیەک لە لێدوانی رۆژنامە بەریتانیەکاندا رەنگی نەداوەتەوە).

٣. ئێمە بە وریاییەوە بە بابەتەکانی ساڵی ١٩٧٤ی IRDادا دەچینەوە. پێم وانییە هیچکام لە ئاماژەکانمان بە کورد دژی حکومەتی عێراق بن. بابەتەکان راستن و زۆر کورتوپوختن، لە ساڵی ١٩٧٥دا IRD لێکۆڵینەوەی لەبارەی عێراقەوە نەبووە. بۆیە هیچ هۆکارێک نییە کە پێمان وابێت کە سکالاکانی عێراقییەکان پاساوییان پێ بێت لەبارەی ناوەڕۆکی ئەو زانیارییانەوە کە حکومەتەکەمان پشتیوانیی کوردەکان دەکات و لە ساڵانی ١٩٧٤ و ١٩٧٥ بڵاوکراونەتەوە.

٤. هەرچەندە رۆژنامەنوسە بەریتانییەکان دەڵێن کە وتارەکانیان هاوسەنگ بون و بە هاوسەنگییەوە مامەڵەیان لەگەڵ ئاشتەوایی عێراق لە کوردستان دا کردووە، بەڵام بەبێ گومان هەندێک لە رۆژنامەکان مەیلی ئەوەیان هەبووە کە شکۆمەندی بە شەڕەکە ببەخشن. بە بۆچونی من، ئەمە هاوکات لەگەڵ سەردانی رۆژنامەنوس و پەرلەمانتارەکان بۆ بەرەی کوردەکان لەسەردەمی جەنگەکەدا هۆکارێکی سەرەکیی ئەم رەخنەیەی عێراقە. عێراقییەکان ئەمە بڕوایانە، هەرچەندە ئەمە بڕوایەکی هەڵەیە، کە پشتیوانیی رۆژنامەکانی بەریتانیا بۆ کوردەکان بەبێ ڕێنمایی دەوڵەتی بەریتانیای مەزن نەبووە.

ئای تی ئێم لوکاس
بەشی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست

**ئەم بەڵگەنامەیە* لە خاڵی (٢) ەوە دەست پێ ئەکات:**

٢. حکومەتی عێراق بڕوای وایە کە نزیکەی شەشسەد پارتیزانی کورد لەژێر فەرمانی جەلال تاڵەبانیدا بەم دواییە لە سوریاوە دزەیان کردووتە عێراقەوە. دوای پەڕینەوە لە سنور، ئەم پارتیزانانە لە زاخۆ چالاکی دەکەن تا ئەوکاتەی خۆیان ئامادە دەکەن کە مەترسییەکان تێپەڕێنن و بە ناوچە سنورییەکانی نزیک لە سنوری تورکیادا، کە بەمدواییە چۆڵ کراون، ببڕن و خۆیان بگەیەننە گەڵاڵە و حاجی ئۆمەران. ناوەندی چالاکییە پارتیزانییەکان لە سنورەکانی تورکیاوە گۆڕدراوە بۆ ناوچەکانی خۆرهەڵات بەرەو حاجی ئۆمەران، کە چەند شوێنکەوتەیەکی تاڵەبانی کە لە ئێران ماونەتەوە دەتوانن خۆیانیان پێ بگەیەنن. پارتیزانە کوردەکان نە لە سنورە داخراوەکانی تورکیاوە دەخزێن و نە لە ئێرانیشەوە دێن.

* خاڵێکی جێی سەرنج لەم بەڵگەنامەیەدا ئەوەیە: ئاماژە نەدراوە بەوەی کە بۆ کێ نێردراوە و هەروەها بەڵگەنامەکە لە خاڵی دووەمەوە دەست پێ ئەکات و بەرواریشی لەسەر نییە.
لێکدانەوەی من ئەوەیە: کە ئەم بەڵگەنامەیە لە دوای مانگی شەشی ساڵی ١٩٧٥ ەوە نووسرابێت، ئەمەش لەبەر دوو هۆکار.
یەکەم: باس لە سەرهەڵدانی شۆڕش دەکات لە باشوری کوردستان، کە ئەوەش پاش ڕاگەیاندنی دامەزراندنی یەکێتیی لە ١-٦-١٩٧٥ دا هاتووەتەکایەوە.
هەروەها، دووەم هۆکاریش: باس لە لێبوردنی گشتی بۆ ئاوارە کوردە عیراقییەکان ئەکات کە بەهۆی ڕێکەوتنامەی جەزائیرەوە ڕوویان کردبووە ئێران، کە ڕێکەوتنامەی جەزائیر لە ٦-٣-١٩٧٥ دا ئیمزاکرا لە نێوان حەمە ڕەزا شای ئێران و سەدام حسێنی جێگری سەرۆککۆماری عێراق (ئەحمەد حەسەن بەکر) لە جەزائیر دا و، لە ڕێکەوتی ١٩-٣-١٩٧٥یش دا مەلا مستەفای بارزانی فەرمانی کۆتایهاتنی شۆڕشی ئەیلوولی دەرکرد. هەربۆیە ئەم هۆکارانە وادەکەن کە بەرواری ئەم بەڵگەنامەیە لە پاش مانگی شەشی ساڵی ١٩٧٥ ەوە نووسرابێت، بەڵام لەبەر ئەوەی بەتەواوی نەمتوانی کە مانگەکەی بیسەلمێنم و ساغی بکەمەوە کە بە دەقیق لە چ مانگێک دا نووسراوە، بۆیە بەهەمان شێوە بە باشم دانا کە ئەم بەڵگەنامەیەش لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٦ دا ڕیزبەند بکەم، شەریف هەژاری.

٣. هیــچ ئاماژەیــەک نیــیە بــەوەی پشــتیوانانی بارزانــی لــەم یاخیبونــەدا بەشــدار بــن. رەنگــە هۆکارێکــی یارمەتیــدەر بــۆ پەیوەندییکــردن بــە گروپەکــەی تاڵەبانیــی لــە حاجــی ئۆمەرانــەوە بریتــی بێــت لــە: تورەیــی خەڵــک بەهــۆی بەرنامــەی "چاکســازیی زەوی‌وزار"ەکــەی عێراقــەوە لــە کوردســتان. حکومەتــی عێــراق لــە ســاڵی پــاردا لــە هەوڵێکــدا بــۆ تێکشــکاندنی دەســەڵاتی ســەرۆک خێڵــە بەهێــزەکان، جوتیــارە کوردەکانــی راگواســت بــۆ ناوچەکانــی دوور لــە ناوچــە خێڵەکییــە نەریتییەکانیــان.

٤. ســوپای عێــراق هیــچ زیانێکــی جــددی بەرنەکوتــووەو بروانــاکەن کــە کــورد توانبیێتــی کەرەســەی قورســی ســەربازی بهێنــن. لەگــەڵ ئەوانەشــدا، ســوپا ئێســتا لەوپــەڕی ئامادەباشــیدایە لــە باکــور و هەندێــک ســەرباز و برێکــی گــەورە لــە کەرەســەی ســەربازی بــردووە کــە بــەم دواییــە لــە سنوری ســوریاوە گواســتراونەتەوە بــۆ کوردســتان. بارەگــای فەرماندەییــەکان کــە پێشــتر لــە هەولێــر بــوو ئێســتا گواســتراونەتەوە بــۆ گەلاڵــە.

٥. حکومەتــی عێــراق نیگەرانــی ئەوەیــە کــە زیادبونــی چالاکیی یاخیبــوان دوور لــە ســنورەکانی ســوریا و بەتایبــەت لەگــەڵ ســەختیی زســتانەکەی ئەمســاڵدا لــە چیاکانــی کوردســتان ئــەوا وا دەخوازێــت کــە لــە پێشــبینییەکەی جــاران زیاتــر پێویســت بــکات کــە ســەرچاوەکانی عێراقــی بــۆ تەرخــان بــکات. لەگــەڵ ئەوەشــدا، حکومەتــی عێــراق هێشــتا پێــی وایــە کــە دەتوانێــت شــەڕی پارتیزانیــی کــورد تــەوق بــدات (جڵــەو بــکات).

٦. لێــدوان: دیــارە پێشــنیارە بەخشــندەکەی کــە خراوەتــە بــەردەم کوردانــی عێراقــەوە لــە ئێــران، هەروەهــا درێژکردنــەوەی مــاوەی لێبوردنەکــە و، چونــی

وەفدی وەزارەتی بازرگانی ناوخۆی عێراق (عەلی حەسەن) بۆ ئێران ئەوا ئەو داوایەی لە کوردەکانی عێراق کرد کە بگەڕێنەوە، ئەمانەش هەموو وایان کرد کە هەندێک لە پارتیزانەکان ماوەیەک دوودڵ بن پاشان دووبارە دەست بکەنەوە بە بەرگریکردن لە بەرامبەر حکومەتی بەغدادا. هەرچۆنێک بێت، ئەو عێراقییانەی کە ئامادەییان تێدایە باس لەم بابەتە بکەن وا هەست دەکەن کە بە نزیکەیی هیچکام لەو ١٠٠٠ خێزانە کوردەی کە بەهۆی بەرنامەی لێبوردنەکەوە گەڕاونەتەوە، ڕێگەیان پێ نەدراوە لە کوردستان بمێننەوە و، یاخیبونەکەی کوردان، بەتایبەت لە نزیک زاخۆ، بە خێرایی لە گەشەکردندایە.

٧. حکومەتی عێراق باسی لەوە نەکردووەتەوە و بە ئاشکرا ددانی پێدا نەناوە کە چەند کردەوەیەکی بێزارکەر لە باکور رویاندابێت. ئەگەر ئەم حکومەتە ناچاربێت بە ئاشکرا ددان بەم یاخیبونە سوریا-نشینەی کورددا بنێت، ئەوا ویلایەتە یەکگرتووەکان کە زوربەی جار لەلایەن رۆژنامەکانی عێراقەوە بەوە تۆمەتبار دەکرێن کە لەگەڵ سوریادا لە لوبنان هەماهەنگییان هەیە، ئەمجارەیان زۆر بە ئاشکرا لەلایەن حکومەتی عێراقەوە سەرکۆنە دەکرێت بەوەی هانی شۆڕشێکی نوێی کورد دەدات.

ویلّی
B T
1633 #

**بەڵگەنامەیەکی* دیکە کە تەنها لە خاڵی (٩) ەوە دەست پێدەکات و ئەمەش ناوەرۆکەکەیەتی:**

## بابەتە سیاسییەکان — کوردەکان:

٩. من گوتم: کە ئێمە هێشتا لەبارەی پرسی کوردەوە رووبەڕووی کێشە دەبینەوە. بەتایبەتی لەبارەی مامەڵەکردنی رۆژنامە بەریتانییەکان و هەروەها چالاکییەکانی کوردەوە لەو وڵاتەدا. ئایا کەسی دیکە ئەزمونی لەم جۆرەی هەبووە؟ باڵیۆزی بەلجیکاش گوتی: بانگکراوە کە سکاڵایەک وەربگرێت سەبارەت بەوەی کە بەلجیکا پەنابەری کورد وەردەگرێت. ئەو بڕوای وابوو کە ئەم بابەتە راست نییە بەڵام گوتی کە لە برۆکسل لەم بارەیەوە دەپرسێت.

راسپێردراوی هۆڵەنداش گوتی: هۆڵەندا نزیکەی ٦٠ کەسی وەرگرتووە و بەم دواییە بانگ کراوە سکاڵایەک وەربگرێت لەبارەی خۆپیشاندانێکەوە کە لە دژی باڵیۆزخانەی عێراق ئەنجام دراوە. روونکردنەوەکەی ئەوە بووە کە ئەم بابەتە بۆ کۆمپانیای هاگ (The Hag Corporation) بووە و لەژێر کۆنترۆڵدا بووە و هیچی لێ نەکەوتووەتەوە. ئەو پێی وایە کە

* جێی ئامەژەیە، ئەم بەڵگەنامەیەش نە نووسراوە کە بۆ کێ نێردراوە و، هەروەها لە خاڵی نۆیەمەوە دەست پێ دەکات و، بەرواریشی لەسەر نییە. بەڵام ناوەڕۆکەکەی دا باسی وەرگرتنی پەنابەرە کوردە عێراقییەکانی ناو ئێران دەکات لە لایەن هەندێک وڵاتی ئەوروپییەوە، کەوابو دەبێت ماوەیەک دوای رێکەوتنامەی جەزائیر بووبێت و، زۆریش رێی تێ دەچێت کە لە ساڵی ١٩٧٦ دا نووسرابێت، چونکە تا ژمارەیەکی کەم لەو کوردە پەنابەرانەی عێراق کە لە ئێران بوون لەلایەن هەندێ وڵاتی ئەوروپییەوە وەک پەنابەر وەرگیران، ئەوا چەند مانگێک و بگرە ساڵیشی پێ چوو، هەربۆیە بە پەسەندم زانی ئەم بەڵگەنامەیەش بخەمە سەرەتای ڕیزبەندی ساڵی ١٩٧٦ ەوە، شەریف هەژاری.

روونکردەنەوەکـەی قبـوڵ کـراوە.

باڵیـۆزی کۆمـاری ئەڵمانیـای فیدراڵیـش رایگەیانـد: پێـی وایـە کۆمارەکەیـان هەندێـک پەنابـەری جـێ کردووەتـەوە.

هەروەهـا باڵیـۆزی فەرەنسـاش گوتـی: فەرەنسـا کەسـی قبـوڵ نەکـردووە و پـێ دەچـوو ئیتاڵیـاش داوای لـێ نەکرابێـت.

**کۆمەڵەی دەستپێشخەریی هۆڵەندی بۆ کوردستان**
**سندوقی پۆستە ١٣٠٥٩**

**ئوتریخت (هۆڵەندا)**

## دوایین گەشەسەندنەکانی پرسی کورد

**پێشەکی**

دوو ئەندامی کۆمەڵەی دەستپێخەریی هۆڵەندی بۆ کوردستان لە مانگی تشرینی دووەمی رابردوودا لەسەر داوای حکومەتی عێراق سەردانی ئەو ولاتەیان کرد و مەبەستیان ئەوەبوو لە بارودۆخی باکوری ئەو ولاتە، واتە کوردستانی عێراق بڕوانن. بەلاّم پلانی سەردانەکەیان بۆ باکور هەڵوەشایەوە و پێش ئەوەی دەستپێشخەرییەکە دەست پێبکات کشانەوە، چونکە تۆمەتبارکران بەوەی "زۆر لە بابەتە ناوخۆییەکانی عێراق دەکۆڵنەوە"، جێگەی تێبینییە کە پێشنیاری هێڵە گشتییەکانی سەردانەکە پێشتر لەلایەن بەرپرسی کاروبارەکانی عێراق لە (هاگ) و بە راوێژ لەگەڵ حکومەتەکەیدا رەزامەندی لەسەر دەربڕدراوە. کاتێک وەفدەکە گەشتنە بەغدا، ئەم بابەتە لەلایەن وەزارەتی رۆشنبیریشەوە پشتڕاست کرایەوە.

ئەم راپۆرتە پشت بەو زانیارییانە دەبەستێک کە لە ماوەی پێنج رۆژی مانەوەیان لە بەغداو دەوربەری بەدەستیان هێناوە و بەراورد کراوە بەو زانیارییانەی کە کوردەکان و سەرچاوەکانی دیکە لە سوریا و ئەوروپا و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە دابینیان کردووە. ئاماژەیەکی تایبەت

دراوە بە راپۆرتە پڕ وردەکارییەکەی د. عیسمەت شەریف وانلی، لە لۆزان، کە لە مانگی ئابدا وەکو ئەندامی وەفدێکی نێودەوڵەتی سەردانی عێراق و کوردستانی عێراقی کردووە.

ا. بارودۆخی کوردانی عێراق لە ئێران و لە خودی عێراقیش دا

١. کوردانی پەنابەر لە ئێران

لە مانگی ئابی رابردوودا، دەسەڵاتدارانی عێراق (بەڕێز نەعیم حەداد، ئەندامی سەرکردایەتی هەرێمی حیزبی بەعسی عێراقی) بە فەرمی رایگەیاند کە تا حاڵی حازر ٩٣ هەزار کوردی عێراق لە ئێران ماونەتەوە و تا کە ٥٠ هەزاریان قایل کراون کە بگەڕێنەوە بۆ وڵاتەکەیان. بەپێی راپۆرتەکان، بۆ زیادکردنی ئەم ژمارەیە و خێراترکردنی گەڕانەوەکە ئەم رێکارانەی خوارەوە گیراونەتە بەر:

أ. کاربەدەستە عێراقییەکان بەسەر کەمپی پەنابەراندا لە ئێران گەڕاون و داوایان لە کوردەکان کردووە بگەڕێنەوە.

ب. بارودۆخی ژیان لە کەمپەکاندا لە ئاستێکی نزمدا هێڵراوەتەوە (بۆ نمونە کەمپێک لە قەسری شیرین کە لە ٣٠ هەزار چادر پێک هاتووە "خراپترین دۆخی پاکوخاوێنی تێدایە"، بڕوانە راپۆرتێک لە Neue Zurher Zeitung، ٣٠ی تەمووزی ١٩٧٥).

ج. هەموو لیژنە کوردییەکان لەناو کەمپەکاندا هەڵوەشێنراوەتەوە و راستەوخۆ خراونەتە ژێردەستی ساواک (پۆلیسی نهێنیی ئێران)ەوە. بەبێ رەزامەندیی ساواک کەس ناتوانێت بچێتە کەمپەکانەوە یاخود بەجێیان بهێڵێت. لە رووداوێکدا لە کەمپی (ئەنزەل) لەبەرئەوەی دوو کوڕی کورد بەبێ وەرگرتنی رەزامەندیی و بە مەبەستی خۆشۆردن کەمپەکەیان بەجێ هێشتبوو، بەهۆیەوە ٩ تا ٢٧ کورد کوژران (بڕوانە راپۆرتەکە لە رۆژنامە جیهانییەکاندا، مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٧٥).

د. لە مانگی ئابی رابردوودا ٢٦٣ کورد، کە هەندێکیان لێپرسراوی کەمپ و کاربەدەست بون و بە هۆکاری سیاسیی لەلایەن دەسەڵاتدارانی ئێرانەوە تەسلیم بە ڕژێمی عێراق کراونەتەوە.

ئێستا روون بووەتەوە کە بەهۆی ڕێکەوتنێکی نهێنی نێوان عێراق و ئێرانەوە، لە درێژەی ڕێککەوتنەکەی ٦ی ئازاری جەزائیردا، تاوەکو ١ی کانوونی یەکەمی ئەمساڵ بە خۆشی بێت یان بە زۆر، نزیکەی ٨٠ هەزار کوردی دیکە دەگەڕێنرێنەوە بۆ عێراق. لە دواتردا ئەم وادەیە لەبەر چەند هۆکارێکی کرداریی تاوەکو ١٠ی کانونی یەکەم درێژکرایەوە. ئەم تەسلیمکردنەوەیە بەم ڕێوشوێنانەی خوارەوە جێبەجێ دەکرێت:

أ. ناسنامەی عێراقیبوون لە هەموو ئەو کوردانە دەسەنرێتەوە کە تاوەکو ١ی تشرینی یەکەم یاخود وادەیەکی دواتر نەگەڕێنەوە وڵاتەکەیان. ئەم زانیارییە لەلایەن بەڕێز نەعیم حەدادەوە لەسەردانیدا بۆ کەمپی پەنابەران لە ئێران باس کراوە (بڕوانە سەرەوە).

ب. وادیارە ئەو ١٠ هەزار کوردەی کە ڕێگەیان پێدەدرێت لە ئێران بمێننەوە، لەناو سیستمی کۆمەڵایەتی و ئابوریی ئەو وڵاتەدا یەک دەخرێن. ئەم بابەتە لەسەرەتاوە و لە نیسانی ساڵی ١٩٧٥ەوە لەلایەن حکومەتی ئێرانەوە ڕاگەیەندراوە. ئەمەش بەمانای بڵاوکردنەوەی کوردەکان دێت بەسەر وڵاتەکەدا (تاوەکو ئێستا ژمارەیەک لە کوردەکان نێردراونەتە بەلوچستان، کە سنوری خۆرهەڵاتی ئەو وڵاتەیە)، هەڵبژاردنی کۆمەڵێک پیشەی تایبەت (کرێکاری خاوەن ئەزمون، سوپا)، و لەدەستدانی ناسنامەی کوردێتی.

ج. هەرچەندە حکومەتی ئێران و هەندێک لە حکومەتەکانی وڵاتانی ئەوروپا و وڵاتە بیانییەکان لەسەر ئەوە ڕێک کەوتون کە پرۆسەی چۆڵکردنەکە (ی کەمپەکان) لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی خێرا بەڕێوەبچێت، بەڵام هیچ

کوردێکی عێراقیی نیشتەجێی ئێران رێگەیان پێنادرێت وەکو پەنابەر ئێران بەجێ بهێڵێت. وا دیارە رۆیشتنەکەیان پەیوەندی هەبێت بە رێککەوتنی نێوان عێراق و ئێرانەوە، واتە تاوەکو وادە دیاریکراوەکەی گەڕانەوە (کە ١٠ی کانونی یەکەمە)، رێگە بە کەس نادرێت ئێران بەجێبهێڵێت. تاوەکو ئەمڕۆ، دیارە کە رێوشوێنی چۆڵکردنەکە کارا کرابێت.

ئەم رێکارانەی سەرەوە، کوردانی پەنابەریان لە ئێران خستووەتە حاڵەتی ترس و نائومێدییەوە. جگە لەو کەسانەی کە دەتوانرێت قایل بکرێن بگەڕێنەوە بۆ عێراق، زۆر کوردی دیکە هەن کە پاساوی باشیان بەدەستەوە بووە خۆیان لەدەست حکومەتی بەعس بەدوور بگرن، ئێستا گەیشتوونەتە ئەو بڕوایەی کە باشترە مەترسی بخەنە سەر ژیانی خۆیان و ئەوانیش بگەڕێنەوە. بۆیە، بەپێی راپۆرتەکان، لە مانگی رابردوودا دەیان هەزار کورد گەڕێنراونەتەوە بۆ عێراق.

## تێبینییەکان:

دەستبەجێ دوای رێکەوتننامەکەی جەزائیر، لە مانگی ئازاری رابردوودا (شا)ی ئێران بەڵێنی ئەوەی بە کوردەکان دا کە وەکوو (میوان) لە وڵاتەکەیدا قبوڵیان بکات. لەبری ئەوە، ئەو ٢٥٠ هەزار کوردەی کە پەنایان بردووەتە بەر ئێران بە ئاشکرا دەردەکەوتن، هەرچەندە لەبەرامبەر عێراقدا مامەڵەی دیکەیان پێوە دەکرێت. هیچ وڵاتێک یاخود دەسەڵاتێکی نێودەوڵەتی فشارێکی کاریگەریان دروست نەکردووە کە رێ لەم کارەساتە مرۆییە بگرێت. دوا هیوای بارزانی بە حکومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەخەسار چوو، ئاشکرایە کە سەردانەکەی ئەم دواییەی ناوبراو بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکان کاریگەرییەکی ئەرێنی لێ نەکەوتووەتەوە لەسەر رێوشوێنەکانی دەسەڵاتدارانی ئێران.

## ٢. بارودۆخی کوردەکان لە عێراق

ئێستا حکومەتی عێراق دەستی کراوەیە کە سیاسەتی بەعەرەبکردنەکەی بەسەر کوردەکاندا بسەپێنێت، چونکە بەرهەڵستی چەکداریی لە بەرامبەریدا گەیشتووەتە سفر و پێناچێت هیچ حکومەتێکی دەرەکی هەڵبداتێ، بۆیە لەئێستادا ئەم رێکارانەی خوارەوەی گرتووەتەبەر (وەک لەلایەن سەرچاوە فەرمییەکانی بەغداوە پشتراست کراوەتەوە):

أ. لە ناوچە نا- ئۆتۆنۆمە کوردییەکانی باکوری عێراق سەدان گوندی کورد بەتەواوی چۆڵ کراون، مەبەست لەم کارەش (پڕکردنەوە)ی گوندەکانە بە جوتیاری عەرەب، یاخود هۆکاری سەربازی/ ستراتیجی لەپشتەوەیە. نمونەکان

- لە پارێزگای دیالە، زیاتر لە پەنجا گوندی سەر بە شارەکانی جەلەولا، خانەقین و قۆرەتوو، لەسەر سنوری ئێران چۆڵکراون، هەروەها چەندین گوند لە شاری مەندەلی خۆرهەڵاتی بەعقوبەوە، لەنزیک هەمان سنورەوە چۆڵ کراون.

- لە پارێزگای کەرکوک، زوربەی گوندەکانی سەر بە شارەکانی کفری توز و داودە و شوان و دبس و داقوق و دەوروبەری شاری کەرکوک چۆڵکراون (ناوی زیاتر لە ٤٠ گوند دراون).

- لە پارێزگای نەینەوا (موسڵ)، چەندین گوند لە شارەکانی سنجار، تەل ئەعفەر، زەمار، شێخان، عەقرە و دەوروبەری شاری موسڵ چۆڵ کراون.

ب. لە ناوچە ئۆتۆنۆمەکەدا، کە لە ٣ پارێزگای تەواو کورد پێکهاتووە، چەندین گوندی دوورەدەست چۆڵ کراون. دانیشتوانەکەی دواجار راگوێزراون بۆ (کۆمەڵگەی نیشتەجێبوون)ی نوێ یاخود گوندی نمونەیی کە نزیکن لە رێگە سەرەکییەکانەوە، و ئوتومبیلی خزمەتگوزاری و ئوتومبیلە سەربازییەکان بە ئاسانی دەیانگەنێ (هەروەک "گوندە ستراتیجییەکان" کە

ویلایەتــە یەکگرتــووەکان و پورتوگالییــەکان یــەک لــەدوای یــەک لــە ڤێتنــام و مۆزەمبیقــدا سیاســەتی نیشــتەجێبونیان تێــدا ســەپاند). چەندیــن نمونــە لــە پارێزگاکانــی هەولێــر و دهــۆک و سلێمانی لەبەردەســتدان، بــۆ نمونــە، شــارەکانی ســیمێڵ و زاخــۆ و مەخمــور و هەندینــاوە و هەڵەبجــە و پێنجوێــن. هەروەهــا، پرۆســەی بەعرەبکــردن لــە ڕێگــەی جێنشــێنیکردنی عــەرەب لــە جێگــەی کــوردەکان لــەم ناوچەیــەش بەردەوامــە.

ژمــارەی ئــەو کەســانەی لــەم گواســتنەوە زەبەلاحــەی خەڵکــدا بەشــدارن بــە تــەواوی نازانرێــن، بــەڵام بــە ٢٠٠ تــا ٥٠٠ هــەزار کــەس دەخەمڵێنرێــن.

ج. زۆرێــک لــەو پەنابــەرە کوردانــەی لــە ئێــران گەڕاونەتــەوە، لەبــری ئــەوەی بنێردرێنــەوە بــۆ گوندەکانــی خۆیــان، دەگوێزرێنــەوە بــۆ ناوچــە عەرەبنشــینەکانی باشــوری وڵات. ئەمــە بــۆ زۆرێــک لــەو کوردانــەش راســتە کــە لــە گوندەکانیــان هەڵدەکەنرێــن (بڕوانــە خاڵــی أ و ب ی ســەرەوە). تەنیــا لــە ناوچــەی دیوانیــە، لــە باشــوری بەغــدا، نزیکــەی ٥٠ هــەزار کــورد لــە کوختــەی زۆر ســەرەتایی‌دا کــە بــە (ســەراعیف) ناودەبرێــت لــە کەمپــدا جێگیرکــراون و زۆری تریــش. (بڕوانــە رۆژنامــەی گاردیــان، ١٤ی تشــرینی یەکــەم).

د. لــە چەنــد ناوچەیەکــی نــا- ئۆتۆنۆمــی کوردەکانــدا، بــۆ نمونــە لــە خانەقیــن (لــە پارێزگــای دیالــە) و هەروەهــا شــنگال (لــە پارێزگــای نەینــەوا) قوتابخانــە کوردییــەکان بــە قوتابخانــەی عەرەبــی جێگەیــان گیراوەتــەوە، و زمانــی کــوردی چیتــر بــۆ خوێنــدن بەکارناهێنرێــت. تێبینــی: ئەمــە دژی ڕێککەوتنەکــەی ١١ی ئــازاری ١٩٧٠یــە، هەرچەنــدە ڕێکەوتنامەکــە بــە فەرمــی هێشــتا لەکاردایــە و پابەندیــی پێــوە دەکرێــت.

ە. منداڵانــی کــورد لــە ناوچــە عەرەبییەکانــی باشــوری وڵاتــدا ناتوانــن بــە زمانــە کوردییەکــەی خۆیــان بخوێنــن، هەرچەنــدە بەپــێی ڕێکەوتنەکــەی ١١ی ئــازار، زمانــی کــوردی دووەم زمانــی فەرمــی عێراقــە و دەبێــت شانبەشــانی زمانــی عەرەبــی لەســەرانســەری عێراقــدا بخوێنرێــت.

و. ڕێکخـراو و بزووتنـەوە سیاسـییەکانی کـورد لـە بـەر بەرژەوەنـدی حزبـی بەعسـی عەرەبیـی و ڕێکخـراوە پەیوەندیدارەکانـی سـەرکوت دەکرێـن.

ز. ئەنجومەنەکانـی یاسـادانان و جێبەجـێ کـردن لە ناوچە ئۆتۆنۆمەکـە دا، واتە لەهەرسـێ پارێزگـا تـەواو کوردەکـەدا، بریتیـن لـە دامـەزراوەی بـێ دەسـەڵات و بـە تـەواوی لەلایـەن حکومەتـی ناوەنـدی بەغـداوە کۆنتـرۆڵ کـراون، حکومەتـی ناوەندیـش لەلایـەن حزبـی بەعسـی عەرەبییـەوە حوکـم دەکرێـت. ئەندامانـی ئەنجومـەن بەپێـی مەرسـومی سـەرۆکایەتی دادەمەزرێنرێـن، بڕیارەکانیـان پێویسـتی بـە ڕەزامەندیـی دەسـەڵاتدارانی بەغدایـە، واتـە ڕەزامەندیـی ئەنجومەنی پلاندانـان.

ج. ناوچـە کوردییەکانـی پارێزگاکانـی نەینـەوا و کەرکـوک و دیالـە بـە تێکـڕا نەخراونەتـە سـەر هەرێمـە ئۆتۆنۆمەکـە. شـاری عەقـرە هەرچەنـدە دانرابـوو کـە بخرێتـە سـەر ئـەو هەرێمـە، بـەڵام هێشـتا لەژێـر دەسـەڵاتی پارێزگـای نەینـەوادا هێڵراوەتـەوە. ئەمـەش پێچەوانـەی ڕێککەوتننامەکـەی ١١ی ئـازارە، چونکـە لـە سـەرژمێرییەکەی سـاڵی ١٩٥٧دا کوردێتیـی ئـەم شـارە بەروونـی سـەلمێنراوە.

ت. کەمینـەکان لـە ناوچـە کوردییەکانـدا، بـۆ نمونـە مەسـیحییەکان و تەنانـەت ئێزیدییەکانیـش، کـە بەگشـتی خۆیـان داوەتـە پـاڵ کـوردەکان، گوشـاریان دەخرێتەسـەر کـە خۆیـان بـە عـەرەب لەقەڵـەم بـدەن و پەیوەنـدی بـە بـەرەی بەعسـەوە بکـەن.

ی. پڕوپاگەنـدە حکومییـەکان دەیانەوێـت ژمـارەی کوردانـی عێـراق بـە کـەم نیشـان بـدەن، بـۆ نمونـە، تەنیـا ئامـاژە بـۆ دانیشـتوانی ناوچـە ئۆتۆنۆمەکـە دەکـەن (خەمڵاندنـی فەرمـی ١,٤ ملیـۆن)، لەکاتێکـدا ژمـارەی دانیشـتوانی کوردسـتانی عێـراق، واتـە ئـەو ناوچەیـەی کـە کـورد تیایـدا زۆرینەیـە، لەلایـەن د. وانلی‌یـەوە بـە ٣ ملیـۆن کـەس دەخەملێنرێت، لەبەرامبـەر ٧,٥ ملیـۆن عـەرەب لـە باشـوری وڵاتەکـەدا.

پێویسـتە ئـەوەش لەبەرچـاو بگیرێـت کـە بەڕێـز تاریـق عەزیـز، وەزیـری

ڕاگەیاندنی عێراق، بە ئاشكرا ئەوەی باس كردووە كە ڕاگواستنی كورد لە گوندەكانیان (هۆكاری ئاسایش و ئابوری) لەپشتەوەیە، بۆ نمونە: هەستیاریی ناوچە سنورییەكان و ناوچە نەوتییەكان، پاراستنی تاكی كورد(!) و گۆڕینی كوردەكان بە كارمەندە پسپۆڕەكانی عەرەب. بڕوانە: ڕاپۆرتەكەی وانلی، گاردیانی ١٤ی تشرینی یەكەم، تایمزی ٢٨ی ئۆكتۆبەر.

د. وانلی بە پشتبەستنی بە وتەیەكی بەڕێز زاید حەیدەر، ئەندامی سەركردایەتی نەتەوەیی حزبی بەعس دەڵێت، پرسی كورد، و بەتایبەت دیاریكردنی سنوری هەرێمە ئۆتۆنۆمەكە، لە داهاتودا بە مەبەستی ڕاستكردنەوەی ئەوا چاوی پێدادەخشێنرێتەوە.

## ٢. پلان و تەگەرەكانی بەردەم كوردانی عێراق

- پارتی دیموكراتی كوردستان كە لەلایەن جەنەراڵ مەلا مستەفا بارزانی‌یەوە سەركردایەتی دەكرێت (لقی دەرەوەیان لە تارانە) هەوڵ دەدات كار بۆ ناردنەوەی چەند سەد كەسێكی كورد بكات، كە زۆربەیان كەیسی زۆر مەترسیداریان هەیە، و ڕەوانەی وڵاتانی ئەوروپا و دەرەوەیان بكات (ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا و كەنەدا و ئوستورالیا).

- یەكێتیی نیشتمانیی كوردستان كە لەلایەن بەڕێز جەلال تاڵەبانییەوە كە لە دیمەشق سەركردایەتی دەكرێت لە هەوڵدایە هێزەكانی لەگەڵ ئۆپۆزسیۆنی عێراقدا كە ئێستا لە سوریا دان یەك بخات و باس لە یەكڕیزی لەگەڵ عەرەب و پێشكەوتنخوازیی دەكات. یەكێتی نیشتیمانی كوردستان بە ئاشكرا ڕایگەیاندووە خەباتی چەكداریی بەم نزیكانە لە عێراق دەست پێدەكاتەوە، بەم دواییە، ئەم حزبە بە توندی دژی پلانەكانی دەسەڵاتدارانی بەغدا بۆ گێڕانەوەی ١ ملیۆن كورد ناڕەزایی دەربڕیووە.

- پارتی دیموكراتی كوردستان لە بەغدا لەلایەن بەڕێز عەزیز

عەقراوی‌یـەوە سـەرکردایەتی دەکرێـت کـە پێشـتر ئەندامـی مەکتـەب سیاسـیی بـارزان بـووە و ئێسـتا لـە حکومەتـی بەغـدا وەزیـری دەوڵەتـە. حزبەکـە وەکـوو حزبێکـی لاواز و بچـوک دەردەکەوێـت. بەرێـز عەقـراوی کاریگەرییەکـی ئەوتـۆی لەسـەر ڕووداوەکان نی‌یـە. دەگوترێـت حـزب و چالاکییـە کوردییەکانـی دیکـەش کـە لـە بەغـدان ئـەوا شـتی بچوکـن و لەگـەڵ سیاسـییەکانی حزبـی بەعسـدا کۆکـن.

- د. عیسـمەت شـەریف وانلـی، لـە لـۆزان، هـەوڵ دەدات کـوردە سۆشیالیسـتەکان بخاتـە ژێـر باڵـی خۆیـەوە. ئـەو پێشـنیارەی لـە مانگـی ئەیلولـدا پێشکەشـی حزبـی بەعسـی کـرد هێشـتا وەڵام نەدراوەتـەوە، پێشـنیارەکانی بابەتگەلـی وەک جێبەجێکردنـی تـەواوی ڕێکەوتننامـەی ١١ی ئـازار و لەخۆگرتنـی زوربـەی ناوچـە زۆرینـە کوردییەکانـی باکـوری عێـراق بـۆ ناوچـە ئۆتۆنۆمەکـە، و هەروەهـا پێشـنیاری ئـەوەی کـردووە کـە ناوچـە کوردییەکانـی دیکـە بخرێنـە ژێـر فەرمانـی ئیدارەیەکـی عەرەبـی/ کوردییـەوە و هەمـوو پرۆسـەیەکی بەعەرەبکـردن بوەسـتێنرێت. تێکـڕای ڕاپۆرتەکـەی د. وانلـی بـەم نزیکانـە بـڵاو دەکرێتـەوە.

## لێکۆڵینـەوەی (کۆمەڵـەی دەستپێشـخەریی هۆڵەنـدی بـۆ کوردسـتان) لەبـارەی کوردەوە:

١. بەرێزیـان داوایـان لێ کردم بۆچونیان لەبـارەی لێکۆڵینەوەهاوپێچکراوەکەوە بخەمـە ڕوو کـە داوییانـە بـە بەرپرسـی کاروبارەکانـی هۆڵەنـدا. ئاشـکرایە کـە کۆمەڵـەی دەستپێشـخەریی هۆڵەنـدی بـۆ کوردسـتان لایەنگـری کـوردە، و بەڕێـز مەیهویـزن باسـی لـە سـەفەری ٢ ئەندامـی کـردووە لـە مانگـی تشـرینی دووەمـدا (بڕوانـە نامەکـەی بـە ژمـارە ٢/١ی ڕۆژی ١٦ی تشـرینی دووەم بـۆ بەڕێـز لـوکاس)، و هیـچ گومانێـک نی‌یـە کـە هەندێـک لە باسـەکانی نـاو ئـەم لێکۆڵینەوەیە

زیـادەڕەوی تێداکـردووە، بـەڵام چەنـد بابەتێکـی جـێی سەرنجیشـی تێدایـە.

٢. ئـەو ڕاپۆرتـەی کـە هەمانبـوو لێکۆڵینـەوەم لەسـەر کـردو ئـەم بابەتانـەی لای خـوارەوە بـە نادروسـت یاخـود زیادەڕۆیـی دەزانـم:

أ. ژمـارەی کـوردە عێراقییـەکان لـە ئێـران لەگـەڵ ئـەو زانیارییانـەدا ناگونجێت کـە لـە نامەکانـی نێـوان باڵیۆزخانـەی تـاران، و بەشـی نەتـەوە یەکگرتـووەکان لــە وەزارەتــی دەرەوە و کۆمۆنوێڵــز و UKMISدا لــە جنێــف هاتــووە (بڕوانــە ڕاپۆرتەکانــی ژمــارە ١٥٠، ١٥٤، ١٥٦ لــە فایلــی ژمــارە ١/٤/٣ی ســاڵی ١٩٧٥). لەکاتێکدا لێکۆڵینـەوە هۆڵەندییەکـە لـە لاپـەڕەی ٢دا دەڵێـت (٢٥٠ هـەزار کـورد لـە ئێـران بوونەتـە پەنابـەر)، بەرزتریـن ژمـارە کـە بتوانـم وەکـو کـۆی گشـتی لـە فایلەکانـدا بەدەسـتی بهێنـم بریتییـە لـە ١٨٦ هـەزار کـورد کـە دەسـتبەجێ دوای داخرانـی سـنوری ئێـران لـەو وڵاتـە بـوون بە گوتـەی نوێنـەری کۆمسـیۆنی باڵای نەتـەوە یەکگرتـووەکان بـۆ کاوربارووبـاری پەنابـەران (UNHCR) لـە تـاران، لـە کۆتایـی مانگـی حوزەیرانـی ١٩٧٥دا تەنیـا ٩٠ هـەزار کـوردی عێـراق لـە ئێرانـدا مابونــەوە و لەوکاتــەوە ٥٠ هــەزاری دیکــە گەڕاونەتــەوە عێــراق و بەمــەش لــە ناوەڕاسـتی مانگـی تشـرینی دووەمـدا تەنیـا نزیکـەی ١٥ هـەزار کەسـێک لـە نـاو کەمپـەکان و نزیکـەی ٣٥ هەزارێـک لـە خاکـی ئێرانـدا ماونەتـەوە. ئـەم ژمارانـەش وا دەکــەن کــە ئــەو بارودۆخــەی کــە ڕاپۆرتــە هۆڵەندییەکــە لــە پەرەگرافــی ١١ "ب"ی لاپــەڕە ١دا باســی دەکات ڕێی تێنەچێـت.

ب. ئـەو ژمارانـەی کـە لـە ڕاپۆرتـە هۆڵەندییەکـەدا سـەبارەت بـە پرۆسـەی بەعەرەبکردنــی کوردســتانەوە خراونەتــەڕوو پێدەچێــت زیادەڕۆییــان تێــدا کرابێــت، ڕاپۆرتەکــە دەڵێــت ٢٠٠ تــا ٥٠٠ هــەزار کــەس لــە بەرنامەدایــە کــە نیشـتەجێ بکرێـن. بـەڵام لـە کۆبەنـدە سـاڵانەکەی بەڕێزیانـدا، بەڕێزیـان گوتـی: "ڕەنگـە ٥٠ هـەزار کـورد" لـە باشـور نیشـتەجێ کرابـن، هەرچەنـدە ئـەم ژمارەیـە هیــچ عەرەبێکــی نەگرتووەتــەوە کــە ئەکرێــت لــە باکــور نیشــتەجێ کرابێــت و، کـۆی گشـتی ژمارەکـەش بـە هیـچ جۆرێـک ناگاتـە ژمـارە هۆڵەندییەکـە.

ج. سەبارەت بە پەروەردە، لێدوانەکەی پەرەگرافی ٢ (د) کە دەڵێت زمانی کوردی دەبێت لە قوتابخانەکانی سەرانسەری عێراقدا بگوترێتەوە بە تەواوی راست نییە. هەرچەندە رێکەوتننامەی ١١ی ئازار دەڵێت کە دەبێت ئەم بابەتە بەم شێوەیە بێت، بەلاّم یاسای ئۆتۆنۆمییەکەی ١١ی ئازاری ١٩٧٤ تەنیا دەڵێت: زمانی کوردی دەبێت لە ناوچە ئۆتۆنۆمیەکەدا وەکو زمانی سەرەکی و زمانی عەرەبیش وەکو زمانی دووەم بخوێنرێت.

د. گومانم لە ژمارەی دانیشتوانەکەی پەرەگرافی ٢ (ی) لە خوارووی لاپەرە ٣ی راپۆرتە هۆڵەندییەکە هەیە. راپۆرتێکی بەشی لێکۆڵینەوە لە ساڵی ١٩٧١دا دەڵێت: بەپێی سەرژمێرییەکەی ساڵی ١٩٦٥ی عێراق، تەنیا ٢ ملیۆن کورد هەن و ژمارەی دانیشتوانی تێکرای عێراق ٨,٣ ملیۆن کەسە. لەگەڵ ئەوەشدا، زیادبونی ژمارەی دانیشتوان لەوکاتەوە تائێستا رەنگە کۆی گشتیی کوردەکانی گەیاندبێتە نزیکەی ٣ ملیۆن کەسێک.

٣. ناتوانین لەسەر زۆرێک لە خاڵەکانی لێکۆڵینەوە هۆڵەندییەکە لێدوان بدەین، بەتایبەت لەسەر وردەکاریی ئەو گوندانەی لە پارێزگاکانی دیالە و کەرکوک و نەینەوادا چۆڵ کراون. ئەو بابەتەی لە پەرەگرافی ٢ (ج) دا سەبارەت بە پێناسەی هەرێمە ئۆتۆنۆمەکە پێناسەیەکی رەوایە، چونکە یاسای ئۆتۆنۆمییەکە هەرگیز سنورە جوگرافییەکانی هەرێمەکەی دیاری نەکردووە و تەنیا گوتویەتی ئەو شوێنانە دەگرێتەوە کە کورد تیایاندا زۆرینەیە. رەنگە هۆکارەکە ئەوەبێت کە حکومەت بە نیازی ئەنجامدانی سەرژمێرییەک بێت، و ئەم راپرسییەش ببێتە بنەمای پیاچونەوە بەسەر سنورەکانی هەرێمە ئۆتۆنۆمەکەدا، هەروەک راپۆرتەکە لە زاری زەید حەیدەرەوە دەڵێت: پێویستە راست بکرێنەوە.

٤. بۆچونەکانی کۆتایی لێکۆڵینەوەکە سەرنجیان راکێشام کە تیایدا دەڵێت عەزیز عەقراوی نایەوێت کەسێکی بێدەسەلاّت بێت، ئەمە یەک دەگرێتەوە لەگەڵ ئەو قسانەی بەڕێز مەیهویزن سەبارەت بە هاشم عەقراوی کە بە

بەرێزیانــی گوتــووە و رایگەیانــدووە کــە (کەســێکی زۆر نیگەرانــە) (ئەمــەش بەپێــی ئــەو نامەیــەی کــە لەســەرەوە ئامــاژەی بۆکــراوە).

٥. ئــەو د. وانلی‌یــەی کــە لــە راپۆرتەکــەدا چەنــد جارێــک ئامــاژەی بۆکــراوە پێدەچێــت کەســێکی گرنــگ بێــت، و ئەگــەر توانیبێتــی هاوینــی رابــردوو ســەردانی عێــراق بــکات و پێشــنیار بخاتــە بــەردەم حکومــەت (بڕوانــە دوا پەرەگرافــی راپۆرتەکــە)، ئــەوا دیــارە کەســێکی تــا رادەیــەک میانــڕەوە. حەزدەکەیــن راپۆرتەکــەی ببینیــن، کــە دیــارە بــەم زووانــە بــڵاو دەکرێتــەوە، و زۆر پێــم وایــە کــە UKMIS لــە جنێــف بتوانێــت بەدەســتی بهێنێــت.

١٨ی کانوونی دووەمی ١٩٧٦

کەی. دی. تێمپڵ

**نهێنی**
**رۆژی گەیشتن ٢٦ی کانوونی دووەمی ١٩٧٦**
**ژمارە ٣/٢٤٥**
**باڵیۆزخانەی بریتانیا**
**بەغدا**
**١٩ی کانونی دووەمی ١٩٧٦**

**بەڕێز ئای تی ئێم لوکاس**
**بەشی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست**
**وەزارەتی دەرەوە و کۆمۆنوێڵز**

ئایڤۆری بەڕێز،
کوردستان

١. جاروبار راپۆرتمان پێداون لەبارەی راستودروستیی مەسەلەی راگواستنی کوردانەوە لە بەرەی باکورەوە بۆ باشوری عێراق لەلایەن دەسەڵاتدارانی عێراقەوە (بۆ نمونە، بڕوانە نامەکەی ژمارە ٢/١ی رۆژی ١٦ی تشرینی دووەم کە بۆ تۆم ناردووە).

٢. دوێنێ لەسەر نانخواردنی نیوەڕۆ کە بۆ لۆرد ئارمسترۆنگ رێکخرابوو، لەتەنیشت عیسمەت کیتانی‌یەوە دانیشتبووم، کە پێشتر یاریدەدەری سکرتێری گشتیی نەتەوە یەککگرتووەکان بووە و ئێستاش بەڕێوەبەری گشتیی بەشی رێکخراوە نێودەوڵەتییەکانە لە MFA. من ئەم کەسە تا رادەیەکی زۆر

بە باشی دەناسم - زۆر کراوە و بەردەستە، شنەبایەکی نوێیە، وەک لە نامەکانی پێشودا پێم وایە پێم راگەیاندبیت. کیتانی دەڵێت: پەیمانە دادپەروەرانەکەی گەورەیی بەخشین بۆ کورد نەهێنراوەتە دی. سیاسەتێکی روون لەئارادا نەبووە. مەسەلەی پێدانی دەسەڵات بە کورد شتێکی ناراست بووە و تەنانەت بە گرنگیش نەدەزانرا ئەگەر بهاتایە و بەشەکانی تری سیاسەتەکە رون و بنیادنەر بونایە. راگواستنەکە بێمانا بووە. عەبدولعەزیز عەقراوی، ئەو تاکە سەرکردەی کوردە کە شتێک متمانەی ماوە، پێی گوتووە: کە ئامارێکی لەلایە دەریدەخات تەنیا لە شاری خانەقینەوە ٦٠ هەزار کەس راگوێزراون. کیتانی دەڵێت دەتوانم لەوە تێ بگەم کە بۆچی ئەو کوردانەی لە ئێرانەوە گەڕاونەتەوە بە زۆرەملێ لە باشور نیشتەجێ کراون، بەڵام ئەندامانی خێزانەکەی خۆیشی کە هیچ بەشدارییەکیان لە شۆڕشەکەدا نەبووە نێردراونەتە باشوور بۆ ئەوەی لە "کوختەی قوڕین"دا بژین - ئامۆزایەک داوای لێ کردبو کە بتوانێت خانویەک لە بەغدا بەکرێ بگرێت، بەڵام بەخت یاوەری نەبووە. ئەو تێ ناگات چی وای لە حکومەت کردووە کە سیاسەتەکانی رابردووی بۆ ئاشتەوایی پشتگوێ و فەرامۆش بکات. رەنگە "جەماعەتەکەی تاڵەبانی" نیگەرانی کردبن. حامید ئەلجبوری کە وەزیری دەوڵەتە بۆ کاروباری پەیوەندی لەگەڵ دەسەڵاتدارانی هەرێمە ئۆتۆنۆمەکە، پیاوێکی باش بووە بەڵام هیچ سەنگێکی نەبووە.

٣. پێگەی کەسێتیی کیتانی زۆر گونجاو نییە. دەستنیشانکردنەکەی وەک بەڕێوەبەری گشتیی زۆر لە خوار تواناکانی کیتانییەوەیە و سەرەڕای ئەو کارە ئەرکی ئەوەشی دراوەتێ کە هۆش بکات بەبەری ئەو پەیکەرەی کە عێراق لە دوایین کۆبونەوەی وەزیرانی دەرەوەی کۆمکاری عەرەبیدا پێشنیاری کرد، لەپێناو گەشەپێدان و بە دامەزراوەییکردنی هاوکارییە ئابورییەکان (بڕوانە نامەکەم ٣/٥ی ٢٥ی تشرینی یەکەم). ئەو دەڵێت نیگەرانی

پێگەکـەی خـۆی نیـیە و، ئـەو لەبـەر هـۆکاری نیشـتمانپەروەرێتی گەڕاوەتـەوە عێـراق، بـەو بڕوایـەوە کـە بتوانێـت بەشـداربێت لـە دابینکردنـی خۆشـگوزەرانی بـۆ داهاتـوی عێـراق، ئـەم بڕیـارەی لەپێـش ڕێکەوتننامەکـەی جەزائیـرەوە داوە. سـاڵێک یـان دوانـی تـر چـاوەڕێ دەکات و، ئـەو کات لانـی کـەم دەزانێـت کـە هەوڵـی داوە و شکسـتی هێنـاوە.

٤. ئـەم وتووێـژە جەخـت لـە بوونـی ناڕەحەتییەکـی بەرچـاو دەکاتـەوە لەنـاو سـەرکردە "وەفـادار"ە کوردەکانـدا سـەبارەت بـە ڕووداوەکان و، هەروەهـا بـەو ڕاپۆرتانـەی لەبـارەی ڕاگواسـتنەوە هـەن، ئەمانـەش ڕاپۆرتـی دڵنیـان و جێگـەی گومـان نیـن. لـە ڕاپۆرتـە سـاڵانەکەمدا سـەبارەت بـە ژمـارەی کەسـانی گیرۆدەکـراو باسـم لـە ٥٠ هـەزار کـەس کردبـو. وا دەردەکەوێت ئەمـە بـە لایەنی کەمـی خەملاندنەکانـەوە بێـت، ئەگـەر ژمارەکـەی عەزیـز عەقـراوی ڕاسـت بێـت. بـەڵام ئێـرە ئـەو ناوچەیەیـە کـە هەمیشـە زیادەڕۆیـی بـە مەترسـی دەزانرێـت. بـۆ نمونـە، نوسـخەیەکی ئـەو ڕاپۆرتەمـان بینیـوە کـە هۆڵەندییـەکان ئامادەیـان کـردووە و لـە ڕاپۆرتەکـەی ١٦ی تشـرینی دووەممـدا ئامـاژەم پـێ داوە و لـەوێ ژمـارەکان زۆر زیاتـرن. نوسـخەیەک لـەو ڕاپۆرتـە و ڕاپۆرتـی لێدوانـی تێمپـڵ هاوپێـچ دەکـەم کـە مـن لەگەڵیـدا کۆکـم.

٥. مـن ئـەم ڕاپۆرتـە بـۆ کەسـی دیکـە نانێـرم و وەکـو نهێنـی دایدەنێـم لەبـەر ئـەوەی گرنگـی کەسـێتی کیتانـی بۆمـان نابێـت بخرێتـە ژێـر مەترسـییەوە.

دڵسۆزی هەمیشەییت

جەی ئەی ئێن گراهام

کۆتایی

**نهێنی**
**باڵیۆزخانەی بریتانیا**
**بەغدا**
**٢٦ی کانونی دووەمی ١٩٧٦**

**رۆژی گەیشتن ٢ی شوباتی ١٩٧٦**
**ژمارە ٣/٢٤٥**

**٢/٠١١**
**بەڕێز ئای تی ئێم لوکاس**
**بەشی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست**
**وەزارەتی دەرەوە و کۆمۆنوێڵز**

ئایڤۆری بەڕێز
کوردستان: راگواستن

١. جارجارە و، لە هەموشی تازەتر لە نامەکەی رۆژی ١٩ی کانونی دووەممدا، باسمان لە ئەو کوردانە کردووە کە لەباکورەوە دەگوێزرێنەوە و لە باشوری عێراق نیشتەجێ دەکرێن. بەڵگەکان جۆراوجۆرن بۆ نمونە بینینی کەسانی کورد لە شوێنە پێشبینی نەکراوەکانی وەک دیوانییەدا کە تیایدا زۆر بەزەقی دەردەکەون، یاخود بینینی ئوتومبیلی سەربازی کەماڵە کوردی تێدایە و لە تاریکی شەودا لە شارێکەوە دەبرێنە شارێکی تر، تا

دەگاتــە زانیاریــی ئــەو کەســانەی کــە کەســوکاریان بــەر ئــەم راگواســتنە کەوتووە و تەنانــەت پڕوپاگەنــدەی ناوبازاڕیــش گەرمــە لــەم بارەیــەوە.

٢. تــا کاتــی نوســینی ئــەم نامەیــە، تاکــە حاڵەتێکمــان بینیــوە کــە کەســێکی ئاشــوری، کــە شانبەشــانی پێشــمەرگە چەکــی هەڵگرتبــو، لەگــەڵ خێزانەکەیــدا لــە گوندێکــی باکــورەوە راگوێــزراوە بــۆ گوندێکــی دوورەدەســت کــە چەنــد میلێــک لــە دیوانیــەوە دوورە. دەگوتــرێ لــەوێ لــە کوختەیەکــی قوڕینــی یــەک ژووریــدا دەژیــن و موچەیەکــی ٢٥ دیناریــی مانگانــەی دەدرێتــێ و هیــچ کارێکــی نیــە بیــکات. لــە باکــور، ئــەو کەســە خــۆی پارچــە زەوییەکــی هەبــووە و پشــتی بەخــۆی بەســتووە، بــەڵام هیــچ زانیارییــەک نیــە لەســەر ئــەوەی زەوییەکــەی چــی بەســەر هاتــووە.

٣. ئەمــڕۆ کاتــێ چــاوم بــە محەمــەد ســەبری ئەلحەدیســی کــەوت، کــە جێگــری وەزارەتــی کاروبــاری دەرەوەیــە، ئــەم پرســە گشــتییەم لەگەڵــدا بــاس کــرد. کاتــێ باســی وتارێکــی رەخنەییــم لــە رۆژنامــە عێراقییەکانــدا دەکــرد، پێــم گــوت کــە سوپاســگوزار دەبــم ئەگــەر بزانــم دەبێــت لەبــارەی پرســی راگواســتنەوە چ قســەیەک بــۆ رۆژنامەنوســە بریتانییــەکان بکــەم کــە رەنگــە پرســیارم لــێ بکــەن، چونکــە گوتــم پێشــبینی دەکــەم وەک بابەتێکــی جێــی رەخنــە بایەخێکــی زۆر بــەم بابەتــە بــدەن و دەبێــت مــن لــە پێگەیەکــدا بــم کــە بتوانــم تێڕوانینــی عێراقییەکانیــان لەمبارەیــەوە پــێ رابگەیەنــم. حەدیســی لــە وەڵامدانــەوەدا کەمێــک نارەحەتــی پێوەدیاربــو. ئــەو گوتــی هیــچ گواســتنەوەیەکی خەڵــک لــە باکــورەوە بــۆ باشــور لــە ئــارادا نیــە. ئــەوەی هەیــە ئەوەیــە کــە زۆرێــک لەوانــەی بڕیاریــان داوە لــە ئێرانــەوە بگەڕێنــەوە بــۆ عێــراق لــە باشــوری عێــراق نیشــتەجێ دەکرێــن لەبــەر ئــەوەی شــەڕ ناوچەکانیانــی لــە باکــور وێــران کــردووە و ئــەو ناوچانــە پێویســتیان بــە ئاوەدانکردنــەوە و بنیادنانــەوە هەیــە. ئەوانــەیماڵیــان

هەبـووە بچنـەوە رێگەیـان پـێ دراوە بـەڵام ئەوانـەیماڵەکانیـان نەمـاوە، لـە باشـور نیشـتەجێکراوە، ئـەو بەتایبەتـی باسـی لـە رومـادی و کـوت و دیوانییـە کـرد. پرسـیارم کـرد ئایـا ئـەم کارە خۆبەخشـانەیە یـان نـا. لـە وەڵامـدا گوتـی ئەنجامگیریەکەمـان خۆبەخشـانەیە چونکـە ئـەم کەسـانە لـە کەمپەکانـی ئێرانـدا بارودۆخەکەیـان بـۆ روونکراوەتـەوە و بـە چاوکراوەییـەوە بڕیـاری گەڕانەوەیـان داوە. لێبوردنەکـە بەسـەر ئـەو کەسـانەدا جێبەجـێ کـراوە کـە بەشـدارییان لـە شۆڕشـەکەدا کـردووە و مەسـەلەی نیشـتەجێکردنەوەیانی لـێ بـەدەر نەکـراوە. ئەمـە یاسـا نەبـووە، بەڵکـو پێویسـتییەکی کـرداری و ئابـوری بـووە.

٤. تـێ گەیشـتم کـە تـا ئـەم خاڵـە دەتوانـم لەسـەری بـڕۆم. ئەمـە بـە هیـچ جۆرێـک جێـی ئاسـودەیی نییـە و بـڕوا ناکـەم رۆژنامەکانمـان جگـە لـە رەخنەگرتـن هیـچ هەڵوێسـتێکی تریـان ببێـت، کـە لـە راسـتیدا مۆرتایمـەر دەسـتی بـە رەخنـە کـردووە (هەرچەنـدە کاتـێ بـەم دواییـە جێگری وەزیـرم لـە وەزارەتی راگەیانـدن بینـی رایگەیانـد بـە وتارەکـەی مۆرتایمـەر نارەحـەت نەبـووە لەبـەر ئـەوەی هیـچ نەبێـت لـەو رووەوە بێلایـەن بـووە کـە تێڕوانینـە عێراقییەکـەی بـاس کـردووە).

دڵسۆزی هەمیشەییت
جەی ئەی ئێن گراهام

وێنەیەک بۆ بەڕێز تاران

**کۆنفرانسی ڕێکخراوە بەریتانییەکان بۆ هاوکاریکردنی پەنابەران**
**ناوەنـدی پەرەپێدانــی نێودەوڵەتــی (پارنێـڵ هــاوس، ٢٥ ویڵتــۆن ڕۆد، لەنــدەن sw1v1js، ژمــارە تەلەفــوون ٧٦١٦ ٠١-٨٢٨**

کۆمەڵەی کوردەکان

کۆنووســی ئــەو کۆبونەوەیــەی لــە ڕۆژی چوارشــەمە ٢٥ی شــوباتی ١٩٧٦ لــە کاتژمێــر ٤ی پاشــنیوەڕۆ لــە کتێبخانــەی ناوەنــدی پەرەپێدانــی نێودەوڵەتــی، پارنێــڵ هــاوس، ٢٥ ویڵتــۆم ڕۆد، لەنــدەن، SW1 گرێــدرا.

ئامادەبووان

سەرۆک

مستەر کێنیف لید

ئەندامان

| | |
|---|---|
| کۆمەڵگەی خاچی سوری بەریتانی | مس ئێس سینگر |
| کریستیان ئەید | مستر جی. گێڵبەر |
| دەزگای کۆمەڵایەتی نێودەوڵەتی | مس ئار بلاک |
| نوێنەرایەتی کورد لە ئەوروپا | مستەر جەی عەلی |
| پارتی دیموکراتی کوردستان | مستەر ئێچ غەفوری |
| نوێنەری شانشینی یەکگرتوو لە UNHCR | مستەر جەی هیدلەر |
| پەیوەندییەکانی نەتەوە یەکگرتوەکان | مسس ئێڵ لێڤین |
| وار ئۆن وەند | مستەر ئای مەکدۆناڵد |

| | |
|---|---|
| دەزگای زانکۆی جیهان | مستەر ئەی دی جەی فلیپس |
| دەزگای زانکۆی جیهان | مس سی هەد سن |
| بە بەشداری | مستەر دی میران |

١. داوای لێبوردن بەرامبەر بە ئامادەنەبوونەوە وەرگیرا لە: مستەر ئەی ئێن دەیڤس لە ئەنجومەنی خزمەتی هاوڕێیان.

٢. کۆنوسەکانی کۆبوونەوەی رۆژی ٢ی کانونی یەکەمی ١٩٧٥ کە دابەشکرا رەزامەندی لەسەر نیشان دراو واژوو کرا.

٣. بابەتە باسکراوەکان، هەموو بابەتەکان لەژێر ناونیشانی سەرەکیدا باسکران.

٤. کۆمەڵگەی هاوڕێیەتی بەریتانی- کوردی

سەرۆک باسی لەو پێشکەوتنە کرد کە کۆمەڵگەکە بەدەستیهێناوە لەکاتی دروستبوونیەوە لە مانگی نیسانی ١٩٧٥.

بەرەوپێشچوونەکە کارێکی سەخت بووە، بەشێک لە هۆکارەکەش ئەوەیە کە وەکوو پێویست ئەندامی بەریتانیی لەبەردەستدا نین کە کاتی خۆیان لە بەرنامە دارشتندا سەرف بکەن و ئەوەندەش ئەندامی کوردیان نییە کە بۆنەی کلتوری ئامادە بکەن.

ئەنجومەنەکە بەردەوام کۆبوونەوەی ئەنجامداوە و جاروبار زانیاری داوەتە دەست کەناڵەکانی راگەیاندن. هەندێک لەو وتارانەی کە بەم دواییانە بینراون ئەنجامی دەستپێشخەرییەکی لەمجۆرەن. هەروەها بایەخ بە کێشەی خوێندکارە کوردە پەنابەرەکان و بابەتی دیکەش دراوە.

کۆبونەوەی گشتی ساڵانە لە رۆژی یەکشەمە ٢١ی ئازاری ١٩٧٦ ئەنجام دەدرێت و (ئێوارەیەکی کۆمەڵایەتی) رێکخراوە بۆ رۆژی شەممە ٢٠ی ئازار لە ئیمپێریاڵ کۆلێج لە کێن سینگی تۆنی باشوور لەلایەن کۆمەڵگەی خوێندکارە کوردەکانی ئەوروپاوە و هەموو ئەندامانی کۆمەڵە کوردییەکە

و هاوڕێیـان بـۆ هـەردوو بۆنەکـە بانگهێشـت کـراون. لـە کۆبونـەوەی گشـتی ساڵانەدا وتووێـژ لەسـەر ڕەشنووسـی دەسـتور دەکرێـت ئەمـەش لەسـەر بنەمـای ئـەو خاڵانـە کـە لـە ئێسـتا داڕێـژراون.

بـۆ سـاڵی داهاتـوو هـەوڵ دەدرێـت ژمـارەی ئەندامـان زیـاد بکرێـت و هەروەهـا بەرنامـە بـۆ چەنـد چالاکییـەک دابڕێژرێـت

ڕاپۆرتێـک کـە لەلایـان پارتـی دیموکراتـی کوردسـتانەوە ئامادەکرابـوو لـە کۆبونەوەکـەدا بەسـەر ئامادەبوانـدا دابـەش کـرا

٥. ڕاپۆرت لەسەر پەنابەرە کوردەکانی شانشینی یەککگرتوو:

أ) نامـە بـۆ وەزارەتـی ناوخـۆ لـە ڕۆژی ٣١ی کانونـی یەکەمـی ١٩٧٥ لـە وەڵامـی نامەکـەی ڕۆژی ٣١ی کانونـی یەکەمـی ١٩٧٥ ی سـەرۆک، کـە تیایـدا داوای ڕوونکردنـەوەی کردبـوو بەرامبـەر بـە ڕێوشـوێنی پێویسـت بۆ سپۆنسـەر کردنـی کـوردە پەنابـەرەکان، لـە ڕۆژی ٢١ی کانونـی دووەمـی ١٩٧٦دا نامەیـەک لـە مسـتەر ئەلێکـی لیۆنـەوە گەیشـتووە. لەگـەڵ ئەجێنـدای کۆبونەوەکـەدا نوسـخەی ئـەم نامەیـەش دابـەش کـرا.

نامەکـە بـە وردەکارییـەوە ڕوونکردنـەوەی پرۆسـەکەی لەخـۆ گرتـووە و نێـردراوە بـۆ لیژنەکـە بـۆ ئـەوەی پێـش ئامادەکردنـی وەڵامـی تـەواو بۆچونـی لەسـەر دەرببڕدرێـت.

مسـتەر یـان مەکدۆنـاڵ (وارِ ئـۆن وەن)، کـە لەنـاو نامەکـەدا وەکـوو یەکێـک لەوانەیـە کـە پشـتیوانی دەکات، خـۆی نامەیەکـی بـۆ کاربەدەسـتانی کـۆچ لـە وەزارەتـی ناوخـۆ نـاردووە و داوای ڕوونکردنـەوەی لێکـردوون سـەبارەت بـە هەڵوێسـتی یاسـایی و، ئـەو کردارانـەی کـە پۆلیـس دەیگرێتـە بـەر لـە لێکۆڵینـەوە لەگـەڵ سپۆنسـەرەکاندا و هەروەهـا پرسـیاری کـردووە لەبارەی ئـەو گەرەنتییەی کـە دەبێـت پـڕ بکرێتـەوە. دەرکـەوت کـە ئەمـە یاسـایەکی گشـتی یاخـود پـلان

نی یـە، بۆیـە شـتێکی باشـە کـە لێدوانـی یەکلاکراوەمـان هەبێـت سـەبارەت بـەو ڕێوشـوێنانەی وەزارەتـی ناوخـۆ کـە لـە هێنانـە نـاوەوەی پەنابـەران بـۆ ئـەم وڵاتـەدا دەیگرنـە بـەر.

لە میانەی وتووێژەکەدا ئەم بابەتانە لەبەرچاوگیران:

(١) مسـتەر هیدلـەر ڕێوشـوێنەکانی شانشـینی یەکگرتـووی سـەبارەی بـە پێدانـی پەنابەرێتـی روونکـردەوە، پەنابەرێتـی نادرێـت بـەو کەسـانەی لـە دەرەوەی ئـەم وڵاتـەن. بۆیـە ئـەو کوردانـەی بـۆ نموونـە: لـە ئێرانـن ناتوانـن داوای پەنابەرێتـی بکـەن، بۆیـە تەنیـا ڕەنگـە بتوانـن لـە چوارچێـوەی یاسـاکانی کۆچـدا ڕێگـەی هاتنەناوەوەیـان پـێ بدرێـت، بـۆ نموونـە:

- وەکـو خوێنـدکار بـەو مەرجـەی بەڵگەیـان پـێ بێـت کـە بەشـداری کۆرسـەکانی خوێنـدن دەکـەن.
- کاتێک ڕەزامەندی دامەزراندنیان بۆسەر کارێک پێ بێت.
- وەکو کەسانێک کە بتوانن خۆیان پشت بە خۆیان ببەستن.

بـە پێچەوانـەوە داواکارەکان دەخرێنـە ژێـر چاودێـری هێـزە یەدەگەکانـی وەزارەتـی ناوخـۆ، لەسـەر ئـەم بنەمایـەش بـوو کـە وەزارەتـی ناوخـۆ لـە مانگـی ئایـاری ١٩٧٥دا لـە پەرلەمـان (کۆمـۆن) ڕاگەیاندنێکـی بڵاوکـردەوە.

کارێکـی ئەسـتەم بـوو کـە بزانیـت: بۆچـی وا پێویسـت دەکات پەنابەرانـی کـورد بـە چاوێکـی جیـاواز لـە چیلییەکانـی ئەرجەنتیـن یاخـود هیندۆچینییەکانـی تـر یاخـود وڵاتانـی دیکـە تەماشـا بکرێـن.

هەردووکیـان لـە یەکـەم وڵاتـی پەنابەرێتیانـدا بـوون و مەترسـییان لەسـەر بـووە و مانەوەیـان گونجـاو نەبـوو.

بەپێـی ئـەو زانیارییانـەی لـە سـەرچاوە کـوردەکان و لـە ڕۆژنامەکانـەوە دەسـتمان کەوتـووە، بارودۆخـی زۆرێـک لـەو کوردەکانـەی کـە لـە ئێرانـن

تاڕادەیەکی زۆر بارودۆخێکی ناجێگیریان هەیە یاخود پێشینە مێژووییەکان پاساومان دەدەنێ کە لە بارودۆخیان بترسین و ئەمەش لە هەلومەرجێکدایە کە رەنگە گۆڕانکاریی زۆر گەورە لە ماوەیەکی کورتدا رووبدات.

پەنابەران لە ئێران، کە ئێران ئەندامی رێککەوتنەکەی ساڵی ١٩٥١ نییە، هیچ پێگەیەکی یاساییان لەو وڵاتەدا نییە و هیچ زامنێکی کۆچبەرییان نییە. رەنگە بارودۆخەکەیان هاوشێوەی بارودۆخی نەخوازراوترین بێگانەکان بێت. لەبەر ئەم هۆکارانە بوو کە بە گرنگ زانراوە کە کاربەدەستانی وەزارەتی ناوخۆ قایل بکرێن بەوەی: هەندێک لە کوردەکان وایان بە باش زانیوە کە داوای پەنابەرێتی لە شوێنی دیکە بکەن لە دەرەوەی ئێران.

(٢) مستەر غەفوری باسی لەو سەختییانە کرد کە دێنە بەردەم ئەو کوردانەی داوای پشتیوانییان لێ دەکرێت. هەندێکیان نەیاندەزانی چۆن پشتیوان بدۆزنەوە، ئەوانی دیکە داوای ئەوەیان لێ کراوە کە ئایا خۆیان دەتوانن پشتیوانی لە خۆیان بکەن یان نا. ئەم بابەتانە پرۆسەکەیان دواخستووە کە خۆی لە خۆیدا لانی کەم دوو مانگی پێ دەچێت.

سەبارەت بە رێوشوێنی پشتیوانیکردنەکەشەوە باس لەم بابەتانەی دیکەش کرا:

أ. چالاکی پۆلیس. ئاشکرابوو کە پۆلیس بەڕاستی سەردانی ماڵی پشتیوانەکانی کردووە بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوە بکات. نەزانراوە کە چۆن ئەم پشتیوانانە دۆزراونەتەوە.

ب. سەبارەت بە فۆرمی پشتیوانییەکان کە بە چاپکراوی نێردراون بۆ مستەر مەکدۆناڵد.

- بەرپرسیار بکرێت بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری پەنابەران و مانەوەیان تا ئەوکاتەی پەنابەرەکە دەتوانێت خۆی پشتیوانی لە خۆی بکات.

- پەنابەرەکـە زامنـی ئـەوە بـکات کـە رێگـای پـێ نادرێـت لەسـەر گیرفانـی دەوڵـەت بـژی.

وەهـا زانـرا کـە پرسـیاری لەمجـۆرە رەنگـە ببێتـە هـۆی ئـەوەی کـە خەڵکان حـەز نەکـەن ببنـە پشـتیوان و، لـە هەمـوو حاڵەتێکیشـدا ئـەم پرسـیارانە تێگەیشـتن لێیـان قورسـە. لـە کـرداردا ئـەو کەسـانەی رێگەیـان پێدەدرێـت بێنـە ئـەم وڵاتـەوە دەسـتبەجێ مافـی ئەوەیـان هەیـە داوای کۆمـەک بکـەن.

سـەرەڕای چەنـد حاڵەتێـک، ئـەوا زانـرا کـە ئـەو کەسـانەی داوای پەنابەرێتیان کـردووە بەهـۆی سـەختی لـە دۆزینـەوەی پشـتیواندا کارەکەیـان دواکەوتووە.

## دواجار رێکەوتن لەسەر ئەوەی:

أ) پرۆسـەی وەرگرتنـی کـوردەکان نابێـت بـە هیـچ جۆرێـک ئەنجـام بـدرێ و، بـۆ ئەمـەش، ئەنجومەنـی بەریتانـی بـۆ هاوکارییکردنـی پەنابـەران دەبێـت لەکاتـی پێویسـتدا داوای (پشـتیوانیکردن)ی پەنابـەرە کوردەکانـی لـێ بکرێـت، هـەروەک چـۆن پێشـتر یارمەتـی دامەزراندنـی ئـەم پەنابەرانـەی داوە. لەبەرئـەوەی وەهـا چـاوەڕوان دەکرێـت کـە بەشـێک لـەم کەسـانە خوێنـدکار بـن و WUS بەرپـرس بێـت لێیـان و، کـۆی وەرگرتنەکـە سـنوردارە، بۆیـە پێشـبینی نەکـرا کـە ئـەم بـڕە بڕێکـی گـەورە بێـت.

بەڕێـز سـەرۆک رەزامەنـدی دەربـڕی لەسـەر ئـەوەی کـە ئـەم بابەتـە بخاتـە بـەردەم ئەنجومەنـی بەریتانـی بـۆ هاوکارییکردنـی پەنابـەران.

ب) لەبەرئـەوەی وا دەردەکەوێـت ئـەم پرسـی پشـتیوانی کردنـە پەیوەنـدی بـە سیاسـەتی گشـتییەوە هەیـە بۆیـە پێویسـتە کۆنفرانسـی بـۆ ئامـادە بکرێـت.

ج) لـەدوای وتوویـژی زیاتـر سـەبارەت بـە دوایـن بڕگـەی نامەکـەی مسـتەر ئەلێکـس لویـن لـە رۆژی ٢١ی کانوونـی دووەم دا کـە ئامـاژەی بـەوە دەکـرد: ترسـی کـوردەکان لەوەدایـە کـە بـە زۆر بنێردرێنـەوە بـۆ عێـراق، کـە ئـەوەش

ترسـێکی بـێ بنەمایـە، ڕێکەوتـن لەسـەر:

١. بەڵگـە لـەم وڵاتانـەدا کۆبکرێتـەوە لەڕێگـەی سـەرچاوە سـەربەخۆکان و لەنـاو کۆمەڵگـەی پەنابـەرە کوردییـەکان دا تاوەکـوو بزانرێـت ئـەم پرسـە چەنـد لەجێـی خۆیدایـە.

٢. داوا لـە (UNHCR) بکرێـت کـە لێـدوان لەسـەر هەڵوێسـتەکەی وەزارەتـی ناوخـۆ بـدات و بەڵگـە پێشـکەش بـکات سـەبارەت بـە بارودۆخـی کوردانـی ئێـران.

لەمیانـەی وتووێژەکـەدا مسـتەر جـۆرج گێڵبـەر (کریسـتیان ئەیـد) پێشـنیاری کـرد کـە هەندێـک لـە ئەندامانـی گروپـی کـوردی و کۆمەڵگـەی دۆسـتایەتی بەریتانـی-کـوردی بانگهێشـت بکرێن بـۆ ئەوەی لەپێنـاو پشـتیوانیکردنی (BCAR) دا گروپێکـی بچـوک پێکبهێنـن و لەکاتـی پێویسـتدا راوێژیـان لێوەربگیرێـت.

ب) دەزگـای زانکـۆی جیهـان - بـۆ کۆمەکـی دارایـی خوێنـدکاری کـوردی پەنابـەر. مسـتەر ئالـن فلیپـس (دەزگـای زانکـۆی جیهـان) رایگەیانـد: دوو لەمپـەری سـەرەکی لەبـەردەم بەرەوپێشـچوونی ئـەم بەرنامەیـەدا:

أ. سـەختیی بەدەسـتهێنانی زانیـاری پێشـینەی بـاش لـە ئێرانـەوە سـەبارەت بـەو خوێندکارانـەی کـە زۆرتریـن سـود لـە زەمالەکانـی (WUS) وەردەگـرن کـە کۆرسـەکان و هەندێـک بابەتـی پەرەپێدانیـان پێدەدرێـت. زۆر پێویسـت بـوو کـە لیژنەیەکـی WUS لـە ئێـران دا هەبێـت، کـە بتوانرێـت لـە ڕێگەیـەوە ئـەم زانیارییانـەی بـۆ ئاراسـتە بکرێـت. هەروەهـا هیـوای ئـەوە خـوازرا کـە لـە ڕێگـای نوێنـەری UNHCRەوە لـە ئێـران چەنـد پەیوەندییـەک دروسـت بکرێـت.

ب. چەنـد بەڵێنێکـی کاتـی دران و چەنـد بەشـدارییەکی دڵنیاکـەرەوە پێشـکەش کـران - ئۆکسـفام ڕەزامەنـدی دەربـڕی کـە پێنـج هـەزار پاوەنـد بـدات.

کریسـتیان دەبـوو لـە ماوەیەکـی کەمـدا ئـەم بابەتە لەگـەڵ لیژنـەی خۆرهەڵاتی

ناوەڕاستەکەیدا باس دەکات و هیوای وایە بەشێک لەو بودجەیەی کە بۆ هاوکاریکردنی کوردانی سەردەمی شەڕ تەرخان کراوە، ئەوا بۆ ئەم مەبەستە دابین بکرێت.

سکرتێر ئاماژەی بەوەدا کە ڕێکخراوی فەندی منداڵپارێز لەوە دەکۆڵێتەوە و، لە هەر خولێکی داهێنانی خوێندکاران دەکۆڵێتەوە کە ئامانجەکەی تەندورستی یاخود چاودێری منداڵان بێت.

لە وەڵامی پرسیارێکی سکرتێردا سەبارەت بە کۆمەڵگەی دۆستایەی بەریتانیایی-کوردیی کە لە یەکێک لە بڕگەکانیدا باس لە دابینکردنی هەلی خوێندنی کردووە بۆ کوردەکان لە شانشینی یەکگرتو و، هەروەها ئامادەکاری بۆ یارمەتیدانیان لە بوارەکانی زەماڵە و ڕاهێناندا، سەرۆک ڕەزامەندی نیشان دا کە لە AGM پشتیوانی لەم بابەتە بکات و هەوڵبدات سەرنجی ئەندامانی کۆمەڵەکە ڕابکێشێت و هانیان بدات لەم هەڵمەتی کۆکردنەوەی کۆمەکەدا یارمەتی بدەن.

## ٦) بارودۆخی پەنابەران لە ئێران و لە عێراق.

### عێراق

مستەر عەلی ئاماژەی لە ڕاپۆرتێکی دا کە لەلایەن "ئێم. جەی. سی. لوپی" سەر بە کۆمەڵەی سویسرا بۆ مافەکانی مرۆڤەوە ئامادەکرابوو، ئاماژە بەوە دەکات حکومەتی عێراق دەیەوێت نزیکەی یەک ملیۆن کورد لە ماڵەکانی خۆیان ڕاگوێزێت و ڕەوانەی باشورییان بکات. ئەم ڕاپۆرتە پێشتر خراوەتە بەردەم کۆمسیۆنی مافەکانی مرۆڤی نەتەوە یەکگرتووەکان و لە ڕۆژنامەی گاردییانی ڕۆژی ٤ی شوباتدا بڵاوکراوەتەوە. ئەم هەواڵە نیگەرانییەکی زۆری لە جڤاتی کوردیدا دروست کرد: دیارە تائێستا نزیکەی ٢٠٠ هەزار کەسێک ڕاگوێزراون و جێگاکانیان لە باکور بە عەرەب پڕ دەکرێتەوە. وردەکاری ئەم

بابەتـە لـە راپۆرتەکـەی پارتـی دیموکراتـی کوردسـتاندا بەسـەر ئامادەبووانـدا دابـەش کـرا.

راپۆرتـی هاوشـێوە لەلایـەن فاینەنشـیاڵ تایمـز و تایمـز (رۆژی ٢٧ی تشـرینی دووەمـی ١٩٧٥)ەوە بڵاوکراوەتـەوە و هەروەهـا بابەتەکـە لەلایـەن کۆمەڵێـک رۆژنامەنوسـی هۆڵەندیشـەوە ئامـاژەی پـێ دراوە کـە سـەردانێکی زۆر کورتیـان بـۆ عێـراق ئەنجـام داوە و بەزوویـی داوایـان لـێ کـراوە ئـەو وڵاتـە بەجـێ بهێڵـن. ئـەو گروپـە نێودەوڵەتیـی و تاکـە کەسـییانەی کـە حەزیـان کـردووە لـە بارودۆخەکـە بکۆڵنـەوە رێگـای چوونەنـاوەوەی عێراقیـان پـێ نـەدراوە.

مسـتەر عەلـی پرسـیاری کـرد: ئایـا دەکـرێ ئـەم کەسـانە لـە چوارچێـوەی (پەنابـەر)دا پۆلێـن بکرێـن یـان نـا، بەشـێک لـەم کەسـانەش کـە گەڕاونەتـەوە بـۆ عێـراق لـە ئێـران پەنابـەر بـوون. ئەگـەر پەنابـەر بووبـن، ئایـا ئـەم کۆنفرانسـە ئامادەیـە دەتوانێـت یارمەتییـان بـدات؟

سـکرتێر هەوڵـی دا نوسـخەیەک لـە راپۆرتەکـەی "ئێـم. لوپـی" دەسـتبکەوێت بـەڵام هێشـتا بەدەسـتی نەگەیشـتووە.

سـەرۆک ئامـاژەی بەوە دا کـە لەبەرئەوەی ئـەم بابەتـە بابەتێکـی نێودەوڵەتییە لـە چوارچێـوەی عێراقـدا، بۆیە باشـترین هەنگـاو ئەوەیە:

أ) راستەوخۆ لەگەڵ حکومەتی عێراق ئەنجام بدرێت.

ب) لـە رێگـای کەناڵـە دیپلۆماسـییەکانەوە و لەلایـەن حکومـەی شانشـینی یەکگرتـووەوە - یاخـود لەلایـەن حکومەتـی دیکـەوە ئەنجـام بدرێـت.

ج) لە رێگەی پرسیارەوە کە لە پەرلەمان بپرسرێت.

وتووێژ لەسەر باشترین رێگاکانی ئەنجامدانی ئەم کارە ئەنجام درا.

مسـتەر لیـا لێڤیـن (UNA) رایگەیانـد: کـە (UNA) چەنـد هەنگاوێکی نـاوە تیایدا

نوێنەرێکیان ناردووە بۆ لای باڵیۆزی عێراق لە لەندەن، لە کۆبونەوەکەدا باس لە مەسەلەی هەڵکەندنی کوردەکان لە باکور و پەرش‌وبڵاوکردنیان بە باشووری وڵاتدا باسکراوە. باڵیۆزەکە لێدوانێکی داوە کە لەم خاڵانەی خوارەوەدا خۆی دەبینێتەوە:

أ) بارودۆخی کەمپی پەنابەرە کوردەکان لە باشوری وڵات باشە و وەکوو بارودۆخی عێراقیەکانی دیکەی دراوسێیانن.

ب) ئەو کوردە پەنابەرانەی کە گەڕاونەتەوە بۆ عێراق ڕێگایان پێ نەدراوە بچنەوە ماڵەکانی خۆیان. لەبەر ئەوەی کە ناوچە نەوتییەکانی باکوریان بەجێهێشتووە و حکومەت هیچ ناچار نیە ڕێگایان بدات کە بگەڕێنەوە بۆی.

ج) هیچ پێویست بە هاوکاری دەرەکی ناکات، عێراق خۆی دەتوانێت کێشەکانی چارەسەر بکات.

باڵیۆزەکە بانگێهشتێکی کراوەی پێشکەشی (UNA) کردووە تاوەکوو هەر کاتێک بیەوێت سەردانی بکات و بابەتی دیکەی لەگەڵدا باس بکات. هەروەها نامەیەکی بۆ ڕۆژنامەی تایمز ناردووە کە تیایدا ئاماژەی بەوە کردووە تەنیا چەند پەنابەرێکی کوردی زۆر کەم پەرشوبڵاو کراونەتەوە.

لە وتووێژەکەدا گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە ئەم بابەتە بەڕاستی کێشەی پەنابەرێتی نییە، بۆیە ڕاستەوخۆ با ببێتە بابەتی ناو کۆنفرانسی ئامادەوە. پێشنیاری ئەوە کرا کە کۆمەڵگای دۆستایەتی بەریتانی-کوردی و UNA کاری زیاتر لەسەر ئەم بابەتە بکەن، وەک بەدواداچونێک بۆ هەنگاوەکەی بەرەو باڵیۆزخانەی عێراق و، لە ڕێگای کۆمەڵەی پەرلەمانیی نەتەوەیەکگرتووەکان بۆ مافەکانی مرۆڤەوە، کۆمەڵێک پرسیار ئامادە بکات کە لە پەرلەمان (House of Commons)دا ئاراستە بکرێت.

مستەر غەفوری ئاماژەی بە یاسایەکی نوێ کرد کە لەلایەن حکومەتی عێراقەوە دەرکراوە، بەوەی: هەرکەسێک بەبێ رەزامەندیی حکومەتی عێراقی زەمالەی خوێندن لە هەر حکومەتێک بەدەست بهێنێت ئەوا دەخرێتە زیندانەوە. باسی حاڵەتی پزیشکێکی کوردی کرد کە پێشتر هاتووەتە شانشینی یەکگرتوو و داوای بەڵگەنامەی زیاتریان لێ کردووە، بۆیە پرسیار سەبارەت بە پێشینەی ناوبراو لە حکومەتی عێراق کراوە، حکومەتی عێراقیش رایگەیاندووە: کە ئەم کەسە شایستە نییە، لەکاتێکدا کە ئەو کەسە بەراستی شایستە بووە و چەند ساڵێک وەکوو پزیشک ئەزمونی کارکردنی هەبووە. دەتوانرێت چ هەنگاوێک بنرێت بۆ ئەوەی سەرنجی لایەنەکان بۆ سەر ئەم یاسایە رابکێشرێت؟

رێککەوتن کرا لەسەر أ) زانیاری زیاتر لەبارەی ئەم یاسایەوە بەدەست بهێنرێت و، ب) دەزگای زانکۆی جیهان و رەنگە بە هاوکاریی لەگەڵ دەزگای دیکەی خوێندکاریی وەک یەکێتی نیشتمانیی خوێندکاران، لە کۆبوونەوەی داهاتویدا ئەم بابەتە بخاتە بەردەم لیژنەکەی.

٧. کاری UNHCR سەبارەت بە کوردانی پەنابەر:

مستەر جین هێدلەر رایگەیاند: کە مستەر لێسلی گودیەر کە بەرپرسی ئەرکەکانی UNHCRە لە تاران ئەوا دەستی بە کارەکەی کردووەتەوە. تائێستا زانیارییەکی زۆرکەم لەناوبراو و لە جنێفەوە بەدەست گەیشتوون. نزیکەی ١٤٠٠ داوا لەلایەن ئەو کوردانەی کە دەیانەوێت ئێران بەجێ بهێڵن خراوەتە بەردەم UNHCR. لەو ژمارەیەش ٧٠٠ کەس دەیانەوێت بچنە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ١٠٠ کەس بۆ ئوسترالیا، ٧٠ کەس بۆ شانشینی یەکگرتوو، و رەنگە ٣٥٠ کەسیش بۆ کەنەدا بێت. رەنگە ئەوانەی

دەیانەوێت ئـەو وڵاتـە بەجـێ بهێڵـن لـە ١٤٠٠ کـەس زیاتـر بـن، بـۆ هەمـوو ئـەو کەسـانە ئاسـان نیـیە کـە پەیوەنـدی بکـەن بـە UNHCRەوە و هەروەهـا هەموشـیان نازانـن کـە چـۆن ئـەم کارە بکـەن.

هەر بابەتێکی دیکە

"مسـتەر میـران" کـە کوردێکی پەنابەرە و ئێسـتا لـە بەریتانیایە بـە ئامادەبووان ناسـێنرا. سـەرۆک هیـوای خواسـت ناوبـراو بتوانێـت ژیانێکـی نـوێ لـەم وڵاتـەدا دابمەزرێنێت.

### ١: پێشەکی:

ئـەم راپۆرتـە بـاس لـەو بەرنامەیـە دەکات کـە دەزگـای زانکـۆی جیهـان (شانشـینی یەکگرتـوو) لەبـری کۆمەڵێـک دەزگـای پەرەپێـدان و دەسـتەی پەنابەرێتـی لەپێنـاو یارمەتیدانـی خوێندکارانـی کـوردی پەنابـەرەوە دایرشـتووە.

ئـەم بەرنامەیـە ئامانجـی یارمەتیدانـی ٥٠ خوێنـدکاری کـوردە کـە بەهـۆی شـەڕی کوردسـتانەوە لـە خوێندنەکەیـان دابـڕاون و دەربـازی ئێـران بـوون و ئێسـتاش ناتوانـن بگەڕێنـەوە بـۆ عێـراق و، ناشـتوانن لـە وڵاتانـی دراوسـێ یاخـود وڵاتانـی عەرەبیـدا هەلـی شایسـتە بەدەسـت بهێنـن. ئامانـج لـەم بەرنامەی پەرەپێدانـە دابینکردنـی زەماڵـەی خوێندنـی باڵایـە لـە شانشـینی یەکگرتـوودا بـۆ خوێندکارانـی "پزیشـکی ددانسـازی، ئەندازیـاری مەدەنـی، کشـتوکاڵ و زانسـتە کۆمەڵاتییـەکان". هەرچەنـدە لایەنـە مرۆییـەکان لەبەرچـاو دەگیردێن، بـەڵام زیاتر جەخـت لـە پشـتیوانی کوردانـەی ئـەو خوێندکارانـە دەکرێتـەوە کـە ئاواتەخـوازن خزمەتـی خەڵکـی کوردسـتان بکـەن و حەزدەکـەن لەوکاتـەدا بتوانـن بگەڕێنـەوە بـۆ ئـەو ناوچەیـە.

پێویسـتی سـەرەکی بریتییـە لـە: کۆمەکـی دارایـی هـەر خوێندکارێـک کـە سـاڵانە پێویسـتی بـە ١٤٢٠ پاوەنـدە. بـەم جـۆرە ئامانجـی سـەرەتایی بریتییـە لـە

٧١ هــەزار پاوەنــد و بــۆ ســاڵانی داهاتــووش پێویســتی بــە برێکــی زیاتــرە.

**٢) ناساندن:**

کۆنفرانــس ئامادەیــی ڕێکخــراوە بەریتانیەکانــی بــۆ یارمەتیدانــی پەنابــەران (Scboar) بـاس کـرد، لـە سـاڵی ١٩٧٤دا لیژنەیـەک پێکهێنـراوە بـۆ ئـەوەی بڕیـار بـدات کـە ئایـا چ بەخشـینێکی هاوکارییـەکان بـۆ کـوردەکان ئـەوا لـە کاریگەرییـە نەرێنییەکانـی شـەڕەکە لەسـەریان کـەم دەکاتـەوە. لیژنەکـە نوێنەرانـی هەمـوو ڕێکخــراوە ســەرەکییەکانی بــواری پەرەپێــدان و پەنابەرانــی لــە شانشــینی یەکگرتــوو لەخۆگرتبــوو، هــاوکاران لەگــەڵ نوێنــەری (UNHCR) لــە لەنــدەن و هەروەهـا نوێنـەری پارتـی دیموکراتـی کوردسـتان و کۆمەڵـە ڕۆژنامەنوسـێک لـە کوردسـتانەوە بۆنـاو کۆبونـەوەکان بانگهێشـت کـرد بـوو.

لــە کۆتایــی شــەڕەکەی مانگــی ئــازاری ١٩٧٥، (SCBOAR) ســەرنجی خســتە ســەر ئــەو هاوکارییــەی کــە دەتوانێــت بــۆ پەنابەرانــی کــوردی دابیــن بــکات بەتایبەتــی بــۆ ئــەو کەســانەی کــە لــە ئێــران جێگیــر نەبــوون و ناشــتوانن بگەڕێنـەوە بـۆ عێـراق، بـە لەبەرچاوگرتنـی ئـەو بڕیـارەی حکومەتـی بەریتانیـا کە بـۆ یارمەتیدانـی پەنابـەران لـە ڕێگـەی پێدانـی کۆمەکـی سـەرەتاییەوە داویەتـی تا ئەوکاتـەی کارێکـی گونجـاو دەدۆزنـەوە، بڕیـاری ئـەوەدرا کـە هاوکارییەکـە چـڕ بکرێتـەوە بـۆ سـەر ئـەو خوێندکارانـەی کـە پەنابـەرن و حەزدەکـەن ڕووبکەنـە شانیشـینی یەکگرتـوو بـەڵام هەلـی زەماڵـەکان نایانگرێتـەوە.

بەهــۆی ئەزمونــی دەزگــای زانکــۆی جیهانــەوە لــە بــواری پەرەپێدانــی بەرنامەکانـی زەماڵـە لـە شانشـینی یەکگرتـوو، ئـەم دەزگایـە لەلایـەن (SCBOAR) ەوە بانگهێشـت کـرا بـۆ دارشـتنی بەرنامەیـەک بـۆ خوێندکارانـی کـورد و بـۆ کۆکردنــەوەی کۆمەکــی دارایــی و، هەڵبژاردنــی کاندیــدەکان و بەڕێوەبردنــی زەماڵــەکان. تێکــڕای هەلومەرجــی کــوردەکان خرایــە بەرچــاوی بەرپرســی

دەزگاکــە و ئەویــش ســەرەڕای داوایەکــی زۆر کــە بــۆ یارمەتیــدان خرابــووە بەردەمــی، ئــەم بابەتــەی وەک پڕۆژەیەکــی گرنــگ قبــوڵ کــرد.

لیژنەیەکــی خوێندکارانــی کــوردی پەنابــەر لــە دەزگــای زانکــۆی جیهــان لــە مانگــی ئایــاردا دامــەزرا کــە (کەســانی ئەکادیمــی و نوێنەرانــی) (SCBOAR) "کریســتیان ئەیــد، وارئــۆن وەنــت، کۆمەڵگــای دۆســتایەتی ئینگلیــز- کــورد و پارتــی دیموکراتــی کوردســتان" تیایــدا بەشــدار بــوون. ئــەم ڕاپۆرتــە لەســەر بنەمــای ڕاوێــژی ســەرەتای لیژنەکــە ئامادەکــراوە.

**٣) پێشینە**:

نەهامەتییەکانــی کــورد و دواکەوتنەکانــی هەرێمــی کوردســتان لەلایــەن دەزگاکانــی پەرەپێدانــەوە زۆر ڕوون و ئاشــکران، ئــەم بابەتــە زۆر بــە باشــی لــە ڕاپۆرتەکانــی ئەمســاڵی ڕێکخــراوی وەک وارئــۆن وەنــت، کۆمەکــی منداڵپارێــز و گروپــی مافەکانــی کەمینــەدا تۆمارکــراوە، لــەو بەشــە دورەدەســتەی خۆرهەڵاتــی ناوەڕاســتدا کــوردەکان بوونەتــە ڕەگەزێکــی لەبیرکراو کــە ســاڵانێکی زۆرە لەپێناو مافــی چــارەی خۆنوســین و پشتبەســتن بــە خەباتەکەیــان بــۆ بەرەوپێشــچوونیان هەوڵێکــی زۆریــان داوە. ئەمــەش لــە پەنجــا ســاڵی ڕابــردوودا چەنــد جارێــک جەنــگ و تەنانــەت تەنگــژەی زیاتــری ئابوریــی بــۆ کوردانــی تورکیــا و ئێــران و عێــراق لێکەوتووەتــەوە.

زۆربــەی ژیانــی کــوردەکان تائێســتاش بــەدەوری خێڵــدا دەخولێتــەوە. کــوردە جوتیــارەکان کــە لــە ناوچــە شــاخاوییە دورەدەســتەکاندا دەژیــن و زۆربــەی گوندەکانیــش لــە چەنــد ســەد کەســێکی کــەم تێناپەڕێــت، ئــەوا نــە هەلــی گەشــەکردنی ئابورییــان هاتووەتــە بــەردەم و نــە ڕێگــەی پەیوەندیکردنێکــی باشــتریان هەبــووە کــە بتوانــن هەلومەرجــە کۆمەڵایەتیــە ئابورییەکەیانــی

پـێ بگـۆڕن. زۆربـەی جـار ژیانـی ئـەم کەسـانە لەژێـر دەسـەڵاتی دەرەبەگـە خـاوەن زەوییەکانــدا بــووە و دابەشــکردنی زەویــش تاڕادەیەکــی ناشــیرین نایەکسـان بـووە، چاکسـازی لـە بـواری زەویوزاردا بـەردەوام یەکێـک بـووە لـە داواکارییەکانــی بزوتنــەوەی کــورد.

لەبـەر ئـەوەی لـە کوردسـتان تەنیـا چەنـد شـارێکی سـەرەکی هـەن، بۆیـە دەبێـت بـۆ هەلـی راسـتەقینەی خوێنـدن رووبکەنـە پایتەختـە دورەکانـی ئـەو وڵاتانـەی باسـکران. لـەم چەنـد دەیـەی دواییـدا دەسـتەبژێرێکی رۆشـنبیر لـە مەنفـادا لـە زیادبوونـدان- کـە زۆرجـار هەڵبـژاردەی کەسـەکان خۆیـان بـووە، ئەمانـە: دەرچوانـی زانکۆکانـی خۆرهەڵاتـی ناوەڕاسـت، ئەوروپـای خۆرئـاوا و باکـوری ئەمریـکا لەخۆدەگـرن. ئـەم دەسـتەبژێرە رۆڵـی لـە گەشەسـەندنی بزووتنــەوەی نەتــەوەی کــوردا بینیــوە و زۆرجــار پشــتیوانی لــە کەرامەتــی کلتــوری کــوردی و ســەربەخۆیی دەکات.

لــە عێــراق، هــەروەک پارچەکانــی دیکــەی کوردســتان، بەڵگــە لەســەر هەلاوێرکـردن دژی کـورد لـە کۆلێجەکانـی "پزیشـکی و ددانسـازی و کشـتوکاڵ و ئەندازیـاری" لەبەردەسـتدایە. ئـەم هەڵاوێرکردنـە کـۆی بـواری پـەروەردەی گرتووەتـەوە. رێـژەی ئـەو کوردانـەی لـە قۆناغـی ناوەندیـدا دەخوێنـن نیـوەی رێـژەی عەرەبەکانـن. هەرچەنـدە کـوردەکان نزیکـەی ٢٠٪ی دانیشـتوانی عێـراق پێـک دەهێنـن، بـەڵام کەمتـر لـە ٧٪ی خوێندکارانـی زانکۆکانـی عێـراق پێـک دەهێنـن. نەخوێندەواریـی لـە ناوچـە کوردییـەکان زۆر لـە ناوچەکانـی دیکـەی عێـراق زیاتـرە. لـە ناوچـەی هەولێـردا ٨٠٪ی پیـاو و منـاڵان و ٩٩,٥٪ی ژنـان نەخوێنـدەوارن. لەکاتێکـدا بەپێـی خەمڵاندنـی سـاڵی ١٩٧٠ی یونسـکۆ کـە بـۆ تێکـڕای وڵاتـان عەرەبـی ئەنجـام دراوە، دەریدەخـات کـە ٦٠,٥٪ی پیـاوان و ٨٥,٧٪ی ژنـان نەخوێنـدەوارن.

بۆیــە پێویســتە مەســەلەی خوێندنــی بــاڵا کــە لــەم چوارچێوەیــەدا و بــە

لەبەرچاوگرتنی ئامادەکاری بۆ پەروەردەکردنی مامۆستا و پزیشک و پیشەمەندی داهاتوو تەماشا بکرێت. خوێندنی باڵا لە ناوچە کوردییەکانی عێراق بەهۆی شەڕەکەوە زیانێکی گەورەی بەرکەوتووەو تاکە زانکۆی کوردی لە سلێمانی لە رۆژی ١٢ی ئازاری ١٩٧٤دا لەلایەن سوپا و تانکەکانییەوە داگیرکرا، لەئەنجامدا جڤاتی زانکۆ ناچارکران شاری زانکۆکە بەجێبهێڵن و زۆربەیان روویان کردە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی کوردەکانەوە.

لە نیسانی ١٩٧٤یشدا، کاربەدەستانی زانکۆ بڕیاریاندا وانەکانیان لە مانگی ئایاری ١٩٧٤ەوە لە شاری قەڵادزێ دەست پێبکەنەوە. لە ٢٤ی نیساندا هێرشی ئاسمانی کرایە سەر ئەو شارۆچکەیە و زۆرێک لە بیناکانیان روخاند و، زۆرێک لە خوێندکار و ستافی ئەکادیمیشیان کوشت و بریندار کرد. لەئەنجامی ئەمەدا زانکۆکە نەیتوانی خۆی لە قەڵادزێ دابمەزرێنێ و ، لە مانگەکانی نیسان و ئایاردا یانزە خوێندکاری زانکۆی بەغدا کە هاوسۆزیان بۆ کوردەکان هەبوو لەسێدارەدران. دوای ئەوەش ٥٥١ خوێندکاری کورد زانکۆکانی عێراقیان بەجێهێشت و خۆیان دەربازی کوردستان کرد، زۆرێک لەمانە و خوێندکارانی دیکەش لە ماوەی شەڕەکەدا و یاخود ماوەیەکی کورتی دوای شەڕەکەش روویان کردە ئێران. وادەزانرێت کە چەند هەزار خوێندکارێکی ناوەندی و زانکۆ ناتوانن بگەڕێنەوە بۆ عێراق، ئەمەش بەهۆی چالاکییە ئاشکراکانیان لەکاتی شەڕەکەدا و ترسیان لە عێراق. لەگەڵ ئەوەشدا، کارێکی گونجاویشە کە بەشێکی زۆری ئەم کەسانە بێنە شانشینی یەکگرتووەوە، هەر بۆیە ئامانجە سەرەتاییەکە لە ٥٠ خوێندکاردا خۆی دەبینێتەوە.

### ٤) بەرنامەی دەزگای زانکۆی جیهان (شانشینی یەکگرتوو):

بەرنامەکەی دەزگای زانکۆی جیهان لە روانگەی نێودەوڵەتیی دەزگاکەوە دارێژراوە، کە مەبەست لێی یارمەتیدانی ئەو کەسانەیە کە لە بواری

خوێندنــدا هەڵاوێــردراون و هەلــی خوێندنــی گونجاویــان بــۆ دابیــن دەکات. هەرچەنـدە بەرنامەکـە پێکهێنەرێکـی گرنگـی مرۆیـی لەخـۆ دەگرێـت، بـەڵام بڕیـار دراوە تەنیـا یارمەتـی ئـەو خوێندکارانـە بدرێـت کـە بـە ئاشـکرا دیـار بێـت سـود لـە شانشـینی یەکگرتـوو دەبینـن و ناتوانـن یارمەتـی لـەوە باشـتر لـە شـوێنی دیکـە وەربگـرن، هەروەهـا ئـەو کەسـانەش دەتوانـن لـە دواجـاردا لـە پەرەپێدانـی کوردسـتاندا بەشـدار بـن.

لــە ســەرەتادا زەمینەســازییەکە بــۆ ئــەو خوێندکارانــە دەبێــت کــە ئاســتی ئەکادیمیــان باشــە و لــە خوێندنەکانیــان لــە بوارەکانــی "کشــتوکاڵ، ئەندازیــاری مەدەنــی، پزیشــکی و زانســتە کۆمەڵایەتیــەکان"دا دابــڕاون. وا باشــترە کــە ئــەم خوێندکارانــە زمانــی ئینگلیــزی بزانــن، بــەڵام لــەوە گرنگتر ئەوەیــە: کــە ئامادەییان تێدابێـت خزمەتـی گەلەکەیـان بکـەن. گرنگـە کـە ئـەم کارە نەبێتـە هـۆی کۆچـی خوێندەوارانــی کــورد، کــە دواتــر بچنــە نــاو کلتورێکــی خۆرئاواییــەوە و حــەز بــە گەڕانــەوە نەکــەن. هەوڵــەکان بەردەوامــن بــۆ دۆزینــەوەی ئــەو دەرفەتانــەی کــە دەتوانرێـت لـە خـودی ئێـران یـان لوبنـان و جەزائیـر بـۆ کـوردەکان دابیـن بکرێــت. ئەزمونەکانــی رابــردوو دەریــان خســتووە کــە دەرفەتــی لــەم جــۆرە زۆر ســنوردار دەبــن، هەروەهــا لەبــەر هــۆکاری سیاســیی ناخرێتــە بــەردەم خوێنــدکاران.

قۆناغــی ســەرەتایی ئــەم بەرنامەیــە: بەدەســتهێنانی کۆمەکــی داراییــە بــۆ زامنکردنـی زەماڵـە بـۆ مـاوەی سـێ سـاڵ، لەهەمـان کاتـدا کاندیـدەکان لـە رێگەی پارتــی دیموکراتــی کوردســتانەوە نــاوی خۆیــان بــۆ دەزگــای زانکــۆی جیهــان تۆمــار دەکــەن، بــەڵام ئــەم بەرنامەیــە بــە هیــچ شــێوەیەک تەنیــا بــۆ ئەندامانــی ئــەم حیزبــە نیيــە. کاتێــک کۆمەکــە داراییەکــە بەدەســت هێنــرا و پاڵێــوراوەکان هەڵبژێــران، دەزگــای زانکــۆی جیهــان کاندیــدەکان لــە زانکــۆ و پەیمانگاکانــی خوێندنـی بـاڵادا جـێ دەکاتـەوە و هانیـان دەدات کـە بێن بـۆ شانشـینی یەکگرتوو.

ئەگـەر لـەم هاوینـەدا کۆمەکـە داراییـەکان بەدەسـتبهێنین، ئـەوا دەتوانرێـت ئـەو پاڵێوراوانـەی کـە زمانـی ئینگلیزییەکەیـان باشـە لـە کۆرسـەکانی وەرزی پایـزدا بەشـداری پـێ بکرێـن، بـەڵام ئـەو خوێنـدکارە کوردانـەی دیکـە کـە دواتـر وەکـو پەنابـەر دێنـە ئـەم وڵاتـە، ئـەوا زمانـی ئینگلیزییەکەیـان پەرەپێـدەدەن و لـە سـاڵی داهاتـووی خوێندنـەوە دەسـت بـە خوێندنەکەیـان دەکـەن.

دەزگـای زانکـۆی جیهـان هـەوڵ دەدات ئەگـەر ئـەم خوێنـدکارە پەنابەرانـە بیانەوێـت، پەیوەندییـان لەگـەڵ بزوتنـەوە کوردییەکانـی شانشـینی یەکگرتـوودا بـۆ دروسـت بـکات و، کار بـکات بـۆ ئـەوەی ئامۆژگـاری و چاودێـری پێویسـتیان لەلایـەن زانکۆکانـەوە پـێ بدرێـت. لـە قۆناغەکانـی کۆتایـی خوێندنەکەیانـدا دەزگـای زانکـۆی جیهـان هەوڵـدەدات ئامۆژگاریـی و هاوکاریـی ئـەم خوێندکارانە بـکات کـە بـەدوای هەلـی کارکردنـدا لـە کوردسـتان یاخـود لـە رۆژهەڵاتـی ناوەراسـتدا بگەرێـن و هەمـوو بەهرەکانیـان لەپێنـاو (پەرەپێدانـدا) بخەنەگـەر.

## ٥) کارگێری:

بەرنامەکـە لەلایـەن سـکرتارییەتی دەزگـای زانکـۆی جیهـان (شانشـینی یەکگرتـوو)ەوە بەرێوەدەبرێـت کـە ئەزمونێکـی بەرچـاوی لـە بەرنامـەی لـەم جـۆرەوە هەیـە. بریـار لەسـەر شـێوازی بەرێوەبـردن و هەڵبژاردنی پاڵێـوراوەکان لەلایـەن لیژنـەی خوێنـدکارە کـوردە پەنابەرەکانـەوە دەدرێـت و ئـەم بریـارەش پێویسـتی بـە رەزامەنـدی بەرپرسـی دەزگـای زانکـۆی جیهانـە. وەک لـە پێشـەکییەکەدا بـاس کـرا نوێنـەری زۆر لایـەن لەخـۆ دەگرێـت و دەتوانێـت زۆر لـە نزیکـەوە لەگـەڵ ئـەو دامەزراوانـەدا لـە پەیوەندیـدا بێـت کـە لـە بـواری کـورد چ لـە نـاوەوە و چ لـە دەرەوەی شانشـینی یەکگرتـوودا کاردەکـەن.

لـەم سـاڵانەی دواییـدا دەزگـای زانکـۆی جیهـان (شانشـینی یەکگرتـوو) زیاتـر لـە ٢٠٠ زەمالـەی خوێندنـی بـۆ خوێنـدکارە پەنابـەرە چیکۆسـۆڤاکییەکان

بەڕێوەبـردووە، زیاتـر لـە ٣٠٠ خوێنـدکار و مامۆسـتای ئۆگەنـدای ئاسـیایی جێکردووتـەوە و، لـە ئێسـتادا لە هەوڵی پەرەپێـدان و بەڕێوەبردنـی بەرنامەیەکدایە بـۆ ٢٠٠ خوێنـدکاری (چیلـی)، کـە ئەگـەر ئـەم بەرنامەیـە سـەرکەوتوو بێـت ئـەوا ژمـارەی کورسـییەکانی خوێنـدن دەکرێـت بـە دوو ئەوەنـدە. شـارەزایی بەدەسـت هێنـراوە سـەبارەت بـە: کێشـەکانی بەدەسـتهێنانی زانیـاری پێویسـت لەبـارەی پاڵێوراوەکانـەوە، پاراسـتنی پەیوەنـدی بـاش لەگـەڵ زانکـۆ و کەسـانی ئەکادیمـی، بەشـداریکردنی خوێنـدکاران لـە کۆرسـی پەیوەندیـدار و دابینکردنـی فیـزە لـە ڕێگـای وەزارەتـی ناوخـۆوە، ئاشـناکردنی خوێنـدکارەکان لەگـەڵ گەیشـتنیاندا، هەروەهـا شـارەزاییەکی بـاش لـە چاودێریکردنـی گەشـەی خوێنـدکاران بـە درێژایـی مـاوەی کۆرسـەکانیان. ئەمـەش بابەتێکـی ئاسـان نییـە، لەکاتێکـدا هـەم ڕێکخـراوەکان و هـەم داودەزگـا حکومییـەکان ئەوکاتـەی نەتوانـن خۆیـان بەرنامەیەکـی لەوجـۆرە دابڕێـژن ئـەوا بـۆ دارشـتنی ڕوو دەکەنـە دەزگـای زانکـۆی جیهـان.

دەزگـای زانکـۆی جیهـان لـە شانشـینی یەکگرتـوو، لـە پێگەیەکـی لەباردایـە چونکـە وەکـوو دەزگایەکـی خێرخوازیـی پەروەردەیـی تۆمارکـراوە. بـەم هۆیەشـەوە چالاکییەکانمـان سیاسـیی نیـن، بەڵکـوو پەروەردەیـن و لـە بـواری پەرەپێدانـدان، هـەر بۆیـە دەتوانـن کۆمەکـی دارایـی لـە متمانەپێکـراوان و سـەرچاوە حکومییـەکان وەربگـرن و، بەبـێ ئـەوەی ئـەم کۆمەکانـە لێکدانـەوەی سیاسـیان بـۆ بکرێـن، ئـەوا لـە شانشـینی یەکگرتـوو کۆمەکـی دارایـی بـۆ کاری خێرخـوازی لـە بـاج دەبەخشـرێت. هەمـوو حسـاباتەکان تۆمـار دەکرێـت و هەژمارێکـی جیـاواز بـۆ بەرنامـەی خوێنـدکارە کـوردەکان دادەڕێژرێـت. ڕێـکاری هەژمارکردنـی لـەم جـۆرەش بـۆ بەرنامـەی زەماڵـەی چیلییـەکان بەکارهێنـراوە و ئەوپـەڕی هەمـوو تێچووەکانـی دیکـە بـۆ بەڕێوەبردنـی بەرنامەکـە لـە ١٠٪ تێپـەڕ نـاکات. ئـەم تێچوونـەش بـە بـەراورد بـە تێچوونـەکان و دەزگاکانـی دیکـەی

زەماڵەی وەک (ئەنجومەنی بەریتانیا) زۆر کەمترە و هۆکارەکەشی ئەوەیە دەزگای زانکۆی جیهان هاوکار و لیژنەی لە زۆرێک لە زانکۆکاندا هەیە.

## ٦) بڕی پێویستی کۆمەکی دارایی:

سەبارەت بەو بڕەی خوێندکارێکی بیانی لە شانشینی یەکگرتوو پێویستی پێیە، ئەوا هەندێک مشتومڕ لە ئارادایە، هەرچەندە وا باشە بڕێکی زیاتر داوا بکرێت بۆ ئەوەی بتوانرێت یارمەتی ژمارەیەکی زۆرتری خوێندکارانی پێ بدرێت. بەڵام ئەگەر ئەم ژمارەیە بە زۆر بزانرێت، وەک لەوەی رێگا بدرێت خوێندکارەکان برسی ببن. ئەوا گریمانەی ئێمە وایە کە لەبەر ئەوەی خوێندکارەکان بە فیزەی پەنابەرێتی دێنە شانشینی یەکگرتووەوە تا ئەوکاتەی دەست بە خوێندنەکانیان دەکەن یاخود لەکاتی پشووەکاندا نەبێت ئەوا پێویستیان بە کۆمەک نابێت، لەم کاتانەدا خوێندکارەکان دەتوانن کاربکەن یاخود خۆیان بۆ کۆمەکی سەرەتایی ناونووس بکەن، بەهەمان شێوەی خوێندکارە بەریتانییەکان، هەروەها پێویست ناکات هیچ بڕێک بۆ تێچوونی فڕۆکە تەرخان بکرێت چونکە نوێنەری (UNHCR) لە لەندەن ئامادەی خۆی نیشان داوە لەم بوارەدا کۆمەکمان بکات، بەتایبەت ئەگەر ژمارەی خوێندکارەکان لە ١٠٠ کەمتر بێت، دەزگای زانکۆی جیهان دەشتوانێت زانکۆکان قایل بکات نرخەکانیان کەم بکەنەوە، هەرچەندە ئەم کارە لەم هەلومەرجە ئابوورییەی ئێستادا سەختترە، بەڵام لە رابردوودا بەشێوەیەکی سەرکەوتوو توانیومانە لە نیوەی حاڵەتەکاندا ئەم کارە بکەین.

ئەگەر پێویست بکات خوێندکاران لەسەرەتاوە دەست پێبکەن یاخود خوێندکارانی پزیشکی کە پێویستە پێنج ساڵ بخوێنن، ئەوا ئەمان پێویستیان بە پارەی ساڵی دووەم و سێهەمی زانکۆش دەبێت. ئەم تێچوونانەی خوارەوە تەنیا بۆ ساڵی ١٩٧٥ - ١٩٧٦ن. ئاشکرایە کە بۆ ساڵانی دواتر تێچوونەکان زیاد دەکەن، هەرچەندە ناتوانرێت بە دیاریکراوی تێچوونەکە بخەملێنرێت،

بـەڵام لەوانەیـە سـاڵانە لـە ١٠٪ بـۆ ٣٠٪ زیـاد بـکات.

| | |
|---|---|
| تێچووی فڕۆکە | سفر |
| مینحەی مەسرەف بۆ خوێندکارە سەڵتەکان | ٨١٠ |
| نرخی کۆرسەکان | ٣٢٠ |
| نەسرییەی جلوبەرگ کە لەسەرەتادا دەدرێت | ٧٠ |
| کۆرسی زمانی ئینگلیزی | ٥٠ |
| تێچووی هەمەچەشن بۆ نمونە (سەفەرکردن) | ٣٠ |
| تێچووی هەڵسوڕان | ١٤٠ |
| | ١٤٢٠ پاوەند |

مینحـەی مەسـرەف نەسـرییەکی سـتانداردە بـۆ خوێنـدکارە بەریتانییـەکان لـە لەنـدەن بـەڵام لـە یەکـەم سـاڵدا بڕێـک پـارەی دیاریکـراو بـۆ جلوبـەرگ و هەروەهـا بـۆ ڕاهێنانـی زمانـی ئینگلیـزی دابیـن دەکرێـت کـە لـە سـاڵانی داهاتـوودا پێویسـت بـەم مینحانـە نـاکات.

**نهێنی**

**وێنەیەک بۆ مستەر لیدەر، مستەر ویلیامز و، سێر ریچارد کینگ.**

**رەشنووسـی راپۆرتێـک بـۆ وەزیـری پەرەپێدانـی دەرەوە سـەبارەت بـە هاوکارییکردنـی خوێندکارانـی کـورد**

**کێشە**:

چۆنێتـی وەڵامدانـەوەی نامەکـەی دەزگـای زانکـۆی جیهـان (WUS) کـە داوای بـڕی ٢٥ هـەزار پاوەنـد دەکـەن لـە بودجـەی هاوکاریـی سـاڵی ١٩٧٦/١٩٧٧ بـە مەبەسـتی هاوکاریـی خوێنـدکار و کەسـانی ئەکادیمیـی کـورد، تاوەکـو بتوانـن هەلـی زیاتـری خوێندنـی بـاڵا لـە بوارەکانـی "پزیشـکی و پزیشـکی ددان و ئەندازیاریـی مەدەنـی و کشـتوکاڵ و زانسـتە سیاسـییەکان" لـە شانشـینی یەکگرتـوو بەدەسـت بهێنـن. رایـت ریڤێرانـد، تریڤـۆر هەدلسـتۆن، ڤلیـپ وایتهێـد (ئەنـدام پەرلەمـان) و، و رەسـڵ جۆنا**1** "ن (ئەنـدام پەرلەمـان) کـە هەموویـان پشـتیوانی لـە کۆمەڵگـای دۆسـتایەتی بەریتانـی- کـوردی دەکـەن. نامـەی هاوشـێوەی دیکـەش لـە مایـکڵ دەمێـت (لـە ئـۆڵ سـۆوڵز کۆلێجـی ئۆکسـفۆرد) و پرۆفیسـۆر ئادامـە کێـرڵ (لـە زانکـۆی برادۆفـۆرد)ەوە بەدەسـتی گەیشـتووە. وەزارەتـی دەرەوە و کۆمۆنوێڵزیـش چەنـد داوایەکـی هاوشـێوەی بەدەسـت گەیشـتووە.

**مشتومڕ**:

٢. چەندیـن سـاڵە کـوردەکان لەپێنـاوی بەدەسـتهێنانی مافـی چـارەی خۆنووسـین و سـەربەخۆیی لـە عێراقـدا خەبـات دەکـەن. ئەمـەش بارودۆخێکـی

جەنگیی لە ساڵی ١٩٧٤ و سەرەتاکانی ١٩٧٥ دا لە باکوری عێراق لێ کەوتووەتەوە. لەسەرەتای ساڵی ١٩٧٥دا ڕێککەوتنێک لەنێوان عێراق و ئێراندا واژۆ کرا و، لێبوردنێک بۆ ئەو کوردە پەنابەرانە دەرکرا کە خۆیان دەربازی وڵاتانی دراوسێی عێراق کرد بوو. زۆرێک لە کوردەکان هەستیان دەکرد ناتوانن بگەڕێنەوە بۆ عێراق و هەندێکیشیان بۆ خوێندن هاتوونەتە بەریتانیا. ئەمەش بووەتە هۆی دارشتنی بەرنامەکەی دەزگای زانکۆی جیهان (WUS).

٣. ئێمە پێشتر لەسەر ئەم بابەتە نامەگۆڕینەوە و کۆپی نامەیەکی "رایت ریڤیتراند تراڤۆر هەدلستۆن"مان بۆ وەزیر (مسز هارت) و، هەروەها وەڵامەکەی ناوبراومان بەدەست گەیشتووە. بەگشتی ئێمە تەنیا دەتوانین لەسەر ئاستی "حکومەت بۆ حکومەت" هاوکاری پێشکەش بکەین، یاخود لە وەڵامی داوایەکدا کە ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتی ئاراستەی کردبین. حکومەتی عێراق داوای هاوکاریی بۆ ئەم کوردە یاخییانە ناکات؟ کە بێ ئومێدن بەوەی هیچ ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتی بە هانای داواکانیانەوە نەچووە. لەگەڵ ئەوەشدا، نامەکەی WVS ئاماژە بە بەرنامەی خوێندکارە چیلی و هیندۆ-چینییەکان دەکات کە لەبری ئێمە بەڕێوەی دەبەن، ئەمەش وەک پێشینیەک بۆ بەشداری لە دانانی نەخشەی بنەڕەتی بۆ بەرنامەی خوێندکارانی کورد باس دەکەن.

٤. پێشینەی بەشدارییەکە سەبارەت بە خوێندکارە چیلی و هیندۆ-چینییەکان هاوپێچکراوە. هیچ یەک لەو حاڵەتانە لەگەڵ کەیسی کوردەکاندا بە تەواوی هاوتەریب نییە. هەندێک هاوتەریبی لەگەڵ باودۆخی چیلییەکاندا هەیە، ئەمەش لە زۆر ڕووەوە پێشینەیەکی سەختی دروست کردووە و ڕەنگە ببێتە هۆی فشاری زیاتر لە دەزگای زانکۆی جیهان "WUS" ەوە، تاوەکوو ڕێوشوێنی هاوشێوە بگرنە بەرو فراوانتری بکەن بۆ ئەوەی خوێندکاران لە

لوبنـان و ئۆرۆگـوای و ئیتیۆپیـا و ئۆگەنـدا و هەروەها کوردی دیکەیـش بگرێتەوە. ئەمــە وای کــردووە وەزارەتەکــە بــە بەشــدارییەکەی ئێســتای ســەبارەت بــە خوێندکارانـی پەنابـەردا بچێتـەوە و چەنـد بنەمایـەک دابڕێژێـت کـە بەهۆیانـەوە کۆمەکـە داراییەکانـی داهاتـوو بـۆ خوێنـدکارە پەنابـەرەکان ڕێکبخـات. ئەمانـەش لــە ڕەشنووســێکدا کــە لەلایــەن بەشــی پــەروەردە و ڕاهێنانــەوە ئامادەکــراوە باســیان لــێ کــراوە و لەلایــەن وەزیرەکانــی ئــەم وەزارەتانــەوە ڕەزامەنــدی ســەرەتاییان لەســەرکراوە.

٥. هاوکاری ئێستامان بۆ عێراق بریتییە لە: بەرنامەیەکی ڕاهێنان لەلایەن شانشینی یەکگرتووەوە کە تێچووی ساڵانەی نزیکەی ٤٥ هەزار پاوەندە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم بابەتە لە چوارچێوەی هاوکارییەکەمان بۆ ئەم وڵاتە بە (نەوت دەوڵەمەندە) لەژێر پێداچوونەوەدایە و، ئێمە بە کاربەدەستانی عێراقمان ڕاگەیاندووە کە هیچ کۆمەکێکی دارایی دیکە خەرج ناکرێت. مەبەستمان ئەوەیە کە بەرنامەکە هێواش هێواش کەم بکرێتەوە و دواجار لە ساڵی ١٩٧٩دا بە تەواوی بوەستێنرێت. ئێمە نامانەوێت لەم بودجەیە بەبێ ڕەزامەندی حکومەتی عێراق هاوکاری خوێندکارە کوردەکان بکەین و پێشکەشکردنی هاوکاری دارایی بە کوردەکان لەوکاتەدا کە هاوکارییەکانمان لە خوێندکارە عێراقییەکان دەکێشینەوە بەبێ گومان دەبێتە هۆی دروستبوونی نارەزایی کاربەدەستانی عێراق. هیچ هۆکارێکی پەرەپێدان نییە کە پێویست بکات هاوکارییەکی نائاسایی بۆ خوێندکارانی کورد دابین بکرێت و ئەمەش ڕەنگە داهاتوویەکی نادیارمان بۆ بێنێتە کایەوە، چونکە ئەگەری ئەوە لاوازە ئەو کوردانەی کە بڕیاریان داوە لەدوای لێبوردنەکەوە نەگەڕێنەوە بۆ عێراق، لە داهاتوویەکی نزیکدا بگەڕێنەوە ئەو وڵاتە.

٦. بارودۆخـی کـوردەکان ناچێتـە چوارچێوەی ئەو دوو مەرجـەی کە لە بڕگەی یانـزەی ڕاپۆرتـی هاوپێچکـراودا هاتووە و، بـاس لەوە دەکات کـە وەزارەتی ناوخۆ

بـە ئاشـکرا رایگەیانـدووە: کـە ئامادەیە رێگـە بەو کوردانـەی پەنابەر بـدات کە بێنە نـاو شانشـینی یەکگرتـووەوە گـەر بێـت و پەیوەندییەکیـان بـەم وڵاتـەوە هەبێت و بـۆ خوێندنیـش لایەنێـک پشـتیوانیان بکات. تائێسـتا ژمارەی ئەو کەسـانەی رێگەی هاتنەناوەوەیـان پـێ دراوە ژمارەیەکـی کەمـەو زۆربەی ئەو کەسـانەی ئـەم بابەتە دەیانگرێتـەوە لـە چوارچێـوەی ئـەو شـەش سـەد کەسـە دان کـە (UNHCR) وەک کەسـانێک نـاوزەدی کـردون کـە لـەڕووی سیاسـییەوە مەحاڵـە بگەڕێنـەوە بـۆ عێـراق بەهـۆی ئـەوەی کەسـانی دیـاری یاخیبوونەکـەی کـوردەکان بـوون. لەگەڵ ئەوەشـدا عێـراق چیتـر وەکـو وڵاتێکـی شایسـتەی هـاوکاری نابینرێـت، ئەمەش بە لەبەرچاوگرتنـی پێـوەرە ئاساییەکانی پەرەپێدان کە لەلایـەن وەزارەتی پەرەپێدانی دەرەوە کاری پێدەکەرێـت، سـەرەڕای ئەمـەش وەزارەتـی دەرەوە و کۆمۆنوێلـز بە تونـدی ئامۆژگـاری دەکات دژی هەرجـۆرە هاوکارییەکـی دارایـی بـۆ خوێنـدکارە کـوردەکان چونکـە کاری لـەم جـۆرە لەمپـەر دەخاتـە بـەردەم ئـەو هەوڵانەمـان کـە لەپێنـاو گەشـەپێدانی پەیوەندییـە سیاسـییەکانمان لەگـەڵ عێراقـدا دەیدەیـن و هەناردەکانـی بەریتانیـا دەخاتـە بەردەم مەترسـی.

**پێشنیار**:

٧) بەشـی خۆرهەڵاتـی ناوەڕاسـت و دەریـای ناوەڕاسـت پێشـنیاری ئـەوە دەکـەن کـە نابێت وەزارەتـی پەرەپێدانـی دەرەوە کۆمەکـی دارایی بـە بەرنامەکەی دەزگـای زانکـۆی جیهـان (WUS) ببەخشـێت کـە تایبەتە بـە خوێنـدکارە کوردەکان و، پێشـنیار دەکـەن کـە وەزیـر وەڵامـی ئـەو نامانـە بداتـەوە کـە لـە برگـەی یەکدا بـاس کـراون، بەوشـێوەیەی کـە لـە رەشنووسـەکەدا هاتـووە. ئـەو بڕگەیـەی کـە لـە رەشنووسـەکاندا هاتـووە رەزامەندبوونـی هەریـەک لـە وەزارەتـی دەرەوە و کۆمۆنویلـز و وەزارەتـی ناوخـۆی لەسـەرە.

بەشی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و دەریای ناوەڕاست

**نهێنی**
**مستەر کامپبێڵ**
**پاشکۆ/ مستەر ئینەڵز**
**وێنەیەک بۆ:**
**PUSD**
**MVD**
**D١٤**
**کابینەی وەزارەت**
**وەرگیراوە لە تۆماری ژمارە ٣٥ لە رۆژی ١٦ی ئازاری ١٩٧٦**

## کوردانی عێراق

١. راپۆرتەکانی ئەم دواییە کە لە عێراقەوە رەوانە کراون (نامەکانی مستەر گراهامی لە رۆژانی ١٩ و ٢٦ی کانوونی دووەم) ئەو دەنگۆیە پشتڕاست دەکەنەوە کە تێیاندا هاتووە: ژمارەیەکی زۆری کورد لەلایەن حکومەتی عێراقییەوە لە باشووری وڵاتەکە نیشتەجێ دەکرێن و لە ماڵ و شوێنی خۆیان هەڵ دەکەنرێن و دوردەخرێنرێنەوە. هەربۆیە، چیتر مەرج نیە ئەوە راست بێت کە بڵێین لەدوای کۆتاییهاتنی شۆڕشی کورد لە ساڵی رابردووەوە کوردەکان بە ئاشتی دەگەڕێنەوە بۆ گوندەکانی خۆیان.

٢. باڵیۆز لە کۆبەندی ساڵانەکەیدا باسی لەوە کردبو کە نزیکەی ٥٠ هەزار کورد راگوێزراون و زوربەیان براونەتە ناوچەی دیوانییە. راپۆرتەکانی دواتری باڵیۆز دەریدەخەن کە بەدڵنیاییەوە ئەم ژمارەیە بە لایەنی کەمەوە

خەملێنــراوە. ســەرکردەیەکی کــورد لــە عێــراق کــە عەبدولعەزیــز عەقراوییــە دەگوتــرێ بــە نهێنــی باســی لــەوە کــردووە کــە تەنیــا لــە شــاری خانەقینــەوە ٦٠ هــەزار کــورد راگوێــزراون. کاربەدەســتێکی بــاڵای وەزارەتــی کاروبــاری دەرەوە کــە بــە رەگــەز کــوردە بــەڵام بــە هەڵوێســت زۆر لایەنگــری حکومەتــە، گوتویەتــی لەکاتێکــدا کــە حکومەتــی عێــراق رەنگــە پاســاوی خــۆی هەبێــت لــەوەی پەنابــەرە گەڕاوەکانــی ئێــران و ئەوانــەی بەشــداریی شــەڕەکەیان کــردووە رابگوێزێــت، بــەڵام ســەختە لــەوە تــێ بگــات کــە کەســانی وەک خزمەکانــی ئــەو کاربەدەســتە کــە هیــچ بەشــدارییەکیان لــە شۆڕشــەکەدا نەکــردووە بۆچــی رادەگوێزرێــن. ئــەو تــێ ناگــات کــە چــی وای لــە حکومــەت کــردووە کە پشــت لــەو سیاســەتە بــکات کە پێشــتر بــۆ ئاشــتەوایی هەیبــووە، رەنگــە حکومــەت بــە "جەماعەتەکــەی تاڵەبانــی" نیگــەران بوبــن. (جــەلال تاڵەبانــی یەکێــک بــووە لــە ئەفســەرەکانی بارزانــی و ئێســتا لــە ســوریایە و چەنــد کەســێکی کەمــی لەگەڵدایــە کــە هێشــتا نەیــاری حکومەتــی عێراقــن. هەنــدێ لــە کەســوکاری ژنەکــەی لــە بریتانیانــن و باڵیــۆزی عێــراق ســکاڵای ئــەوەی کــردووە کــە رێگــە بــە تاڵەبانــی دەدرێــت جارجــارە ســەردانی ئێــرە بــکات. MVD و وەزارەتــی ناوخــۆ جەخــت لــەوە دەکەنــەوە کــە: لــە ســاڵی ١٩٧٣وە ناوبــراو ســەردانی بەریتانیــای نەکــردووە و ئێمــە دەمانەوێــت لــە دەرفەتێکــدا ئــەم بابەتــە بــۆ عێراقییــەکان بــاس بکەیــن).

٣. جێگــری وەزیرێــک بــە باڵیــۆزی راگەیانــدووە لــە وەزارەتــی دەرەوە کــە: ڕاگواســتنی خەڵــک لــە باکــورەوە بــۆ باشــور لەئــارادا نی‌یــە. بــەڵام زۆرێــک لــەو پەنابــەرە کوردانــەی کــە بڕیاریانــداوە لــە ئێرانــەوە بگەڕێنــەوە بــۆ عێــراق لــە باشــور نیشــتەجێ کــراون چونکــە بەهــۆی ئەنجامــی ئــەو وێرانکارییــەی لــە ســەردەمی شــەڕەکەدا لــە باکــور روویداوە، ئــەوێ پێویســتی بــە ئاوەدانکردنەوە و بنیادنانــەوە هەیــە. ئــەو کەســانەی ماڵیــان هەبــووە رێگەیــان پــێ دراوە بگەڕێنەوە. بــەڵام ئەوانــەی ماڵیــان نەبــووە لــە ناوچەکانــی باشــور وەکــو رومــادی و کــوت

و دیوانییــە نیشــتەجێ کــراون. تــا ئێســتا ئــەم پرۆســەیە خۆبەخشــانە بــووە چونکــە کاتــێ بارودۆخەکــە لــە ئێــران بــۆ پەنابــەرەکان باســکراوە، پەنابــەرەکان بڕیــاری گەڕانەوەیــان داوە. هەرچەنــدە ئەمــە بڕیارێکــی یاســایی نیــە، بــەڵام پێویســتییەکی کــرداری و ئابورییــە.

٤. کاتــێ قەبــارەی تــەواوی ڕاگواســتنەوەکە ئاشــکرا ببێــت ئــەوا ڕەنگــە ڕۆژنامەکانــی بەریتانیــا ڕەخنــە لــە سیاســەتەکەی حکومەتــی عێــراق بگــرن و، پێــم وایــە مســتەر ئینەڵــز حــەز دەکات کــە پێشــوەخت بــۆ ئــەم ئەگــەرە ئاگــادار بکرێتــەوە.

ئای تی ئێم لوکاس
بەشی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست
٦ی شوباتی ١٩٧٦

**تایبەت**
**باڵیۆزخانەی بریتانیا**
**تاران**
**٢١ی نیسانی ١٩٧٦**
**ژمارە: ٢٠/٠١٤**
**بەڕێز پی. کەی. ویلیامز**
**MED**
**وەزارەتی دەرەوە و کۆمۆنوێڵز**
**وەرگیراوە لە تۆماری ژمارە ٣٥ی ڕۆژی ٥ی ئایاری ١٩٧٦**
**ژمارە ٣/٢٤٥**

## پەنابەرانی کورد لە ئێران

١. ئێمە، بەغدا و UKMIS لە جنێف دوا راپۆرتمان لەسەر بارودۆخی پەنابەرانی کورد لە مانگی تشرینی دووەمی ساڵی پاردا پێشکەش کرد. بە لەبەرچاوگرتنی بایەخی بەربڵاو بە کوردەکان، رەنگە وا باش بێت کە بە تۆمارکراوی راپۆرتێکی نوێ لەسەر بارودۆخیان لە روانگەی نیشتەجێکانی ئێرانەوە لەبەردەستدا بێت ئەویش لەسەر بنەمای وتووێژەکانی ئەم دواییە لەگەڵ باڵیۆزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکان و لەگەڵ (گودیەر)دا، کە نوێنەری UNHCRە لە تاران.

٢. دوو لێبوردنەکەی عێراق دو گروپ کوردی لە ئێران هێشتەوە. بەشی یەکەمیان ١٥٠٠ کەسێک دەبون لە "رۆشنبیران" کە سەرکردایەتی کورد

دەیویست لە خۆرئاوا نیشتەجێیان بکات، بەشی دووەمیشیان ٣٥ هەزار کەس بوون و بەسەر پیاوانی سەڵت و ئەندامانی خێزاندا دابەش بوون، ئەمانە لەو کوردانەن کە رۆشنبیرییان کەمترە و دژی گەڕانەوەن بۆ عێراق.

٣. بەرنامەی نیشتەجێکردنی گروپی یەکەم لە چەند مانگی رابردوودا هێواش هێواش بەرەوپێش چووە. UNHCR یش بەوریاییەوە هەوڵی داوە کە رێز لە حەزی ئێرانییەکان بگرێت لەپێناو خۆدورخستنەوە لە زیانگەیاندن بەو پەیوەندییانەی کە بەمدواییە لەگەڵ ئەو وڵاتەدا دروستی کردووە، ئەم کردەوەیە دەبێت لە کەمترین ئاستدا باسی لێوە بکرێت. ئێرانییەکان لەلای خۆیانەوە کە بڕیاریان داوە رێگە بە کۆچەکە بدەن، پێیان خۆشە کارە قورسەکە بۆ UNHCR و کوردەکان خۆیان بەجێ بهێڵن و کەمترین کێشەی بیرۆکراسییان خستۆتە بەردەمیان، ژمارەکانی ئێستا بەم جۆرەیە: کە نەمساییەکان رێگە بە ١٠٠ کەسی ئەم گروپە دەدەن (هێشتا پەنجا کەسیان ماونەتەوە)، هۆڵەندییەکان ٥٠ کەس، کەنەدا ١٠٠ کەس، و خۆشمان ٤٠ بۆ ٥٠ کەس. وڵاتانی سکەندەناڤیا وەڵامی داواکەی UNHCRیان نەداوەتەوە. گودیەر دڵنیایە لەوەی کە رەزامەندییەکی سەرەتایی وەرگرتووە کە ئەمریکا ٦٠٠ بۆ ٧٠٠ کەسیان وەرگرێت، بەڵام ئەم پەنابەرانە دەبێت یەکەمجار بچنە فەرمانگەی کۆچی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە فرانکفۆرت بۆ ئەوەی داواکەیان بە فەرمیی وەربگیرێت (رەزامەندیی ئەڵمانییەکان بۆ ئەم رێوشوێنە وەرگیراوە). کۆی گشتیی ئەم ژمارەیە دەکاتە ١٠٠٠ بۆ ١,١٠٠ کەس کە بەنزیکەیی هەمو ئەو کەسانەی لیستەکەی یەکەمجارن کە پەیوەندییەکی راستەوخۆیان لەگەڵ فەرمانگەی UNHCRدا هەیە. ئەو ٤٠٠ بۆ ٥٠٠ کەسەی لە لیستەکە دەمێننەوە، ئەوا UNHCR بڕوای وایە هەندێکیان یان ئەوەتا خۆیان بەبێ UNHCR توانیویانە رەزامەندیی وڵاتێکی خۆرئاوا بۆ نمونە ئیتاڵیا وەربگرن، یاخود لە ئێران ترازاون بۆ ئەوەی خۆیان بگەیەننە

بزوتنەوەکەی تاڵەبانی. هەندێکی تریشیان رەنگە لەدوای داخستنی کەمپی پەنابەران لە مانگی تشرینی یەکەمی رابردودا، بەسەر وڵاتەکەدا پەرشوبڵاو بوبنەوە. ئەو کاتەی کارکردن لەسەر داواکارییەکانی ئێستا کۆتایی هات، UNHCR و سەرکردایەتی کورد هیوای ئەوە دەخوازن ئێران رێگەیان بدات کە هەوڵێک بدەن شوێنی ئەوانەی ماونەتەوە بدۆزنەوە. لەبەر ئەوەی هەندێ لەو پاڵێوراوانەی لە لیستەکەدا ناویان هاتووە هێشتا داواکارییان پێشکەش نەکردووە، بۆیە لە گودیەرم پرسی: ئایا چاوەڕوانی ئەوە بکەین کە داواکاری زیاترمان بەدەست بگات یان نا. ئەو گوتی کە بەڵێ، بەڵام ژمارەکە لە ٢٠ بۆ ٣٠ کەسی دیکە زیاتر نابێت.

٤. ئەو ٣٥٠٠ (٣٥٠٠٠ - شیاوی باسە دبلۆماتکاری وەرگری ئەم دۆکیۆمێنتە سفرێکی بۆ ژمارەکە زیادکردووە و کردوویەتی بە سی و پێنج هەزار کەس، بۆیە بەباش زانرا ئەوەی دبلۆماتکارە وەرگرەکەش دابنرێت) کەسەی کە نیشتەجێی کەمپەکان بون و بڕیاریاندابو لێبوردنەکەی عێراق قبوڵ نەکەن، لە کۆتایی پاییزی رابردوودا بەسەر وڵاتەکەدا بڵاو کرانەوە و زوربەشیان بە گروپی بچوک بچوک و بەگشتییش لە ناوچەی باشوری وڵاتەکە و زۆر دوور لە سنوری عێراقەوە نیشتەجێ کران. (ئەندامانی باڵیۆزخانە چەند گروپێکی بچوکیان لە ناوچەکانی باکوریشدا بینیوە). تاکە گروپی گەورە کە لە ١٢,٠٠٠ پیاوی گەنجی سەڵت پێکهاتووە لە جەهرومی فارس هێڵراونەتەوە و لەوێ راهێنانی پیشەییان پێ دەکرێت پاشان بەسەر شوێنی نیشتەجێبونی نوێدا دابەش دەکرێن. ئەم چالاکییە لەژێر کۆنترۆڵی توندی ساواکدایە، هەرچەندە جێگەورێگە و بەڕێوەبردنەکە لەلایەن (رێد لایەن و سەن سۆسایەتی)یەوە دابین کراون.

٥. هێشتا زۆر زووە کە بزانین ئەم سیاسەتی پەرشوبڵاوکردنەوەیە تا

چەند دەسەڵاتدارانی ئێران لە کێشەکانی جڤاتێکی پەنابەری بێرەگوڕیشە دەپارێزێت. لە ئێستادا هەندێ لە کێشەکان دەرکەوتون. کوردەکان بەگشتی سوننەن بەڵام زوربەیان نێردراونەتە ناوچە شیعەکانەوە. چەند نمونەیەک بیستراوە کە دەسەڵاتدارە ناوچەییەکان برێک ئازاری کوردەکانیان داوە. هەروەها سکاڵای ئەوەش هەیە کە ئەو کۆمەکەی بەڵێندرابوو پێیان ئەوا نەدراوە، کێشەی بێکاری هەیە و کێشەی نیشتەجێبون و تادوایی. ڕوونە تا ئێستاش کە سەرکردایەتی کورد دەسەڵاتێکی سەرسوڕهێنەری بەسەر پەنابەرەکاندا هەیە و ئێستاش وادیارە کە گەڕانەوەیان بۆ عێراق ڕێگەپێنەدراوە و، هانیان دەدەن بە باشترین شێوە خۆیان لەگەڵ بارودۆخە نوێیەکاندا بگونجێنن. بەدڵنیاییەوە مەترسی ئەوە هەیە کە ئەم پەرشوبڵاوکردنەوەیە ببێتە هۆی تێکشکاندنی ئەم دیسپلینە و دواجار کوردە نیشتەجێکراوەکان لە ناوچەجیاجیاکانی وڵاتەکەدا کێشەی زیاتر بخوڵقێنن. ئەو ڕاستییەی کە تا ئێستاش چەند کەسێک دەتوانن هەموو پەنابەرەکان پێکەوە یەکبخەن، مانای ئەوەیە چەند گومانێکی بەردەوام لەلای کاربەدەستانی ئەمنی هەن کە چۆن بەباشترین شێوە پەرشوبڵاویان بکەنەوە.

٦. گودیەر دەسەڵاتێکی تایبەتی لە جنێفەوە پێ درابێت یان نا (بڕوانە ڕاپۆرتەکەی کۆڵوەی بە ژمارە 9/UN18ی ١٢ی تشرینی دووەم کە لە جنێفەوە بۆ جۆن سایمۆنسی ناردووە)، بە وریاییەوە هەوڵ دەدات ئەگەرەکان بە کراوەیی بهێڵێتەوە و هەرکاتێ پرۆگرامی کۆچەکە کۆتایی پێهات، بتوانێت نوسینگەکانمان (UNHCR) دامەزرێنێت و یارمەتیدەربێت لەوەی هەمو ئەو سەختییانە چارەسەر بکات کە ڕەنگە تا ئەو کاتە بێنە ڕێیان.

٧. هێشتا خودی بارزانی کاریگەرییەکی گەورەی هەیە بەڵام وا دیارە کە بەخێرایی پیر دەبێت. بەگشتی پەیوەندییەکی تارادەیەک باشی لەگەڵە

ئێرانییەکاندا هێشتۆتەوە و ئەو نارەحەتی و تورەییانەی جڵەو کردووە کە بەهۆی کۆتوبەندەکانی بارودۆخەکە توشی بووە، لەگەڵ ئەوەشدا، بە لایەنی کەمەوە جارێک تورەییەکەی تەقیوەتەوە ئەمەش کاتێک بووە کە توانای گەیشتنی بە کاربەدەستە باڵاکانی ئێران کەم کراوەتەوە. هاوکات ئەوەندەش خۆی لە ئێرانییەکان بە دوور گرتووە کە خۆی لەو تۆمەتانە بپارێزێت کە بڵێن بووەتە داردەستی ئێران. خۆی و ئەو ٥٠ یان ٦٠ خێزانەی کە سەرکردایەتی پدک دەکەن هەموو پێکەوە لە ژێر چاودێری ئێراندان لە کەرەج و لە دەرەوەی تاران نیشتەجێن و تاکە بەهێزترین کاریگەردانەریشن لەسەر ئەو کوردانەی کە لە ئێران ماونەتەوە. برێک نائاسودەیی هەیە بەهۆی ئەو هەواڵانەی لە عێراقەوە دێن و باس لە نیشتەجێکردنی زۆرەملێ دەکەن و، هەندێ کەسیش هەن کە بە سیاسەتە وەستاوەکەی بارزانی نارەحەتن و هەوڵ دەدەن ناسنامەی پەنابەربونیان وەک خۆی بهێڵنەوە تا ئەوکاتەی ئەگەر بارودۆخە سیاسییەکە جارێکی تر گۆرانی بەسەردا بێت و دەرفەتێکی نوێ بێتە ئاراوە بۆ دەستپێکردنەوەی هەڵمەتی دژ بە عێراقییەکان. بەڵام پێدەچێت بە گشتی زۆرینەیان ئەو بۆچونەی بارزانییان قبوڵ بێت کە لەئێستادا بەبێ پشتیوانیی ئێران و ئەمریکا، ئەوا سیاسەتی چالاکوانانەیان سودێکی ئەوتۆی نابێت. بەلای کەمەوە ژمارەیەکی تا رادەیەک کەم لەناو ئاوارە کوردەکانی نیشتەجێی ئێراندا بە بۆچونەکانی تاڵەبانی سەرسامن یاخود هەوڵیان داوە لە ئێران دەرباز ببن و پەیوەندی بە زیندوکردنەوەی ئەو جووڵانەوەوە بکەن کە تاڵەبانی هەوڵ دەدات لەسەر سنورەکانی سوریا و عێراقدا هەڵیگیرسێنێت.

٨. ئەگەر بتوانم چاوێکی خێرا بە بەغدا دەگێرم. هەڵسەنگاندنەکەی گودیەر لەبارەی بارودۆخی ئەو کوردانەی لێبوردنەکەیان قبوڵ کردووە و گەڕاونەتەوە بەغدا ئەوەیە کە خەڵکانی پێشتری "ناوچە ئۆتۆنۆمەکە"

بەتێکــڕا نزیکــەی ٢ هــەزار کەســێکیان کــە بــەلای دەســەڵاتدارانی عێراقــەوە توانــای ســەرکردایەتییان تێدایــە، ئــەوا ڕێگەیــان پێــدراوە بگەڕێنــەوە ناوچەکانــی خۆیــان بــەڵام مــەرج نیــە ڕێ پێدانەکــە گوندەکانــی خۆیــان بگرێتــەوە. بارودۆخــی ئــەو پەنابەرانــەی لــە کەرکــوک یاخــود موســڵەوە هاتبــون جیــاوازە، ئــەوان بەگشــتی ڕێگەیــان پــێ نــەدراوە بچنــەوە شــوێنی خۆیــان و لــە باشــور نیشــتەجێ کــراون. ئەمــە برێــک ســەختیی بــەدوای خۆیــدا هێنــاوە بــەڵام بۆچونــی نەتــەوە یەکگرتــووەکان ئەوەیــە کــە ئــەم بابەتــە لەلایــەن کــوردە توندڕەوەکانــەوە و پشــتیوانەکانیان لــە لەنــدەن و بەتایبەتییــش لــە زویــرخ زیــادەڕەوی تێداکــراوە. هەمــووان کۆکــن لەگــەڵ ئــەوەی کــە ڕەنگــە چەنــد نمونەیەکــی ئــازاردان و تەنانــەت کوشــتنیش هەبێــت بــەڵام بڕوایــان وایــە کــە ڕەنگــە ئــەم نمونانــە ئــەو کوردانــە نەگرێتــەوە کــە لــە ئێرانــەوە گەڕاونەتــەوە.

ئار جەی ئالستۆن

وێنەیەک بۆ: بەڕێزان:

UKMIS جنێف

UKMIS نیویۆرک

بەغدا

واشنتۆن

**١١/٢**
**بەغدا**
**٢٤ی حوزەیرانی ١٩٧٦**
**بەڕێز ئای. مەکلەنێی**
**بەشی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست**
**وەزارەتی دەرەوە و کۆمۆنوێڵز**
**لەندەن**
**وەرگیراوە لەژێر تۆماری ژمارە ٣٥ لە ١٩٧٦**
**ژمارە ٢٤٥/٣**

## کوردستان

١. لەدوای دەستنیشانکردنی حامد ئەلجبورییەوە (بە پلەی وەزیر) و وەکوو بەرپرسی نوسینگەی تایبەتی سەدام حسێن لە ڕێکخستنەوە وەزارییەکەی ئەم دواییەدا، کە ئایا لە ئەرکەکەیدا وەک وەزیری هەماهەنگی لەگەڵ دامەزراوە ئۆتۆنۆمەکەی حکومەتە کوردییەکەدا دەمێنێتەوە یان نا. بەڵام لە ڕۆژی ١٢ی حوزەیراندا، RCC بڕیاری دا کە غانم عەبدولجەلیل دەبێتە ڕێکخەری نێوان حکومەتی ناوەندی و دامەزراوە هەرێمییە ئۆتۆنۆمەکان، ئەویش سەرەڕای کارەکانی خۆی وەک وەزیری خوێندنی باڵا و توێژینەوە زانستییەکان .

کەی. دی. ئێمپڵ

**نهێنی**
**باڵیۆزخانەی بەریتانیا**
**بەغدا**
**١ی تەموزی ١٩٧٦**
**٢/٠١١**
**بەڕێز ئای. مەککلۆنی**
**بەشی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست**
**وەزارەتی دەرەوە و کۆمۆنویڵز**
**لەندەن**

**بەڕێز ئیان،**
**پارتی دیموکراتی کورد**

١. لە نامەکەی رۆژی ٢٤ی ئایارمدا باسم لەوە کردبوو کە کۆمیتەیەکی ناوەندی بۆ پارتی دیموکراتی کورد هەڵبژێردراوە. رۆژنامەی "ئەلعێراق"ی رۆژی ٣٠ی حوزەیران نوسیویەتیی: لە رۆژی ٢٨ی حوزەیراندا کۆمیتەی ناوەندی بە کۆی دەنگ ئەم کەسانەی خوارەوەی وەک ئەندامی مەکتەبی سیاسیی پدک هەڵبژاردووە:

سالح ئەلحەیدەری
سەعید ئەلجاف
محەمەد ئەمین ئەلحەیدەری

فازڵ عەلی حسێن

راپۆرتەکــە بــاس لــەوەش دەکات کــە هاشــم حەســەن عەقــراوی وەکــو سـکرتێری کۆمیتــەی ناوەنـدی هەڵبژێـردراوە، هەرچەنـدە نـاوی لەنـاو مەکتــەب سیاسـییەکاندا نەهاتـووە، بـەڵام گریمانــەی ئــەوە دەکرێـت کـە ئەویـش ئەندامـی مەکتەبــی سیاســی بێــت.

٢. لە بیرتانە کە ساڵح ئەلحەیدەری نوسەری "ئەلعێراق"ە.

دڵسۆزی هەمیشەییت،
کەی. دی. تێمپڵ

**نهێنی**
**باڵیۆزخانەی بەریتانیا**
**بەغدا**
**٨ی تەموزی ١٩٧٦**
**٢/٠١١**
**بەڕێز ئای. مەککلۆنی**
**بەشی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست**
**وەزارەتی دەرەوە و کۆمۆنوێڵز**
**لەندەن**

بەڕێز ئیان،

**کوردستان**:

١. هەرچەندە لە ئێستادا لێرەوە لە بەغدا ئاستی کێشەکانی باکورمان بە روونی لەبەرچاو نییە، بەڵام بە ئاشکرا هەفتەی رابردوو بۆمان دەرکەوت کە حکومەت نیگەرانە.

٢. لە رۆژی ٥ی تەموزدا، رۆژنامەی ئەلعێراق کە رووی لە کوردەکانە وتارێکی سەدام حسێنی لە پۆستەکەیدا وەک سەرۆکی ئەنجومەنی باڵای کاروباری باکور بڵاو کردەوە کە سەبارەت بوو بە "سروشتی رێوشوێنە کتوپڕەکان لە شارەکانی باکوردا".

سەیر لەوەدایە کە بەتایبەت ئەم بەشە لە هیچ رۆژنامەیەکی دیکەدا

بڵاو نەکراوەتەوە. ڕاگەیەندراوەکە بەوە دەست پێ دەکات کە دەڵێت: ئەو ڕێوشوێنە کتوپڕانەی کە لە ڕابردودا گیراونەتەبەر توانیویانە ئاستی یاخیبونەکە کەم بکەنەوە، بەڵام بەهۆی بەردەوامبونی ئەم ڕێوشوێنە نائاساییەوە، ئەوا هێزەکانی بەرامبەر چەند ڕیگایەکیان بۆ "زیانگەیاندن بە یەکێتیی نیشتمانیی" دۆزیوەتەوە. بۆیە بەرژەوەندییە نەتەوەییەکان وایان خواستووە کە گواستنەوەیەکی "ڕاستەقینە و هەستپێکراو" بۆ بارودۆخی ئاسایی جێبەجێ بکرێت. هەرچەندە ئاشتیی و ئارامی لەئارادایە، بەڵام ئەمە مانای ئەوە ناگەیەنێت کە ڕوداوی "پەراوێزی زیانبەخش" ڕوياننەداوە، لەگەڵ ئەوەشدا نابێت دەسەڵات بخزێتە "پەلەپەل و کاری دیراسە نەکراو و بگەڕێتەوە بۆ بارودۆخە کتوپڕەکەی پێشوو". هێزە دواکەوتووخوازەکان و ئیستیعمار توشی شۆکێکی گەورەبون کاتێ ئاشتیی و ئارامییەکەی باکوریان بینیوە (من کە ئەمەم خوێندەوە پچڕام چونکە ڕێگام پێ نەدرا لە مانگی ئایاردا بچم بیبینم!)، بۆیە هەوڵ دەدەن حکومەت بەرەو ڕاگەیاندنی بارودۆخی لەناکاو بئاژون.

٣. ئەو خاڵەی کە ڕاگەیەنراوەکە سەبارەت بە "ڕاگواستن" جەختی لەسەر کردۆتەوە لەگەڵ ددانپیانان بەوەی کە دەسەڵاتداران گوندەکانی ناوچە "سنوریی و ستراتیجی"یەکان و دوایەمین وەجبەی پەنابەرە گەڕاوەکانی ئێرانیان ڕاگواستووە، ئەوا سەدام حسێن لەبارەیەوە دەڵێت: "لەسەر بنەمای ئەو بابەتانەی لەم ڕاگەیەنراوەدا باسیان لێوە کراوەو، لە پێناو بەهێزکردنی پایەکانی یەکێتیی نیشتمانیی و، ئاسایش و سەقامگیری لە باکوردا، ئەوا بڕیاردراوە کە کۆتایی بەو ڕێوشوێنانە بهێنرێت". ئەمەش وەها ڕونکراوەتەوە کە کەیسەکان یەک بەیەک و وەک عێراقییەکانی دیکە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت، بەڵام پێویستیی بە ڕەزامەندیی ئەنجومەنی باڵای کاروباری باکور هەیە.

٤. بـە پێکەوەبەسـتنی ئـەم بابەتـە لەگـەڵ ئـەو زانیارییانـەی کـە لەسـەر باکـور هەمانـن، مـن دەگەمـە ئـەم بەرئەنجامانەی خـوارەوە:

ا) چەنـد روداوێـک رویانـداوە کـە وای لـە حکومـەت کـردووە لەپێنـاو بەدەسـتهێنانەوەی پشـتیوانییدا چەنـد رێوشـوێنێک بگرێتـە بـەر.

ب) حکومـەت کاتـێ بـۆی دەرکەوتووە کە سیاسـەتیی راگواسـتن سـەرەکیترین هـۆکاری ناهەموارییـە، ئەوا سیاسـەتەکەی راگرتووە.

٥. لەدوای بڵاو بونەوەی ئەم راگەیەندراوەوە، سەدام حسێن لە نێوان ٥ تا ٧ی تەموز گەشتێکی بۆ باکور ئەنجام داوە. (ئەمە روناکییەکی سەرنجراکێشی خستە سەر بەشێک لە بارودۆخی ئاسایشیی عێراق، لێکۆڵینەوەکەی ٦ی تەموز باسی لەوە دەکرد کە ٦ وەزیر سەردانی باکور دەکەن بەڵام لە دوێنێ ئێوارەدا ئینجا ئەوەیان راگەیاند: کە سەدام حسێن و کەسانی دیکەشیان لەگەڵە.) وەزیرەکان بریتین لە: عیزەت ئەلدوری، عیزەت مستەفا، تەها جەزراوی، حەسەن ئەلعامری، سەعدون غەیدان، محەمەد مەحجوب و هی تر - گروپێکی زۆر بەهێزن. ئەو تیمە سەردانی سێ پارێزگا کوردییەکە و نەینەوا و تەئمیم (کەرکوک)یان کرد و، هەروەک چۆن ئەسقوفێک سەردانی شوێنێک بکات سەدام حسێنیش هاندان و ئامۆژگاریی بەسەردا بەشینەتەوە.

دڵسۆزی هەمیشەییت،
کەی دی تێمپڵ

وێنەیەک بۆ: D14، وەزارەتی بەرگری، بارەگای سەرەکی، وایتهۆڵ لەندەن SW1.

**نوسینگەی پاشکۆی سەر بە هێزی دەریایی و سەربازی و ئاسمانی**
**باڵیۆزخانەی بەریتانیا**
**تاران، ئێران**
**نهێنی**
**TEH/115/DA**
**وەزارەتی بەرگری**
**دی ئای ٤**
**بینای سەرەکی**
**وایت هۆڵ**
**لەندەن ئێس دەبلیو ١**
**٢١ی تەموزی ١٩٧٦**
**وەرگیراوە بە ژمارە ٣٥ لە ٢ی تەموزی ١٩٧٦**
**ژمارە ٣/٢٤٥**

بەشێک لە سەردانم بۆ باکوری لوڕستان و کوردستان و ئازربایجانی خۆرئاوا

گەڕانەوە: ا. TEH/115/DA ڕۆژی ٢٥ی ئازاری ١٩٧٦

نەخشەکان:

١. نەخشەی ڕێگاوبانی دامەزراوەی جوگرافیی سەحاب. ژمارە ٢٥٣، پێوەر: ١:٢,٥٠٠,٠٠٠

٢. نەخشەی هاتوچۆی ئاسمانی

## پێشەکی:

١. گەشتی پێشووم (گەڕانەوەی ا) بە ناوچەیەکی تاڕادەیەک گەورەی باشوری خۆرئاوای سنوری عێراق دا گەڕام، کە لە باکورەوە دەگەیشتە قەسری شیرین کە لەسەر ڕێگەی سەرەکیی بەغدادە. مەبەستی ئەم گەشتەی دوایشم بەرەو باکور ئەوا بۆ گەشتنم بووە بە کوردستان، تا ئێستا، ئەوەندەی لە ناوچەگشتییەکانی سنوردا توانیبێتم، خۆم بە وڵاتەکە ئاشنا کردووە و سەرنجم لە بارودۆخەکان و جموجوڵی هێزەکان و بارودۆخی ڕێگەوبانەکان داوە.

٢. ئەو یاسایە هێشتا لەکار نەخراوە کە دەڵێت پاشکۆکانی سەر بە باڵوێزخانەکان ناتوانن بەتەنیا سەردانی بارەگا سەرەکی و بارەگای یەکەکان بکەن، بۆیە هیچ کام لەم سەردانانە لەم گەشتەدا ئەنجام نەدراون. من و هاوسەرەکەم بە ڕەنجرۆڤەرێک، کە پڕکرابو لە سوتەمەنی و ڕۆن و ئاو و خۆراک و کەرەسەی چادرگە بۆ خۆئامادەکردن بۆ شتی چاوەڕواننەکراو کەوتینە رێ.

## شەممە ٥ی حوزەیران، تاران بۆ کرماشان

٣. کاتژمێر ٨:٢٠ خولەکی بەیانی تارانمان راستەوخۆ بەرەو کرماشان بەجێ هێشت و نزیکەی ٥:٢٠ خولەکی پاشنیوەڕۆ لەگەڵ مستەر و مسز ڕۆجەرز کە لە خزمەتگوزارییە هونەرییەکانی میڵبانک (MTS) کاردەکەن گەیشتینە ئۆتۆمبێلە تایبەتەکەی گەشتەکەمان. تاوەکو لۆفەکەی تەبریز کە ٤٠ کیلۆمەتر لەخوار قەزوینەوەیە، ڕێگەکە قەرەباڵغە بەڵام لەوێوە ئیتر قەرەباڵغی لەسەر نییە. رووپۆشی ڕێگاکە باشە و ئەمسەر تا ئەوسەری دوو سایدە، تاکە شوێنێک کە کەمێک سەخت بو ڕێگەکەی باشوری هەمەدان بو، کە

کاتێ بەوێدا تێدەپەڕین باران و هەورەگرمەیەکی زۆر بوو.

٤. ژمارەیەکی کەم چالاکیی سەربازیی لەوێ بەدی کرا. لە بنکەی هەوایی هەمەداندا ٢ هێلیکۆپتەری چینوک و ٤ هێلیکۆپتەری هیوی (Huey) لێ بوون، ٣ هێلیکۆپتەری (هیوی) سوکیش بە بەرزی ٢٠٠٠ پێوە بەرەو هەمەدان دەفڕین کە ڕەنگە لە کرماشانەوە هاتبن، و تانکێکی چیفتەین (Chieftain) لەسەر ناقیلەیەکی دەبابە هەبوو کە بەرەو بنکە سەربازییەکانی خواری هەمەدانەوە دەچوون.

٥. زوربەی ئەو بنکە سەربازییانەی کە لەم گەشتەدا بەلایاندا تێپەڕین، بیناسازیی تێدا دەکرا، یەکەمجار کە تێبینی بیناسازیی لەمجۆرەمان کرد لە کرماشان بو، هەم لە بنکەکانی IIGF کە ١٠ کیلۆمەترێک کەوتۆتە باشوری شارەکە و هەم لە دەروازەی خۆرهەڵاتی بنکە ئاسمانییەکەی کەتیبەی هێزی ئاسمانی.

٦. لە پاش گفتوگۆکانی مانگی ئازارەوە، ئەوا مستەر ڕۆجەرز زانیارییەکی نوێی پێ نیە. ئەو دەڵێت کە فەرماندەکەی ئێستای لەشکری ٨١ پێدەچێت بەم زووانە فەیلەق لە کرماشان دروست بکات (هەندێک کەسی تر دەڵێن ٦ ئەفسەر لە خۆپاڵاوتندان بۆی). ئەو دەڵێت هیچ نیشانەیەک نییە لەبارەی نائارامیی کوردەکانەوە ئەوە نەبێت کە جاروبار لەناوخۆیاندا لەسەر لەوەڕگا دەبێتە شەڕیان و هیچ هێزێکیش لەپڕ نەهێنراوەتە ناوچەکە. ناوبراو باسی لەوە کرد کە بەم نزیکانە فیلمێک بەرهەم هێنراوە دەریدەخات هەمو هێزەکان لە ڕاهێناندا یارمەتی یەکتری دەدەن، هەروەها گوتی پیاوەکانی لە MTS لەجاران دامەزراوترن و هەروەها گوتی داوای لێکراوە وەکو ڕاوێژکار لەبارەی ڕێکخستنی مەودای چەکی تانکەکان کار بکات: شێوازی ئێستا ئەوەیە کە بە وەستاوی تەقە لە قەدپاڵی گردێک بکات.

**یەکشەممە ٦ی حوزەیران، کرماشان بۆ قەسری شیرین:**

٧. بایەخـی سـەرەکیم (لـە سـالڕۆژی نۆرمانـدی دا) ئەوەبـوو کـە بەرێگـا سـەرەکییەکەی شـائاباد - ئیلامـدا بەرەوخـوار ببمـەوە و بچمـە سـوماری نزیـک سـنور. لـە گەشـتی رابردومـدا ئـەم رێگەیـە بەهـۆی بەردەڵانـی دەسـتکردەوە بەربەسـتی بـۆ دروسـت بووبـوو و ناچـار بـوم بگەڕێمـەوە (بڕوانـە أ، پەرەگرافی ٢٥) و ناوچـەی نەفتـی شـاهم نەبینـی.

٨. کاتژمێـر ٧,٣٠ خولەکـی پێـش نیـوەڕۆ لـە کرماشـانەوە بـەرەو شـاهاباد کەوتینـەڕێ. لـە بنکەکانـی شـاهاباد بڕێکـی کـەم یـان هیـچ زرێپۆشـێکمان نەبینـی کـە لـە شـوێنی وەسـتانی ئوتومبیلەکانـدا راگیرابێـت، لـە مانگـی ئـازاردا زۆری لـێ بـون. هەندێـک لـە ئوتومبیلـە تایبەتـە راگیـراوەکان بـە چـادر داپۆشـرابون، ئەمـەش رەنگـە نیشـانەی ئەوەبووبێـت کـە یەکەکـە بـۆ ماوەیـەک لـەوێ دوورکەوتبێتـەوە.

٩. بـە رێگـای ئیلامـدا بـەرەو باشـوور بـەردەوام بوویـن، لـە هەندێـک جێگـەدا تاسـەی زۆری تێدابـوو، و پاشـان بـەرەو خۆرئـاوا رووەو سـومار بـەڕێ کەوتیـن. خێڵـەکان لـە ناوچەکـەدا نەبـوون (زۆرێـک لـە خێڵەکان ئێسـتا لـەدەوری کرماشـان نیشـتەجێ بـون) و ئـەو شـوێنەی کـە لـە مانگـی ئـازردا ناوچەیەکـی سـەوز و قەرەباڵـغ بـوو، ئێسـتا وشـک و بیابانـە. پردەکـە چـۆڵ بـوو بـە رێگـە خاکییـە باشـەکەدا بەردەوامیمـان بـە گەشـتەکە دا.

١٠. سـومار شـوێنێکی بچوکـی گەرمـی تەپوتـۆزاوی و کۆنەسـاڵە و لـە نیـوەڕۆدا گەیشـتینە ئـەوێ. بنکەکانـی ژانـدارم پەڕپـووت بـوون و نیشـانەیەکی کەمـی ژیانـی لـێ بـەدی دەکـرا. دوای نزیکـەی یـەک کیلۆمەتـری دیکـە رومـان کـردە باکـور بـەرەو نەفتـی شـا، کـە بریتییـە لـە بیرەنـەوت و وێسـتگەیەکی

سـوتەمەنی لەنزیـك سـنورەكەوە. مـن كـە بـەو كەش‌وهەوایـە رانەهاتبـوم، هەسـتم كـرد نیشـانە سـەرەتاییەكانی گەرمابونـم تیـا دەركـەوت و پێـم خـۆش بـوو كاتێـك گەیشـتینە ئـەوێ چەنـد خولەكێـك پشـوو بـدەم. لـەوێ نزیكـەی سـریەیەك ژاندارمـی لێیـە.

١١. كەسـێكی ئێرانیمـان سەرخسـت كـە دەیگـوت سـەردانی ئەندازیارێكـی نـەوت دەكات و داوای لـێ كردیـن سـەریبخەین، و لەسـەر رۆیشـتنەكەمان بـەرەو باكـور بـەردەوام بویـن. لـە نزیـك رێگەكـەوە چەنـد بنكەیەكـی ژاندارمـی لێـن، نیشـانەی زۆر كەمـی چالاكـی و وریاییـان لـێ بـەدی دەكـرا. نزیكـەی كاتژمێـر ٤ی پاشـنیوەڕۆ گەیشـتینە قەسـری شـیرین و لـە بارێكـی گەشـتیاریی زۆر رێكوپێـك لامانـدا.

١٢. گەشـتەكەم بەنـاو شـارۆچكەكەدا وایكـرد چەنـد سـەربازێكی زۆركـەم ببینـم كـە لـە كاتـی پشـوودا بـوون، بـەڵام توانیـم وێنـەی چەنـد سـوارەیەك بگـرم كـە سـوارەی پاشـماوەی جەنگـی پێشـووبوون و مابوونـەوە. لە شـارەكەدا یەكـەی نیشـتەجێبونی نـوێ بنیـاد دەنرێـت و، دۆخێكـی چالاكـی گشـتی لەئارادایە.

### دووشەممە ٧ی تەمووز، قەسری شیرین بۆ سەنەندەج:

١٣. لـەدوای خۆرهەڵاتـن لـە كاتژمێـر ٥,٤٠ خولەكـی بەیانـی‌دا بـە رێگـە نایابەكـەدا بـەرەو خۆرهـەڵات رۆشـتین و دوای ٢٥ كیلۆمەتـر بـە رێگەیەكی خاكی باشـدا روومـان كـردە باكور. جیهانـە كشـتوكاڵییەكە بەتـەواوی بەئاگـا هاتبووەوە و دەسـتەی درویێنـەكاران دەبینـران. لێـرە بـەدواوە بـەراورد كردنـی رێگەوبانەكـە لـە رێـی هەمـوو ئـەو نەخشـانەی كـە لەبەردەسـتماندا بـوون سـەختتر دەبـوو. ئامانجـی یەكەممـان ئەوەبـوو بچینـە نەوسـود، كـە دیـارە گەشـتێكی ئاسـانە و تەنیـان چەنـد لۆفەیـەك بـە گردەكانـەوە لەبەردەممانـدا بـوون.

١٤. تاوەکو گوندی شێخ ساڵح، یاخود ئەو جێگەیەی لام وابو گوندی شێخ ساڵحە، رێگە خاکییەکە باشە. بەلای کەمپێکی چۆڵدا رەت بوین کە رووبەرەکەی ٨٠٠م بە ٨٠٠م دەبوو، پێم وایە رۆژێک لە رۆژان کەمپی پەنابەران بوبێت. لێرە بە دواوە، رێگاکە بەرەو شوێنێکی بێناو هەڵدەکشێت و پاشان نزم دەبێتەوە و دەگاتە یەکەمینی ئەو چەند رووبارەی کە نەوسود لەوبەریانەوەیە. هەموو پردێکیان بنکەیەکی ژاندرمی لەسەرە و تێکەڵەیەک لە لیڤی ئاسایی و خێڵەکی لێیە، خێڵەکییەکان توندترن و خنجەر و شانەیان بە لاقەدیاندا کردووە.

١٥. پاشان رێگا کە سەخت دەبێت، رێگا کە بە ئەندازەیەکی باش و بە شانی چیاکاندا دروستکراوە و میل لەدوای میل هەڵدێری هەزار بە هەزاری تێدایە، بەڵام رووی رێگاکە تارادەیەکی زۆر چونیەکە. رەنگە بتوانرێت بارهەڵگری ٤ تەنی پێدا ببرێت، بەڵام لەکاتی باراندا یاخود لە تاریکیدا کێشە دروست دەبێت. هەریەک لە بنکەکان بەجۆرێکی جیا مامەڵەیان لەگەڵ دەکردین، هەندێکیان سڵاویان دەکرد و بانگێشی چا خواردنەوەیان دەکردین، بەڵام لە یەک دوانێکیاندا زۆری نەمابوو دەستگیر بکرێین، لە یەکێکیاندا بەوە رزگاربوین کە کاتێک گوتیان یەکێک لە لیڤییەکان سەربخەین مشتومرمان نەکرد (چوار کاتژمێر دوای ئەوە ئینجا رزگارمان بوو لێی). ناوچەیەکی نایابە بۆ پارتیزان بەڵام جگە تەنگ پێ هەڵچنین بە ژاندارمەکان هیچی دیکەی لێ سەزو نابێت.

١٦. یەکێک لە راستییە گرنگەکان کە شیاوی باس لێ کردنە ئەوەیە: هەندێک لەو گوندانەی کە پیایاندا تێپەڕین تاوەکو گەیشتینە نزیکەی ٣٠ کیلۆمەتر پێش نەوسود، چۆڵ بون و هیچ مرۆڤێک یاخود ئاژەڵێکیشی لێ

نەدەبینـران. پـێ نەدەچـوو گونـدەکان بەجـێ هێڵرابـن چونکـە باخـەکان لـە ژیانـدا بـون و خانـووەکان بـە باشـی مابونـەوە و، یەکـەم پیـاوی خێڵمـان لـە گەڕانـەوەدا لـەلای شـێخ سـاڵحەوە بینـی. لەگـەڵ ئەوەشـدا رێی تێدەچێـت کـە ئـەو چەنـد کەسـەی بینیمـان پێشـڕەوی خێڵەکـە بووبـن و بـەرەو ئـەوێ چووبـن کـە بـۆ وەرزی هاویـن بچنـەوە گوندەکانیـان. رێیشـی تێدەچێـت هەموویـان راگوێزرابـن و، مـن پێـم وایـە راسـتییەکە ئەمەیـان بێـت.

١٧. کاتژێـر ٢,٣٠ی پاشـنیوەڕۆ دوا رووبارمـان تێپەڕانـد، کـە نزیکـەی ١٥ کیلۆمەتـر لەپێـش نەوسـودەوەیە، و چوینـە ئـەو رێگـە خاکییـە باشـەی کـە لـە پـاوەوە بـەرەو کرماشـان دەچێـت. لـە نەوسـود لـە نەفەرەکـە رزگارمـان بـو و توشـی ئـەوە بویـن کـە مـن هیـوام دەخواسـت نوکتـە بێـت بـەڵام راسـت بـوو، ئـەوەش کۆمەڵێـک لۆفـەی پێچاوپێـچ بـوو بـەرەو سـەرکەوتن بەسـەر گردێکـی زۆر لێـژدا. ئەمـە سـەرەتای رێگـەی باکـور بـوو بـەرەو مەریـوان، کـە لـە وەرزی گەرمـادا بـۆ ئوتومبیلـی بچوکـی ٢ ویـل دەبێـت. ئـەوەی لـە نەوسـود بینیمـان تەنیـا سـەرەتای سـەرکەوتنەکە بـوو، نەوسـود نزیکـەی ٣ هـەزار پـێ بـەرزە و لوتکـەی رێگاکـە تۆزقاڵێـک لـە ١٠ هـەزار پـێ نزمتـرەو لـە دۆڵەکانـی کـە روویـان لـە باکـورە هێشـتا بەفرێکـی زۆری پێوەبـوو.

١٨. لـە دابەزینـەوە و چوونمـان بـۆ سـەر ئـەو رێگـا دوو سـایدە (لێـرەدا رێگاکـە باشـە) خاکییـەی کـە لـە سـەنەندەجەوە بـۆ مەریـوان دەچێـت و نزیکـەی ١٥ کـم لـە مەریوانـەوە دوورە، کاتژمێـر ٦ی پاشـنیوەڕۆ گەیشـتینە شـارۆچکەکە. ٣٠٦ کیلۆمەترمـان لـە قەسـری شـیرینەوە بـە ١٢,٥ کاتژمێـر بڕیبـوو، بەبـێ ئـەوەی هیـچ لادانێکـی دورودرێژمـان بوبێـت و زوربـەی رێگاکەمـان بـە نمـرە ٢ دەبـڕی.

١٩. لەسەر نەخشە ٣ ڕێگا هەن لە مەریوانەوە بۆ سەنەندەج، ئامۆژگاریی ئەوەیان داینێ (گومان دەکەم بە هەڵەپێمان درابێ) کە ڕێگاکەی خوارەوە لە هەمووی باشترە، بۆیە ١٥ کیلۆمەتر بە ڕێگاکەدا گەڕاینەوە و پاشان رومان کردە خۆرهەلاّت. لەگەڵ سەرکەوتن بەسەر ڕێگاکەدا رووی ڕێگاکە خراپ دەبوو. کە گەشتینە تێژتێژ (Tizhtizh) دنیا تاریک بووبوو (شیاوی ئاماژەیە کە "تێژتێژ" گوندێکە و لە نزیک مەریوان دایە)، بۆیە جگە لە تاسەیەکی قووڵ لە کۆتایی ڕێگاکەدا پێش ئەوەی شۆڕ ببینەوە بۆ سەنەندەج ئەوا هیچمان نەبینی. ١٥ کیلۆمەترێک پێش ئەوەی بگەینە شارەکە، کاروانێکی هەڵگری ٥ چارەکە تەنی و ٦ تەنیمان بینی کە بەلاماندا ڕەت بون و بەرەو خۆرئاوا دەچون. چەند کیلۆمەترێک دواتر لە ناوەڕاستی ڕێگاکە ٢ سەربازمان بینی کە بەدەست ئاماژەیان بۆ دەکردین، و لەودیویانەوە ٢ دەستە سەرباز هەبون، هەریەکەیان لە بەرێکی ڕێگاکەدا بوون. بە تێکڕا نزیکەی ٢٠٠ کەسێک دەبوون و بە تفەنگ و مەتارەی ئاوەوە بەرەو سەنەندەج دەچون. لەگەڵ تێپەڕبونماندا هەمویان تەماشایان دەکردین، بۆیە ئەوان تووشی شەوارەی گڵۆپەکانمان بوون. ئەمە لە دیمەنی شەڕ دەچوو، بەلاّم لانی کەم جۆرە ڕاهێنانێکی شەوانە لەئارادا بوو.

٢٠. لە کاتژمێر ١٠,٢٠ خولەکی شەودا گەیشتینە سەنەندەج و خواردنی بارە گەشتیارییەکەمان بەلاوە خۆش بوو، بارەکە پاکوتەمیز و بە باشی بەڕێوە دەبرێت و بۆ گەشتیارانی داهاتوو دەکرێت بۆیان پێشنیار کەین.

## سێ شەممە ٨ی حوزەیران، سەنەندەج بۆ مهاباد

٢١. دوای ئەوەی ئوتێلەکەمان بەجێهێشت، یەکەمجار بەلای بنکە سەربازییەکانی خۆرئاوای شارەکەدا تێپەڕین. لە ڕێگاکەوە ئەوەندە نابینرێن، جگە لە چەند نیشانەیەک کە دەریدەخەن کاری بیناسازییان تێدا

دەکرێت. پاشان بە رێگە سەرەکییەکەدا بەرەو باکور چوین، رێگایەکی دووسایدی نایابی قیرە، تەنیا پێچێک نەبێت کە بۆ سەقز دەچێت و لەوێوە رومان کردە باشوری خۆرئاوا، کە بە شانیشییەوە رێگای بانەیە کە لە سنورەوە نزیکە. لە سەنەندەجەوە بۆ سەقز، زوربەی جێگاکە گۆلاوە و بەشێکی کشتوکاڵییە، ناوچەکە زۆر ئارام و سروشتییە و پڕە لە کانی رون و گوڵی کێوی داپۆشیوە.

٢٢. لە بەشی خۆرئاوای دەرەوەی سەقزیشدا بنکەی سەربازیی لێیە و دیسان ئەوێش کاری بیناسازیی تێدا دەکرێت. چەند کیلۆمەترێک دواتر سریەیەکی چەکدارمان بینی لەسەر شێوازی مەشقی جەنگی کە بەناو زەوییەکی کێڵراودا دەڕۆشتین، دوو سریە لەسەرەوە بون، هیچ دوکەڵێک نەبوو (!) و زۆر رێکخراو بون، دیاربو راهێنانیان لەسەر رێکخستنی دەکرد چونکە هیچ دوژمنێک یاخود ئامانجێکم نەدەبینی. نازانم بۆچی ئەو کێڵگەیە هەڵبژێردرابوو، ٤٠٠ مەتر لەولاترەوە بە هەردوو بەردا پەناگەی باش هەبون. دوای نزیکەی کیلۆمەترێک، لە باشوری خۆماندا کەمپێکی چادرمان بینی لەسەر زەوییەکی تەختی کەنار رووبارەکە، لەوێوە رێگایەک بەرەولای ئێمە دەهات. نزیکەی ٢٠٠ چادری دوو نەفەریی کاتیی هەڵدرابون، بەشێکیان چادری ١٨٠ پاوەندی بون، دوو چادری گەورەی ١٢ سێ تەنی، و یەک یان دوو ئوتومبیلی جێبی لێ بوو. رەنگە یەکەیەک بوبن بە سەردان هاتبن (بۆ نمونە فەوجێک؟) یاخود رەنگە یەکەکان سەقزبوبن تاوەکو کاری بیناسازی لە بنکەکانیاندا تەواو دەبێت لەوێ نیشتەجێ کرابن. هەرچۆنێک بێت بە هێڵی راستی شێوازی RSM زۆر بەرێکی هەڵدرابون. ناتوانم باس لە رێوشوێنەکانی پاک و خاوێنی بکەم.

٢٣. رێگای بانە بەتایبەتی لەوکاتەدا کە رێگا نزمەکە بە گردەکاندا

تێدەپەڕێنێت و ١٥ کیلۆمەترێک لەپێش بانەوە، کاری تێدا دەکرێت. شارۆچکەکە لەناو دەشتێکی بەپیتدایە و زۆر کوردانەیە. بەشێوازی جیاجیا پێشوازیمان لێ کرا، هەندێک لە خەڵکەکە پرسیارە ئاشکراکانی ئێمەیان نادیدە دەکرد و رویان لێ وەردەگێڕاین و بەلامانـدا رەت دەبون. وێستگەی سوتەمەنی کە ژاندارمێک دەیپاراست. زۆر دڵنیا نیم مانەوە لەو جێگایە بەبێ یەک دوو پاسەوانی شەوانە تا چەند ئاقڵانەیە (هۆتێلی لێ نییە).

٢٤. پاشان بەرەو سەقز گەڕاینەوە و چوینەوە سەر رێگا سەرکییەکە و، کاتژمێر ٦ی ئێوارە گەیشتینە مهاباد، دیسان چوینە باڕێکی گەشتیاریی کە کوالیتیەکی باشی هەبوو. دەبوو دوو شەوی داهاتوو لەم جێگەیە بەسەر ببەین.

**بەرئەنجام:**

٣٣. من لەم گەشتەمدا ئامانجەکەمم بەدەست هێناو هەردوکمان چێژمان لە گەشتە ٢٨٦٨ کیلۆمەترییەکە بینی، هەرچەندە (تایە)کان چێژیان لێ نەبینی. من ئێستا لەبارەی ناوچەی سنوری عێراقەوە زۆر (دەزانم)، بەڵام هێشتا رێگایەکی سەرنج راکێش ماوە کە رێگای مەریوان - بانە - سەردەشتە و دەبێت لە داهاتوودا گەشتی بۆ بکەم. هەموو شتێک ئارام و بێ کێشە بوو، جگە لە هەڵوێستی ژاندرم/ لیڤی یەک و چەند هاووڵاتییەکی شاری بانە نەبێت. ئێمە تەنیا جموجوڵی ئاساییمان لە هێزە سەربازییەکان بینی.

٣٤. بەوەی کە بینیم و بەو زانیارییە زۆر سنوردارەی کە خەڵک دەتوانێت لە سەرچاوەکانی دیکەوە دەستی بکەوێت دەزانم کە هیچ نائارامییەکی ئاشکرای کوردەکان لەئارادا نییە و هیچ جموجوڵێکی نائاسایی سەربازیی لە ناوچەکاندا نییە. بەڵگەیەکی دیکە بۆ راستی ئەم قسەیە ئەوەیە کە

بەبێ دوودڵـی رێگـەم پـێ درا بـۆ ئـەو شـوێنە بچـم کـە داوام کردبـوو. تکایـە ئـەم راپۆرتـە بـدە بـە هەمـوو ئـەو کەسـانەی پێـت وایـە گونجـاوە.

ئێم ئێچ جۆنز

**عەقید**

پاشکۆی سەر بە بەرگری و سەربازی

**نهێنی**
**ژمارە ..؟ (بێ ئاماژەدان بە ژمارەی بەڵگەنامەکە!)**
**بۆ تۆمار کردن**

## کوردەکان

١. "مستەر گراهام و مستەر دەی" هەڵوێستی ئێستای وەزارەتی ناوخۆیان بۆ کوردەکان باس کرد. مستەر دەی روونی کردەوە کە سیاسەتی وەزارەتی ناوخۆ بەڕوونی رێگرە لەوەی ئەو کوردانە دور بخرێنەوە تەنیا لەبەر ئەوەی بەناوی پارتی دیموکراتی کوردەوە چالاکیی سیاسییان ئەنجام داوە چونکە بەپێی هەمو پێودانگەکان قبوڵ دەکرێن. دەنگۆ نوێیەکەی خەرتوم لەبارەی بوونی سەرکردەی کودەتایەکی لەباربراوەوە لێرە، دەچێتە خانەی ئەم چوارچێوەیەوە.

٢. مستەر دەی ئەوەشی رونکردەوە کە رەنگە سەخت بێت قبوڵی بکەین کە ئەو کوردانەی دێنە بەریتانیا ئەوا ئاگاداریان بکەینەوە کە لەم وڵاتەدا بەشداریی چالاکیی سیاسی نەکەن.

ئیان مەککلۆنی
بەشی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست
٩ی ئابی ١٩٧٦

**نهێنی**
**ژمارە ... (بێ ئاماژەدان بە ژمارەی بەڵگەنامەکە!)**
**مستەر لیتڵفیلد (PUSD E203)**

## پارتی دیموکراتی کورد (پدک)

١. ئـەم پاشـنیوەڕۆیە باڵیـۆزی عێـراق پێـی راگەیاندیـن کـە: پـدک دەیەوێـت کۆنفرانسـی سـاڵانەی لقەکانـی ئەوروپـای لـە نێـوان ١٥ بـۆ ١٨ی ئابـدا لـە لەندەن ئەنجـام بـدات. پێشـتر بڕیـار وابـوو کـە ئـەم کۆنفرانسـە لـە ئەڵمانیـای خۆرئـاوا (بەرلیـن) ئەنجـام بدرێـت بـەڵام ئێسـتا گواسـتراوەتەوە بـۆ لەنـدەن.

٢. پرسـیاری ئـەم بابەتـەم لـە بەڕێـز بـۆن (جـی ئێـم سـتێفنس) کـرد کـە جەختـی لـەوە کـردەوە کـوردەکان بەنیازبـوون کۆنفرانسـێک لـە ئەڵمانیا ببەسـتن. ئـەوان تـێ گەیەنـراون کـە ئـەم کارە نەخـوازراوە، بۆیـە رەنگـە پلانیـان دانابێـت لەبـری بەرلیـن، لـە لەنـدەن ئەنجامـی بـدەن.

٣. مـن MVD و (مسـتەر مالێـت) وەزارەتـی ناوخـۆ (مسـز بێلفـۆڵ) مـان ئاگـادار کـردەوە. ئەمـڕۆ MVD گشـتاندنێک بـۆ بنکەکانـی ئەوروپـا و خۆرهەڵاتـی ناوەڕاسـت دەنێرێـت و پرسـیاری ئـەو کەسـانەیان لـێ دەکات کـە بـۆ بەشـدارییکردن لـەو کۆنفرانسـەدا لـە لەنـدەن داوای ڤیزایـان کـردووە.

٤. سوپاسـت دەکـەم ئەگـەر هـەر زانیارییەکـت لەبـارەی ئـەو کۆنفرانسـەوە هەبێـت. هـەروەک باڵیـۆز ئامـاژەی پـێ داوە، بەسـتنی کۆنفرانسـی پـدک لـە

لەنـدەن رەنگـە زیـان بگەیەنێـت بـە پەیوەندییـە دولایەنەکانمـان لەگـەڵ عێراقـدا. حـەز دەکەیـن رێگایـەک بدۆزینـەوە کـە بـە پـدک رابگەیەنیـن کۆنفرانسـەکە لـە لەندەنیـش بـە هەمـان ئەنـدازەی بەرلیـن نەخـوازراوە.

ئیان مەککلۆنی
بەشی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست
3751 233 92
١٠ی ئابی ١٩٧٦

وێنەیـەک بـۆ مسـتەر مالێـت (بەشـی کـۆچ و ڤیـزا سـی.ئێڵ ٤٣٤) و، مسـتەر دەی (بەشـی خۆرهەڵاتـی ناوەڕاسـت)

**٧٠**

**١٢ی ئابی ١٩٧٦**

**بەپەلە**

**سایفەر/ پۆلینی A**

**لە وەزارەتی دەرەوە و کۆمۆنوێڵز**

**نهێنی**

**بەپەلە بۆ: بروسکەی بەغدا ژمارە ٣٥٠ی ٨/١١**

**زانیاری تاران بۆن**

## ئەگەری کۆنفرانسی کورد لە لەندەن لە ١٥ تا ١٨ی ئاب:

١. باڵیۆزی عێراق دوێنێ پێی راگەیاندم کە لقەکانی ئەوروپای پدک بەرنامەیان وایە لەنێوان ١٥ تا ١٨ی ئابدا لە لەندەن کۆنفرانسی ساڵانەیان ئەنجام بدەن. ئەو ئاماژەی بەوە داوە کە رەنگە ئەم کارە زیانی گەورە بە پەیوەندیی نێوان بەریتانیا و عێراق بگەیەنێت کە ئێستا لەگەشەکردندایە و بە دڵنیاییەوە خراپترین دەستپێک دەبێت بۆ ئەو لەم پۆستە نوێیەیدا. ئەو داوای کرد دەوڵەتی بەریتانیای مەزن بتوانێت هەنگاو بۆ هەڵوەشاندنەوەی کۆنفرانسەکە بنێت.

٢. "دەی" باسی لەو کێشە درێژخایەنانە کرد کە رووبەرووی دەوڵەتی بەریتانیای مەزن دەبنەوە لە مەسەلەی دەستێوەرداندا لەو کۆبونەوانەی کە بەشێوەیەکی یاسایی لە بەریتانیادا رێک دەخرێن. ئەو نیگەرانییەکەی دەربڕی و ئاماژەی بە وتوویژەکەی مستەر ئینال کرد لە بەغدا کە لەسەر ئەم بابەتە هەستیارە ئەنجامی دابوو، و دەستبەجێ دەستی بە لێکۆڵینەوە کرد.

٣. بۆمـان دەرکەوتـووە کـە نیـاز وابـووە کـە ئـەم کۆنفرانسـەی پـدک لـە ئەڵمانیـای خۆرئـاوا ئەنجـام بدرێـت و پاشـان ئەڵمانییـەکان بـە نهێنـی داوایـان لـێ کـردوون لـە جێگەیەکـی دیکـە ئەنجامـی بـدەن. EWE یـش هیـچ پـێی خـۆش نی‌یـە کـە کارئاسـانی بـکات بـۆ گرێدانـی ئـەم کۆنفرانسـە لێـرە. لەگـەڵ ئەوەشـدا، وەک دوا پەناگـە، دەتوانیـن ئامـاژە بـەوە بدەیـن کـە هیـچ رێگەیـەک نی‌یـە رێگری لـەو کوردانـە بکەیـن کـە بـە یاسـایی هاتونەتـە وڵاتەکـەوە و نەهێڵیـن کۆببنـەوە. ئەگـەر ئـەم بۆنەیـە لێـرە ئەنجـام بدرێـت، حەزدەکەیـن حکومەتـی عێـراق بـە تـەواوی ئاگـادار بێتـەوە کـە بەبـێ رەزامەنـدی یاخـود پشـتیوانیی دەوڵەتـی بەریتانیـای مـەزن ئەنجـام دراوە، بـەڵام ناتوانـرێ بەشـێوەیەکی یاسـایی رێگـەی لـێ بگیرێـت.

٤. ئێمـە هەوڵمـان داوە کـە بـە نهێنـی کـوردەکان ئاگـادار بکەینـەوە کـە کۆنفرانسـەکەیان لێـرە نەخـوازراوە. MVD گشـتاندنێکی بـەو بنکانـەدا بڵاوکردووەتـەوە کـە رەنگـە بەشـدارانی کۆنفرانسـەکە لێیانـەوە داوای ڤیـزا بکـەن، و داوای لـێ کـردون هەمـوو داوایەکـی لەوجـۆرەی بـۆ رەوانـە بکـەن.

تائێسـتا هیـچ بەڵگەیەکـی راسـتەوخۆمان نی‌یـە کـە دەریبخـات ئەو کەسـانە بە نیـازی هاتـن بـن. لەگـەڵ بەدەسـت گەیشـتنی زانیاریـی نـوێدا ئـەوا ئەنجامدانـی کاری پێویسـت لەبەرچـاو دەگرین.

کرۆسلاند

دۆسـییەکان: PUSD ،MED ،MVD، بەشـی نەتـەوە یەکگرتـووەکان، NEMAI، بەڕێـز مسـتەر لـوراد، بەڕێـز مسـتەر هاتەرسـلی و، سـێر ئـەی. دەن.

**جی پی ئێس ٢٣٠**
**دەستبەجێ**
**١٣ی ئابی ١٩٧٦**
**سایفەر/ پۆلین A**
**لە وەزارەتی دەرەوە و کۆمۆنوێڵزەوە (Z.١١١٩١)**
**تایبەت**

بەپەلــە بــۆ بــۆن راپۆرتــی ژمــارە ٤١٩ی رۆژی ١١ی ئــاب و ڤیەنــا، بێــرن، جنێــف، ســتۆکهۆڵم، پاریــس، رۆمــا، برۆکســل، لۆکســەمبۆرگ، هــاگ، تــاران، قاهیــرە، دیمەشــق، عەممــان، ئەنقــەرە، کۆپنهاگــن، هێلســنکی، ئەســینا، ئۆســلۆ، مەدریــد، کوەیــت، ئەبوزەبــی، دوبــەی، دۆمــە، جــددە، بولگاریــا، واشــنتۆن، نیویــۆرک، ئۆتــاوا، دبلــن و کابــوڵ.

## کۆنفرانسی ساڵانەی پارتی دیموکراتی کورد

١. پێمــان راگەیانــدراوە کــە ئــەو کۆنفرانســە ســاڵانەیەی پــدک کــە بڕیاربــوو لــە ئەڵمانیــای خۆرئــاوا ببەســترێ ئــەوا ئێســتا نیــاز وایــە لەنێــوان ١٥ تــا ١٨ی ئــاب لــە لەنــدەن ببەســترێت.

٢. دەبێــت داواکاری ڤیــزای هەمــوو ئــەو کەســانەی کــە بەنیــازن بێنە شانشــینی یەکگرتــو و بەشــداریی لــە کۆنفرانســەکەدا بکــەن ئــەوا بنێردرێــت بــۆ بەردیــدی بەشــی کــۆچ و ڤیــزا. وا دیــارە زۆرێــک لــە داواکارەکان هەڵگــری پاســپۆرتی

عێراقیـن و داواکانیـان نێـرداوە کـە بڕیـاری لەسـەر بدرێت، بـەڵام پێویسـتە ئـەو وەفـدە کوردییانـەش دەستنیشـان بکرێـن کـە بەڵگەنامـەی نەتەوەکانـی دیکـەش بەکاردەهێنـن.

٣. ئەمـەی لای خـوارەوە نـاو و ناونیشـانی هەندێـک ماڵـی بەرپرسـەکانی پدکـە لـە شانشـینی یەکگرتـوو کـە لەوانەیـە لـە دەستنیشـانکردنی وەفدەکانـی کۆنفرانسـەکەدا یارمەتیـان بـدەن:

١) هاوار و ئاراس زەید
AIRLIE GARDENS 10
LONDON W C B
٢) جەمال عەلەمدێر
ناونیشانی نەزانراوە
٣) ئۆ. عەتتار
LACK LION LANE 61
LONDON W6

ئەنجومەنی باڵای شۆڕش بە پشت بەستن بە یاساکانی بڕگەی (ا) لە ماددەی ٤٢ی دەستوری کاتی، لە کۆبونەوەیەکدا کە لە رۆژی ١٦ی ئابی ١٩٧٦ گرێدرا ئەم یاسایەی دەرکرد:

یاسای ژمارە ٩٣ی ساڵی ١٩٧٦ سەبارەت بە لێبوردنی گشتی بۆ کوردانی ریزەکانی سوپا و دەزگا مەدەنییەکان:

**بڕگەی ١**:

ئەو کوردانەی لە سوپا، پۆلیس، ئاسایش، رەگەزنامە، هاتۆچۆ، و پاسەوانی سنور کاریان کردووە و لە ماوەی کارپێکراوی ئەم یاسایەدا خۆیان بگەیەننە نزیکترین بارەگای سەربازی، ئەوا لەم سزایانەی خوارەوە دەبەخشرێن:

١. ئەو سزایانەی کە لە یاسای سەربازییدا هەن سەبارەت بە ئامادەنەبون لە شوێنی کار، یاخیبون، یاخود هەڵهاتن.

٢. سزای سەرەکی یاخود لاوەکییەکان لە بڕگەکانی ١١٦ و ١١٧ی یاسای سزای سەربازی ژمارە ١٣ی ساڵی ١٩٤٠ (چاککراو) دا هاتون.

**بڕگەی ٢**:

کوردەکان لە سزاکانی یاسای خزمەتی سەربازی ژمارە ٦٥ی ساڵی ١٩٦٥ و هەروەها لە یاسای خزمەتی بەرگری نیشتمانی دەبەخشرێن بەو مەرجەی لە ماوەی کارپێکراوی ئەم یاسایەدا خۆیان بگەیەننە نزیکترین بارەگای سەربازی.

**بڕگەی ٣**:
کاربەدەستە دەوڵەتییە کوردەکان، کارمەندان و کرێکاران لە هەمو ئەو سزایانە دەبەخشرێن کە بەهۆی ئامادەنەبونی ڕێگەپێنەدراوەوە دروست بووە بەو مەرجەی کە لەماوەی کارپێکراوی ئەم یاسایەدا پەیوەندی بکەنەوە بە شوێنی کارەکەیانەوە یاخود بە نزیکترین بارەگای سەربازی یاخود مەدەنییەوە.

**بڕگەی ٤**:
ئەو یاسایانە کە لە بڕگەکانی سەرەوەدا هاتون ئەوا هەموو کوردەکان دەگرێتەوە چ ئەوانەی ناو عێراق و چ ئەوانەی کە لەکاتی دەرکردنی ئەم یاسایەدا لە دەرەوەی عێراقن.

**بڕگەی ٥**:
ئەو کوردانەی کە ئەم یاسایە دەیانگرێتەوە لە خزمەتی زۆرەملێی سەربازی یاخود خزمەتی یەدەک، یاخود ئەگەر کەسەکە پێشتر لە ریزەکانی سوپادا بووە و لەپێش دەرچونی ئەم یاسایە لە کارەکەی دوور کەوتۆتەوە یاخود هەڵهاتووە، لەو ماوەیە دەبەخشرێن کە لە هەرکام لەم خزمەتانەی مابێت ئەوا دەبەخشرێت.

**بڕگەی ٦**:
ئەم یاسایە لە ڕۆژنامەی فەرمیدا بڵاو دەکرێتەوە و لە ڕۆژی دەرچونییەوە کاری پێ دەکرێت. بەندەکانی ئەم یاسایە تاوەکو ڕۆژی ١٥ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٦ کاریان پێ دەکرێت.

**نەتەوە یەکگرتووەکان**
**ئەنجومەنی ئابوری و کۆمەڵایەتی**
**کۆمسیۆنی مافەکانی مرۆڤ**
**لقی رێگریکردن لە هەڵاوێرکردن و پاراستنی کەمینەکان**
**دانیشتنی بیستونۆهەم**
**رۆژەفی ژمارە ٨**
**جنێف، ١٩ی ئابی ١٩٧٦**

پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤ و ئازادییە بنەڕتییەکان: کارێک لەلایەن کۆمەڵگای دژە-کۆیلایەتییەوە.

بەرێز سەرۆک:

ئەم لقی کۆمسیۆنە بە ناهەمواریەکانی ئاوارە فەلەستینییەکان ئاشنایە و ئاگاداری ئەو نارەحەتییانەیە کە بەهۆی بەناو راگواستنەکەی نیشتمانەکەی "بانتوو"ەوە بەسەریاندا هاتووە. داوای بوارم کردووە کە سەرنجتان بۆ کوێرەوەرییەکانی میللەتێکی دیکە رابکێشم کە بەدەست چارەنوسێکی هاوشێوەوە گیرۆدە بوون و زۆربەیان لە نیشتمانەکەیان دورخراونەتەوە و پەراکەندە کراون.

ئەو گەلەی کە باسی لێوە دەکەم ئەوەیە کە نیشتمانە شاخاوییەوکەی هەمیشە جێگەی ژیانیان بووە و بەسەر پێنج وڵاتدا دابەش کراون. مەبەستم لە: گەلی کوردە.

کورد لە یەکێک لە وڵاتەکان کە ئۆتۆنۆمییەکیان رەت کردووەتەوە،

ئەمەش لەبەر چەند هۆکارێک کە ئەندامانی ئەم لقە لێی بەئاگان، لەپێناو سەربەخۆییدا جەنگان و شکستیان پێ هێنرا. نزیکەی ٣٠٠ هەزارێکیان پەنایان بردە بەر وڵاتێکی تر. لێبوردنێک دەرکرا و پەنابەران دڵنیا کرانەوە لەوەی ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ وڵاتەکەی خۆیان، مافی یەکسانیان لەگەڵ هاووڵاتیانی دیکەی وڵاتەکەیاندا دەبێت.

هەموو کەسێکی ئەقڵانی لەوە تێ دەگات کە ئەوە ئەرکی حکومەتە پارێزگاری لە ئارامیی سنورەکانی بکات و، ئەو برینانە سارێژ بکاتەوە کە خەڵکەکەی دابەش کردووە. ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی: گرتنەبەری چ سیاسەت و چ ڕێوشوێنێک دەتوانێت ئەم ئامانجانە بەدەست بهێنێت، کارێکی سەختە. ئەمەش بە دڵنیاییەوە یەکێکە لە سەختترین پرسە بنەماییەکان کە لە کرۆکی ئەرکەکانی لقی کۆمسیۆنی ڕێگریکردن لە هەڵاوێرکردن و پاراستنی کەمینەکاندایە.

لەم ساڵانەی دواییدا، چەند هەوڵێک لەلایەن کەمینە جیاجیاکانەوە لە جیهاندا دراون بۆ ڕزگاربوون لەو کۆت و پێوەندانەی کە وەکوو میراتێکی حوکمی ئیستیعمار و لەگەڵ کێشانی سنورەکاندا بەبێ گوێدانە جیاوازییە ڕەگەزییەکان کێشراوە و، بۆیان ماوەتەوە. بە خۆشحاڵییەوە هەندێ لەم هەوڵانە بە بەکارهێنانی حیکمەت، ئەقڵانییەت و بەخشندەیی هەردوو لایەنەکەوە چارەسەر کراون. ئەوانی تر هێشتا بەردەوامن، بە خۆیان و هەموو ئەو مەرگەساتانەوە کە بەدوای خۆیاندا دەیانهێنن.

حکومەتی ئەو وڵاتە ڕاستییەکانی هەموو ئەم ڕاپۆرتانەی ڕەت کردۆتەوە. بەڵام ئێمە پێمان وایە کە سروشتی ڕاپۆرتەکان دەرخەری بوونی ئەو بارودۆخەیە و ئەمەش شایستەی ئەوەیە کە کۆمسیۆنی مافەکانی مرۆڤ لێکۆڵینەوەی لەسەر بکات. بۆیە داوا لە لقی کۆمسیۆن دەکەم کە پێشنیار بکات کە لێکۆڵینەوەیەکی لەوجۆرە ئەنجام بدرێت.

ئـــەو راپۆرتانـــەی کـــە بەدەســـتمان گەیشـــتوون بانگەشـــەی زۆر دەکـــەن. بەشـــێک لـــەو بانگەشـــانە بریتیـــن لـــە:

أ) راگواستنی بە کۆمەڵی کوردان لە باکورەوە بۆ باشور.

ب) کۆمـەک و نیشـتەجێکردنی عـەرەب و تەنانـەت کۆچبـەرە بیانییـەکان لـەو شـوێنانەی کـە پێشـتر شـوێنی کـوردەکان بـووە.

ج) لەسـێدارەدانی ٢٢٤ کـورد لـە مانگـی ئـازاری ١٩٧٥ەوە و دەسـتگیر کردنـی ٢٠٠ بـۆ ٣٠٠ کەسـی کـورد لـە مانگـی تشـرینی یەکـەم و دووەمـی سـاڵی ١٩٧٥دا، بەهـۆی بەشـدارییکردنیان لـە چالاکی سیاسـیی دا.

د) پێدانـی ٥٠٠ دینـار (١٥٠٠ دۆلار) بـەو کەسـانەی کـە هاوسـەرگیری نێـوان عـەرەب و کوردێـک رێـک دەخـەن. ئەمـە کـراوە بـە فەرمانـی کارگێڕیـی و هیـچ رێگرێکـی یاسـایی نایگرێتـەوە.

ه) بەردەوامبوونـی سیاسـەتی "بـە عەرەبکـردن" کـە ئەمانـەی خـوارەوە لەخـۆ دەگرێت:

-قەدەغـە کردنـی وتنـەوەی زمانـی کـوردی لـە قوتابخانەکانـی سـێ شـارە کوردییەکـــەدا.

-سێ رۆژنامە کە بە زمانی کوردی دەردەکران ئەوا داخران.

-ســتافە کــوردەکان لـــە زانکۆکانـــدا زۆر کەمکراونەتـــەوە و، نـــاوی شـــار و شـارۆچکە و گونـدەکان کـە پێشـتر کـوردی بـوون گـۆڕاون بـۆ نـاوی عەرەبـی.

سـەبارەت بـەو زانیارییـەی کـە بـاس لـە کـوردە کـوژراو و زیندانیکـراوەکان دەکات، ئـەوا قـەرزداری رێکخـراوی لێبوردنـی نێودەوڵەتیین. چونکـە رێکخراوەکە بـەوە شایسـتەیی بـە راپۆرتەکانـی دەدات کـە دەڵێـت نابێت لیسـتەکان بە گشـتگیر بزانرێـن لەبـەر ئـەوەی دەستگەیشـتن بـە زانیـاری کارێکـی سـەختە. هۆکارەکەش ئەوەیــە: کــە دەســتگیرکردن و لێکۆڵینــەوە و لەســێدارەدان زوربــەی جــار بــە

نهێنیــی ئەنجــام دەدرێــن و، خێزانــەکان ئاگــادار ناکرێنــەوە و زیندانییــەکان دەســتیان بــە پارێــزەر ڕاناگــات. دادگاییکــردن ئەگــەر هەبێــت، ئــەوا هەمیشــە لــە دانیشــتنی داخــراودا بەڕێــوە دەچێــت و ڕێگــە بــە پارێــزەری بەرگریــکار نادرێــت. ڕەنگــە لەســێدارەدانی زیندانییــەک تەنیــا ئــەو کاتــە پشتڕاســت بکرێتــەوە کــە لاشــەکەی دەدرێتــەوە دەســت خێزانەکــەی.

یەکێکــی تــر لــە بانگەشــەکان بریتــی بــوو لــە: ڕاگواســتنی بەکۆمــەڵ: حکومــەت وتوویەتــی هەمــوو کــوردەکان جگــە لــە هەنــدێ ســەرکردەی بزوتنــەوە جوداییخوازەکــە، ئــەوا ڕێگەیــان پێدەدرێــت کــە بگەڕێنــەوە بــۆ ســەر ماڵوحاڵــی خۆیــان. بــەڵام ئەمــە پێچەوانــەی لێدوانــی هەنــدێ لــە وەزیرەکانــە بەتایبەتــی لێدوانەکانــی جێگــری ســەرۆکی ئەنجومەنــی فەرماندەیــی شــۆڕش کــە لــە ڕۆژی ٥ی تەمــوزی ١٩٧٦ دا ڕایگەیانــد: "دەســەڵاتدارە لێپرســراوەکان چەنــد ڕێوشــوێنێکیان گرتووەتــە بــەر، بــۆ نموونــە گۆڕینــی جێگــای خەڵکانــی هەنــدێ لە گونــد و هەنــدێ لــە ناوچــە ســتراتیجییەکان، هەروەهــا گۆڕینــی شــوێنی هەنــدێ کــەس بــۆ نموونــە: فەرمانبەرانــی کەرتــی گشــتیی و کرێــکار و کەســانی تــر".

ئــەم "گۆڕینــی شــوێن"ە بەســەر ٣٠٠ هــەزار کەســدا لــە گەنــج و پیــر پیــادە کــراوە، بەشــێک لــەم کەســانە هیــچ پەیوەندییەکیــان بــە سیاســەت یاخــود بــە چەکدارانــەوە نەبــووە و، ئێســتاش هەمــوو شــتێکیان لەدەســت داوە. ئەمــەش واتــە هەڵتەکاندنیــان لــە نیشــتمانی باووباپیریــان. بەشــێک لــەو کەســانە، بەبــێ هیــچ ئاگادارییــەک ڕاگوێــزراون و، لــە خێزانەکانیــان دابــڕاون. لــە بارهەڵگــر ئاخنــراون و ٦٠٠ میــل لــە بارودۆخێکــدا کــە مــن باســی لێــوە ناکــەم، لــە شــاخە فێنکەکانــی خۆیانــەوە گواســتراونەتەوە بــۆ بیابانێــک کــە لــەم دواییانــەدا وشکەســاڵی دانیشــتوانەکەی ڕاگواســتووە.

لێــرە، لــەم شــوێنەی بەنــاو "ناوچــەی کشــتوکاڵی"یە، لــە ئۆردوگــادا نیشــتەجێ کــراون بــۆ ئــەوەی کەناڵــی ئاودێــری هەڵکەنــن. لــەم ناوچەیــەدا ڕۆژانــە پێنــج

تا دە منداڵی کورد بەهۆی کەمئاوییەوە دەمرن. خێزانە کوردەکانی دیکە بەسەر گوندەکانی ناوەڕاست و باشووری وڵاتدا پەرشوبڵاو کراونەتەوە و، دەستبەجێ بۆیان دەرکەوت کە هاتنەکەیان جێگەی دڵخۆشی نییە: نانخۆری دیکە دێتە سەر هەمان سفرەی بچوک. بە فەرمی ئازار دەدرێن و مەبەست لەم کارەش وروژاندنی هەستی تەریکخستنەکەیانە. بەمدواییە هەستیان کردووە دراوسێکانیان دۆستانەتر مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەن و بەرامبەر بەو بارودۆخەی کە بە ناشایستەی دەزانن، هاوسۆزییان لەگەڵ دەردەبڕن. هەرچەندە بەرنامەکە لە سەرەتادا ئەوە بوو: سێیەکی کوردەکان ڕاگوێزرێن، کە دەکاتە یەک ملیۆن کەس، بەڵام بەم دواییە ئەم پرۆسەیە ڕاگیراوە. بڕوا وایە وەستاندنی ئەم پرۆسەیە بەهۆی ئەو هاوسۆزییەوەیە کە بەرامبەر بە کوردەکان دروست بووە.

سەرۆکی بەڕێز: من لەم نووسینەدا بە وریاییەوە ئەو وردەکارییە تۆقێنەرانەم سڕیوەتەوە کە ڕاپۆرتەکانمان لێیان خاڵی نییە. من ئەم کارەم بە مەبەست ئەنجام داوە.

یاسای ئۆتۆنۆمی، کە لە ساڵی ١٩٧٤ بۆ هەرێمە کوردییەکە دەرکرا، ددان بە بوونی گەلی کورددا دەنێت و دڵنیایان دەکاتەوە کە داوودەزگای سیاسیی خۆیان و هەمان ئەو مافانەیان دەبێت کە عەرەبی زۆرینە هەیانە. ئامانجی ئەم یاسایە وەکوو ڕاگەیەندراوە بریتییە لە: گێڕانەوەی ئاشتیی و یەکێتیی نەتەوەیی. ڕاگەیاندنەکە لە ڕۆژی ٢ی نیسانی ١٩٧٦ لەلایەن لیژنەی نەهێشتنی هەڵاویری ڕەگەزیی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکانەوە پێشوازی لێ کرا، چونکە ئەم کارە "پێکەوەژیانی ئاشتییانەی نێوان دوو نەتەوە سەرەکییەکەی وڵات زامن دەکات".

دامەزراوەکەی من بڕوای وایە: کە جێبەجێکردنی بەویژدانانەی ئەو یاسایە، بەو شێوەیەی لە دەقەکەیدا هاتووە، دەتوانێ ئامانجی دڵخۆشکەر بەدی بهێنێت. بەڵام پێدەچێت پێویست بە گۆڕینی ناخی بەشێک لە دەسەڵاتداران

بـکات. ئەمـە ئەزموونـی دوو پاریـزەری هۆڵەندیـش نیشـان دەدات کـە بەهـۆی بـڵاو کردنـەوەی راپۆرتـی رۆژنامەوانیـی لـە هۆڵەنـدا لەسـەر مامەڵـەی خـراپ لەگـەڵ کوردەکانـدا، وەکـوو میـوان لەلایـەن حکومەتـەوە بانگێشـت کـران بـۆ ئـەوەی راسـتەوخۆ و وەکـوو خۆی بینـەری بارودۆخەکـە بن. لـە رۆژی پێنجەمی سـەردانەکەیاندا پێیـان راگەیەنـرا کـە داواکەیـان سـەبارەت بـە سـەردانیکردنی ئـەو جێگایانـەی کوردەکانـی بـۆ راگوێـزراوە بووەتـە هـۆی ئـەوەی حکومـەت حـەزی بـە مانەوەیـان نەبێـت و هەمـان رۆژ ناچـار کـران وڵاتەکـە بەجـێ بهێڵـن. کاربەدەسـتی وەزارەتـی راگەیانـدن گوتـی: "ئێمـە چاوەڕوانیـی ئەوەمـان لـە میوانـەکان هەیـە کـە لایەنـە درەوشـاوەکانی بابەتـەکان ببینـن. چاوەڕێـی ئەوەیـان لـێ ناکەیـن کـە تەماشـای لایەنـە تاریکەکانـی کاروبـاری ناوخۆمـان بکـەن، کـە بەتـەواوی بابەتێکـە پەیوەنـدی بەخۆمانـەوە هەیـە".

کۆمەڵگـەی دژی کۆیلایەتـی داوا دەکات کـە لقـی کۆمسـیۆن پێشـنیاری لێکۆڵینەوەیـەک بـکات لەسـەر ئـەو بارودۆخـەی کـە باسـم کـرد.

**نهێنی**
**بۆ لەبەرگرتنەوە و بڵاوکردنەوە نیە**
**راپۆرت**

**سەردان بۆ تاران، ٢٩ی تەموز بۆ ٨ی ئابی ١٩٧٦**

**لەلایەن:**
**کێنیت لی، سەرۆکی کۆمەڵگەی دۆستایەتی بەریتانی- کوردی**

## ئامانج:

ئامانجی سەردانەکە دروستکردنی پەیوەندیی راستەوخۆ بوو لەگەڵ دۆخی کوردە عێراقییە پەنابەرەکانی ئێران و، بەتایبەتی بۆ ئەوە بوو کە پرۆسەی هەڵبژاردنەکە لەگەڵ نوێنەرانی پدک و کونسولی بەریتانیا باس بکرێت، بۆ ئەو دۆزانەش کە حکومەتی بەریتانیا رێگا دەدات کە بەهۆیەوە بێنە شانشینی یەکگرتووەوە. هیواخوازیش بوم کە چاوم بە باڵیۆزی بەریتانیا بکەوێت. گرنگ بوو سود لە ئامادەبونی مستەر لێسلی گودیەر وەربگیرێت کە ناوبراو نوێنەری کۆمیسیۆنی باڵای نەتەوە یەکگرتووەکانە بۆ کاروباری پەنابەران، کە دوای ئەوەی چەند مانگێک کارکردن لە ئێران دابوو لەبارەی جوڵەی کوردە عێراقییە پەنابەرەکانەوە بۆ وڵاتانی تر، ئەوا نیازی بوو پشویەک وەربگرێت. من وەک سەرۆکی کۆمەڵگەی دۆستایەتی بەریتانی - کوردی ناوی خۆم بۆ داواکاریی هاوکاری بەکاردەهێنا، چ لەبەردەم حکومەتی بەریتانیا و چ بۆ داواکردنی کۆمەکی ماددی بەتایبەتی بۆ کۆمەکی

دارایـی دەزگـای زانکـۆی جیهانـی (WUS) بـۆ خوێنـدکارە کـوردەکان، بەگشـتیش لـە ڕێگـای ئـەو بڵاوکراوانـەی کـە جاروبـار کۆمەڵگـەی دۆسـتایەتی بەریتانـی- کـوردی بـڵاوی کردونەتـەوە. هەروەهـا لـە ڕێگـای ئەنجومەنـی بەریتانیـا بـۆ کۆمەککردنـی پەنابەرانـەوە کـە خـۆم تیایـدا جێگـری سـەرۆکم، پەیوەندییـم هەیـە بـە خۆشـگوزارەنی و نیشـتەجێکردنی ئـەو پەنابەرانـەی کـە دێنـە ئـەم وڵاتـەوە. بۆیـە زۆر گرنگـە کـە ئـەو ئەزمونـەی لەبـارەی بارودۆخەکـەوە هەمـە لـەو زانیارییانـە بەرفراوانتـر بێـت کـە لـە ڕێگـەی نوێنەرانـی پارتـی دیموکراتـی کوردسـتان لـە شانشـینی یەکگرتـووەوە بەدەسـتی دەهێنـم.

### ئامادەکاری:

لەپێنـاو خۆئامادەکـردن بـۆ سـەردانەکە، چەنـد چاوپێکەوتنێکـم لـە وەزارەتـی دەرەوە و کۆمۆنزێلـز و وەزارەتـی ناوخـۆ لەگـەڵ ئەفسـەرە پەیوەندیدارەکانـدا ئەنجامـم دا، هەروەهـا چـاوم بە نوێنـەری UNHCR لـە شانشـینی یەکگرتو، WUS و BCAR و پـدک کـەوت. مـن سوپاسـی یارمەتییەکانیـان دەکـەم و، لەکاتێکـدا کـە دەتوانـم هەنـدێ لـە بۆچونەکانیـان لـەم ڕاپۆرتـەدا بـاس بکـەم، پێویسـتە ئامـاژە بـەوە بکـەم کـە ڕاپۆرتەکـە لەسـەر بنەمـای تێگەیشـتنی منـە لـە هەڵوێسـتیان، نـەوەک ئەمـە گواسـتنەوەی دەقـاودەق و بێدەسـتکاریی ببێـت بـۆ بۆچـون و هەڵوێسـتەکانیان. ئەمـە بـۆ ئـەو کەسـانەش ڕاسـتە کـە لـە ئێـران چـاوم پێیـان کـەوت، کـە مـن بـە هەمـان ئەنـدازە قـەرزداری میهرەبانـی و هاوکارییەکانیانـم کـە وایکـرد ئـەو سـەردانە کورتـەم ئەوەنـدە بەسـود بێـت.

### پێشینە:

لـەدوای جەنگـی یەکەمـی جیهانییـەوە، نەتـەوەی کـورد کـە لـە ناوچەیەکـی گرێـداوی سـەرزەمینێکی شـاخاوییدا دەژین، لە باشـور و خۆرهـەلات و خۆرئاوای دەریـای قەزوینـدا، بـە کـردەوە سـەربەخۆییان وەرنەگـرت و لـە پێنـج وڵاتـدا کـە

تورکیا و عێراق و ئێران و یەکێتی سۆڤێت و سوریان، بونەتە کەمینە.

لە عێراق پرسی ئۆتۆنۆمی کوردەکان دانی پێدانراوە و وتووێژی لەسەر کراوە، بەڵام دەرکەوتووە کە گەیشتن بە ڕێکەوتنێک کە کوردەکان بەدڵیان بێت ئەستەمە، بەتایبەت سەبارەت بە پێناسەکردنی ناوچە ئۆتۆنۆمەکان، کە بەبۆچونی پدک دەبێت کەرکوکیش لەخۆ بگرێت. دانوستاندنەکان شکستیان هێنا و حکومەتی عێراق تاکلایەنە شێوازی ناوچەی ئۆتۆنۆمییەکەی دیاریکرد و بەبێ ڕەزامەندیی پدک بڕیاری لەسەردا، کە شۆڕشێکی چەکداریی بەدوای خۆیدا هێنا. ئەمەش ئەگەرێکی کراوە بوو چونکە حکومەتی ئێران پشتیوانی لە پدک و جەنەراڵ بارزانی دەکرد و ئەو پشتیوانییە لەگەڵ ڕێکەوتننامەی جەزائیردا کۆتایی پێ هات کە ڕێکەوتنێکی نێوان ئێران و عێراق بو و لە ڕۆژی ٦ی ئازاری ١٩٧٥ راگەیەنرا و لەبارەی یەکلاکردنەوەی کێشە سنورییەکانی نێوان ئەو دوو وڵاتە بوو. بەهۆیەوە، ئێران خۆی لە پشتیوانی کردنی بزوتنەوەی کوردی کشاندەوە.

نزیکەی ١٩٠ هەزار کوردی عێراق پەنایان بردە بەر ئێران، سەرەتا لە کەمپەکاندا نیشتەجێ کران و، دواتر بە ناوچە جیاجاکانی ئەو وڵاتەدا بڵاوکرانەوە. لە ئەنجامی ئەو لێبوردنانەی کە عێراق رایدەگەیاندن، ژمارەیەکی زۆری کوردە عێراقییەکان گەڕانەوە بۆ عێراق، بەڵام نەک بۆ شوێنەکانی پێشویان کە لێوەی هاتبوون. بگرە حکومەتی عێراق ددانی بەوەدا ناوە کە سیاسەتی دوبارە دابەشکردنەوەی کوردەکانی بەسەر ناوچەکانی دیکەی وڵاتدا سەپاندووە و ناوچە کوردییەکانی (بە زۆرەملێ) بەعەرەبکردووە.

بەپێی خەملاندنەکان، تا ئێستا (ئابی ١٩٧٦) ئەوا ٣٥ هەزار کوردی عێراقی لە ئێران ماونەتەوە. زۆرینەی کوردەکان جوتیارن و لە ناوچە شاخاوی و دۆڵەکاندا دەژین. جیابوونەوەکە و سەربەخۆییە سروشتییەکەی

ئـەم خەڵکانـە وایکـردووە هەسـتکردن بـە گرنگـی کارکردنـی پێکەوەیـی لەپێنـاو سـەربەخۆیی سیاسـییدا لەناویانـدا دوابکەوێـت. ئەمـان لـە روی ڕەگەزییـەوە لـە عـەرەب جیـاوازن و کلتورێکـی جیاوازیـان هەیـە. بـە ئایـین مسـوڵمانی سـوننەن - هـەر وەک سـەرکردەکانی حزبـی بەعسـی عێـراق، هەرچەنـدە ٧٥٪ی عەرەبـی عێـراق شـیعەن. زوربـەی کوردانـی ئێـران هـەر وەک زۆرینـەی ئێرانییەکانـی تـر مسـوڵمانی شـیعەن. جیاوازیـی لـە نێـوان ئـەم دو مەزهەبـە مسـوڵمانەدا زۆر قووڵـە، لـە جیاوازییەکانـی نێوان کاتۆلیـک و پرۆتسـتانتەکانی دنیای مەسـیحییەتدا زۆر قوڵتـرە. جیاوازییـە ئایینییـەکان ڕەنگـە ڕۆڵـی لـە کێشـە سـنورییەکانی نێـوان ئێـران و عێراقـدا بینیبێـت. خەڵکـی ئێـران، هەرچەنـدە بە ڕەگـەز ئارییایـن، چەندین گروپـی ڕەگـەزی لەخـۆ دەگـرن و ئەوەنـدەی مـن تـێ گەیشـتبم، کوردانـی ئێـران زیاتـر لـە ئێرانیبوونـی خۆیـان بەئاگـان وەک لـە پەیوەندییەکانیـان لەگـەڵ کـوردە نا-ئێرانییەکانـدا.

## نیشتەجێبوون لە ئێران:

حکومەتـی ئێـران پەنابەرەکانـی وەرگـرت و دەسـتبەجێ سیاسـەتی پەرشـوبڵاوکردنەوەی خێزانەکانـی بـە سەرانسـەری وڵاتـدا گرتەبـەر، ئەمـەش بۆ لادانیـان بـوو لـەو کەمپانـەی کە سـەرەتا تیایـدا نیشـتەجێ کرابون. دواییـن کەمپ ماوەیەکـی کـورت پێـش سـەردانەکەی مـن داخـرا بـوو. حکومـەت سـاواکی وەک بەرپرسـی ئـەم کارە دەستنیشـان کردبـوو، لەکاتێکـدا کۆمەڵگـەی شێروخورشـید وەکـو دەزگایەکـی چاودێـری کردارییـی، کاروبـاری بەڕێوەبردنەکـەی لەئەسـتۆدا بـوو. سـاواک کـە دەزگـای ئاسایشـی وڵاتـە لەسـەرو پۆلیسـی ئاسـاییەوەیە و ئێـران وڵاتێکـە کـە خەڵکەکـەی ددان بـە دەسـەڵاتدا دەنێـن و بـە دەگمـەن راسـتەوخۆ روبـەڕوی دەوەسـتنەوە. ئەگـەر لـە مەسـەلەیەکدا لەگـەڵ حکومـەت ناکـۆک بیـت، تەکنیکـە قبوڵکراوەکـە ئەوەیـە کـە: داوای یارمەتـی لـە کەسـێک بکەیـت کـە ئەوەنـدە بەدەسـەڵات بێـت بتوانێـت کاریگەرییەکـی هەبێـت. ئەگەرنـا،

مل کەچ دەکەیت. حکومەت بڕیاری دا کە خۆی مامەڵە لەگەڵ بارودۆخەکەدا بکات، ئەمەش تایبەتمەندێتی گەلێکە کە شانازی بەخۆیانەوە دەکەن، کە داهاتی نەوتەکەی بۆتە سەرچاوەیەکی نوێی ئابوریی و گرنگییەکەی. بۆیە، ئەمان داوای هاوکاری یاخود ئامۆژگاریی کۆمیسیۆنی باڵای نەتەوە یەکگرتووەکان ناکەن، بەڵکو ئەوەیان لا پەسەندە کە خۆیان کاری گەڕاندنەوە و نیشتەجێکردنەکە ئەنجام بدەن. لەکاتی قەیرانەکەدا، ئێران پەیماننامەی پەنابەرانی واژو نەکردبوو، بەڵام دواتر واژوی کردووە. وەک چاوەڕوان دەکرێت، ڕەنگە ئامانجە گشتییەکە ئەوە بێت کە بتوانرێ بارودۆخەکە بە شێوەیەکی مرۆییانە و تێگەشتنەوە بەڕێوە ببرێت، بەڵام مەبەستیشیانە کە یەکلاکەرەوەش بن. هەروەک ئەمەش چاوەڕوانکراوە، جاروبار هەڵە ڕودەدات. خەڵک بۆچوونی جیاجیایان هەیە کە ئایا هەڵەکە بەهۆی بڕیاری سیاسییەوە بووە، یاخود بەهۆی شکست یان کەموکوڕیی کاربەدەستە بێ ئەزمون و بیرتەسکەکانەوە بووە، یان ئەوەتا هۆکارەکەی نەبوونی تێگەیشتنی هاوبەشە لەسەر کلتور و بۆچونەکان، یاخود لەبەر ئەو هەڵوێستە ئاشکرا و بەربڵاوەیە کە دەڵێت پێویستە تازەهاتووەکان لە دواوەی ڕیزەکان بوەستن و بەرامبەر بەوەشی کە بەدەستی دەهێنن ئەوا سوپاسگوزار بن، بەتایبەتی لە ناوچە دوورەدەستەکاندا. چەند مەرگەساتێک ڕویانداوە، چەند کوڕێکی گەنج لە کەمپێکدا بە فیشەک کوژراون، چەند خێزانێک نێردراون بۆ ناوچەی بوشەهر لەناوچەی کەنداو کە کەشوهەوا و گەرمییە زۆرەکەی دەبێتە هۆی نارەحەتکردنی ئەو کەسانەی بە ناوچە شاخاوییەکان ڕاهاتون (لەڕاستیدا چەند منداڵێک مردن). سکاڵا گشتییەکان باس لەوە دەکەن کە هەندێجار بۆ هاندانی گەڕاندنەوەکە فشار بەکارهێنراوە یاخود گەڕاندنەوە وەکو هەڕەشەیەک بەکارهێنراوە بۆ ئەوەی ملکەچیی پەنابەران بۆ بڕیارە ناوخۆییەکان بەدەست بهێنرێت. هەروەها شوێنی نیشتەجێبون و دەرفەتی کار وەکو پێویست نیە و لەخوار چاوەڕوانییە واقیعییەکان و خواستی

تازەهاتووەکانـــە و، کاتێــک پەنابەرێــک کارێــک بدۆزێتــەوە رێگـــای پێنادرێــت وەریبگرێت. پەرشـوبڵاوکردنەوەکە وایکـردووە خێزانـەکان لەیەکتـر جیـا ببنەوە، مەبەسـت ئـەوە نیـە کـە خێزانەکانـی لەبەریـەک هەڵوەشـاندبێتەوە، بـەڵام خێزانـی بـرای لـە خێزانـی براکـەی دابڕیـوە، ئەمـەش بەسـەر نەتەوەیەکـدا هێنـراوە کـە پەیوەندییەکـی توندوتۆڵیـان لەگـەڵ یەکتریـدا هەبـووە و هاوخەباتییشـیان لـەو گروپـەدا کـە بەهـۆی شۆڕشـەکەوە ناهەمـواری زۆری بەسـەر هێنـان ئەوەنـدەی تـر نزیکـی کردونەتـەوە.

پێویسـتە قەبـارە زەبەلاحەکـەی سـەرەتای کێشـەکەمان لەبیـر بێـت، هـەروەک چـۆن لەبیرمـــان بێــت کـــە ئەوانـــەی مامەڵەیـــان لەگـــەڵ کێشـــەکەدا دەکـــرد ئەزمونێکـی زۆر کەمیـان لەبارەیـەوە هەبـوو، ناوچەکـەش زیاتـر لـە ملیـۆن و نیوێـک کیلۆمەتـری چوارگۆشـە بـوو، کـە بەقـەد بەشـێکی گـەورەی ئەورووپـای خۆرئـاوا دەبێـت. هەروەهـا چەنـد لەبەرچاوگرتنێکـی سیاسـییش هەبـون کـە لـە رابـردو و ئێستاشـدا هەسـتیارن. لەگـەڵ سـەلماندنی نیازپاکیـی راسـتەقینە و رۆحـی هاوکاریـی زەبـەلاح و هەوڵـە مرۆییانەکـەی دەسـەڵاتداران و گەلـی ئێرانـدا، مـرۆڤ دەتوانێـت هـۆکاری ئـەوەش ببینێـت کـە بۆچـی هەنـدێ لـە تازەهاتـووەکان ئەگـەر بزانـن ژیانیـان لـە جـاران خراپتـری بەسـەر نایـەت ئـەوا پەسـنی گەڕانـەوە بەسـەر مانـەوەدا بـدەن و، بۆچـی هەندێکـی دیکەیـان رەنگـە وا بیـر بکەنـەوە کـە لـە وڵاتێکـی تـر دەتوانـن دەرفەتـی باشـتر بەدەسـت بهێنـن.

دەسـەڵاتداران جێگایەکیـان بـۆ جەنـەراڵ بارزانـی و هاوەڵەکانـی دروسـت کـردووە، کـە پێدەچێـت دڵخـۆش بـن بـەوەی رێگـەی مانەوەیـان لـەو وڵاتـە پـێ بدرێـت، بـەڵام بەهـۆی سروشـتی بارودۆخەکـەوە پێویسـتە چالاکییـە سیاسـییەکانیان بەتونـدی سـنوردار بکرێـت.

پێویســتە نەبوونــی دڵنیایــی لــە بارودۆخەکــەدا لەبەرچــاو بگیرێــت. تازەهاتــووەکان هیــچ پێگەیەکـی فەرمییـان نیـیە، بـەڵام مانەوەیـان بەهـۆی

نیازپاکیی حکومەتی ئێرانەوەیە. ئاشکرایە کە دەکرێ بونیان وەکو بەشێک لە یارییە سیاسییەکە تەماشا بکرێت، یان ئەوەتا بیانهێڵێتەوە یاخود رادەستی عێراقیان بکاتەوە بە مەبەستگەلی ئەوتۆ کە پەیوەندی بە خۆشگوزەرانییانەوە وەکو تاکەکەس نەبێت. ئەگەر سیاسەتێکی ئاشکرا یاخود نهێنی دروست ببێت بۆ هاندانی پەنابەرەکان سەبارەت بە گەڕانەوە بۆ عێراق، ئەوا پێناچێت کە روبەڕوی نەیارێتییەکی بەرفراوان ببنەوە لەلایەن کۆمەڵانی خەڵکەوە یاخود لەو دەزگایانەوە کە پەیوەندییان بە چاودێری و خزمەتکردنەوە هەیە، روداوی لەم جۆرە لەو کۆمەڵگایانەدا رودەدەن کە نەریتی لیبراڵ دیموکراتی تیایاندا زیاترە. ئەم نەبوونی دڵنیاییە یەکێک دەبێت لەو هۆکارانەی کە هەڵوێستی پەنابەر لەسەر داهاتوی خۆی زیاتر لەبەرچاو بگرێت، هەر ئەم نەبوونی دڵنیاییەیە کە دەریدەخات بۆچی رەنگە کە پەنابەران پێیان وابێت ئێران بۆ مانەوە وڵاتێکی پەسەندکراوە. بڕیارەکەی دەسەڵاتداران سەبارەت بە بانگێشت نەکردنی کۆمەکی دەرەکی ئەم لەبەرچاوگرتنەی گرنگتر کردووە.

## گەڕانەوە بۆ عێراق:

هۆکارەکانی گرتنەبەری کردەوە سەربازییەکە هەرچییەک بوون، پێویستە ئەوەمان لەیاد نەچێت کە کوردەکان بەشدارییەکی زۆریان پێشکەش کردووە بۆسەر ژیانی دەوڵەتی عێراق و، هەروەها هەندێ لە کوردەکان لە حکومەتدا وەزارەتیان دراوەتێ بەبێ ئەوەی بە خائین و وڵاتفرۆش ناوزەد بکرێن، هەرچەندە لەوانەیە ئەم کارە بە نارەحەتییەوە ئەنجام درابێت.

بەشی باکوری وڵاتەکە بەزۆری کشتوکاڵییە و خەڵکەکەی و بەروبومەکەیان گرنگییەکی زۆریان بۆ وڵاتەکە هەیە. بۆیە چ لەڕووی ئابوری و چ لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە، گەڕاندنەوەی ئەم پێکهاتەیە بۆ وڵات گرنگیی خۆی هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا، رەنگە چاوەڕوانی ئەوە بکرێت کە حکومەت تاوەکوو

دەتوانێت ئـەم گەڕانەوەیـە دوابخـات بەهـۆی ئـەو کۆمەکانـەی کـە ئەمـان پێشـتر بـۆ شۆڕشـەکەیان دابیـن کـردووە(؟).

چەنـد لێبوردنێـک دەرکـراون و، خەڵـک ڕێگایان پـێ دراوە بگەڕێنـەوە بۆ وڵات، بـەڵام مـەرج نیـیە ڕێگایـان درابێتـێ بچنـەوە مـاڵ یاخـود ناوچەکانـی خۆیـان و، ئـەو کەسـانەش کـە گومانـی سـەرکردەبوونیان لـێ کراوە دەسـتگیرکراون و سـزا دراون. دیـارە هەندێکیـان تەقەیـان لـێ کـراوە. سیاسـەتی ڕاگواسـتنی کـوردەکان بـۆ بەشـەکانی دیکـەی عێـراق گیراوەتەبـەر و، خەڵکـی عـەرەب هانـدراون کـە لـە چەنـد ناوچەیەکـی دیاریکـراو نیشـتەجێ بـن، بەتایبەتـی لـە ناوچـەی کەرکـوک. ئەوکاتـەی کـە بەرنامـەی سـەردانەکەمم دادەنـا، ژمارەیـەک کـورد بانگێشـت کرابـون چاویـان بـە وەفدێکـی حکومەتـی عێـراق بکەوێـت لـە ئێـران و، پێیـان ڕاگەیەنـدرا کـە لێبوردنێکـی دیکـە دەردەکرێـت و دیاربـوو وەک نیشـانەیەکی بەخشـندەیی لـەم کارەیـان دەڕوانـی. بەخشـینی ئـەم لێبوردنـە لـە ٢٦ی ئابـدا ڕاگەیەنـدرا. لەکاتێکـدا کـە بۆچونـەکان جیـاوازن سـەبارەت بـە کاردانـەوەی ئـەو ٣٥ هـەزار پەنابـەرە کـوردە عێراقییـەی کـە لـە ئێرانـدا ماونەتـەوە، بـەڵام ئەگـەر چەنـد دڵنیاییەکـی ڕاشـکاو لەبـارەی چەنـد بابەتێکـی دیارییکـراوەوە بخرێتـە ڕوو، پێدەچێـت کـە ژمارەیـەک لـە جوتیـاران و گوندنشـینان گەڕانـەوە بـۆ سـەرزەمینەکەی خۆیـان بەسـەر مانـەوە لـە نـاو ئێرانـدا پەسـەند بکـەن، ئەوانـەی دەمێننـەوە باشـتر پێناسـەی پەنابەریـان بەسـەردا دەچەسـپێت کـە بریتییـە لـەو کەسـەی کـە ترسـی ئـازاردان و ناهەمواریـی ناتوانێـت بیگەڕێنێتـەوە بـۆ وڵاتەکـەی خـۆی. هەندێکیـان لـە ئێـران دەمێننـەوە، بـەڵام هەندێکـی دیکـە لـە ڕێگـەی کۆچکردنـەوە بـەدوای داهاتـودا دەگەڕێـن، کـە دەرفەتـی خوێندنیـش بەشـێکیەتی.

**کۆچ:**

مەبەستێکی سەرکیی سەردانەکەم ئەوەبوو لە پرۆسەی دەستنیشانکردن و کارکردن لەسەر ئەو کوردانە بەئاگابم کە دەیانەوێت بێنە شانشینی یەکگرتوو. کۆچ ئەو بوارەیە کە تیایدا حکومەتی ئێران بە کردار رەزامەندی دەربڕیوە هاوکاریی لە کۆمیسیۆنی باڵای پەنابەرانی نەتەوە یەکگرتووەکان وەربگرێت، هەرچەندە ئێران دەیەوێت هاوکاریی لەسەر ئاستی نافەرمی بێت. بەڵام ئەوان رەزامەندییان دەربڕیوە کە لیسڵی گودیەر - کە ئەزمونی پێشتری لە ئێراندا هەبووە، وەک ناوبژیوانێک لەو وڵاتە بمێنێتەوە. گودیەر لەم رێگەیەوە دەتوانێت لە بواری دابینکردنی بەڵگەنامە و جوڵەی ئەو پەنابەرانەدا هاوکار بێت کە لە وڵاتانی دیکەدا بەدوای داهاتودا دەگەڕێن. ناوبراو بەهۆی ئەزمونەکانییەوە لە ئێران و هەروەها بە پشتبەستنی بەو شارەزایی و پەیوەندییە ئاستبەرزانەی کە هەیەتی ئەوا بە دڵنیاییەوە کەسێکی زۆر بەنرخ بووە. بەبێ یارمەتی ناوبراو و، هاوکارییە هەمەچەشنەکەی کە راست و دروستیی بریاری گەشتەکەمیان سەلماند، گەشتەکەم ئەم سودەی ئێستای نەدەبوو. هەڵوێستی دەسەڵاتدارانی ئێران لەبارەی کۆچەوە نە هاندانە و نە دژایەتیکردنیشە. گەورەترین گروپی کۆچبەرەکان رویانکردووەتە ئەمریکا، بەڵام بریارە بیرۆکراتییەکە ماوەیەکی کاتیی دیاری کردووە کە بووەتە رێگر لەبەردەم داواکردنی هەموو ئەو شوێنانەی ئامادەییان بۆ وەرگرتنی کۆچبەر دەربڕیوە.

چاوەڕوان دەکرێت ئەو جێگایانەی دیکە کە ماونەتەوە لە داهاتوودا پڕبکرێنەوە. هەندێک لە وڵاتەکانی دیکە بریتین لە بەریتانیا و هۆڵەندا. ئەوانەی چونەتە ویلایەتە یەکگرتووەکان لەبەر هۆکاری هونەری بە ئەڵمانیادا تێپەڕیون و، دەسەڵاتدارە ئەڵمانییەکان ئەوەندە بە چۆنایەتی

و رەفتــاری ڕێبــوارەکان سەرســام بووبــون کــە رەنگــە ڕێگــە بــدەن خەڵکانــی دیکــە لــە کۆمــاری ئەڵمانیــای دیموکراتــدا بەشــوێن داهاتویانــدا بگەڕێــن. تێکــڕای وڵاتــان نزیکــەی ١٤٠٠ جێگەیــان دابیــن کــردووە و نزیکــەی نیــوەی ئــەم ژمارەیــە پڕکراونەتــەوە و تــەواو بــوون.

ســەبارەت بــە کۆچکــردن بــۆ شانشــینی یەکگرتــوو، مــن یەکێــک بــووم لــەو وەفــدەی کــە چــاوم بــە جێگــری وەزیــری دەرەوە کــەوت کــە ســەردانی وەزارەتی ناوخــۆی کردبــوو، مســتەر ئالێکــس، لیــۆن و، ئێــم پــی  پێمــان ڕاگەیەنــد: کــە ئەگــەر ژمــارەی ئــەو کوردانــەی دێنــە ئــەم وڵاتــەوە بــەو ئەندازەیــە ســنوردار بێــت کــە پێشــنیار کرابــوو، (ژمــارەی پێشــنیارکراوەکە نزیکــەی ٥٠ بــوو)، ئــەوا هیــچ ســەختییەک لــە ڕێگەپێدانیــان بــۆ نــاو وڵاتەکــە نایەتــەڕێ، بــەڵام تەنیــا یــەک مــەرج هەیــە کــە ئەوەیــە کەســە داواکارەکــە لــەم وڵاتــەدا کەسێک بناســێت. دڵنیاکراینــەوە کــە دەتوانرێــت ئــەم مەرجــە زۆر بــە بەخشــندەییەوە لێکدانــەوەی بــۆ بکرێــت. لــە کــرداردا، هاتنەنــاوەوە بــۆ ئــەم وڵاتــە زۆر خــاو بەڕێــوە دەچێــت. بەشــێک لــە هۆکارەکــەی ئەوەیــە کــە پرۆســەکە کاتێکــی زۆری پــێ دەچێــت و لــەو ماوەیــەدا ئەگــەر دەرفەتێکــی دیکــەی پەنابەرێتــی بێتــە پێشــەوە، پەنابەرەکــە کــە دڵنیــا نی‌یــە لــە قبوڵکرانــی داوای پەنابەرێتییەکــەی لــە شانشــینی یەکگرتــوو دا، ئــەوا ئــەو هەســتەی لــەلا دروســت دەبێــت کــە چاوەڕوانیکردنــی شــتێکی نادڵنیایــە و زۆر مەترســیدارە. هەروەهــا سروشــتی ئــەو پرســیارانەش کــە دەخرێنــە بەردەم داواکارەکان توشــی نیگەرانییــان کردیــن چونکــە هاوشــێوەی ئــەو پرســیارانە بوو کــە دەخرێنــە بــەردەم ئــەو کۆچبەرانــەی کــە نــە پێویســتیی و نــە هەلومەرجــی پەنابەرێتییــان تێدایــە. بــۆ نمونــە "چەنــدت پــارە هەیــە؟" و "نــاوی ئــەو کەفیلانەمان پــێ دەڵێیــت کــە ناهێڵــن تــۆ ببیــت بــە بــار بەســەر دەوڵەتــەوە؟". ئەمــەی دواییــان ئەوکاتــە ئاشــکرا بــوو کــە پۆلیــس چــوو ســەردانی کەفیلــە ناوهێنراوەکانــی کــردو پرســیاری لــێ کــردن لەبەرئــەوەی کــە ئەنجومەنــی بەریتانیــا بــۆ هــاوکاری

پەنابـــەران خزمەتگوزارییەکانـــی بەشـــی نیشـــتەجێکردنی پەنابـــەرە کوردەکانـــی خستووەتەبەردەســـت، هـــەروەک چـــۆن لەگـــەڵ کەســـانی دیکەشـــدا ئـــەم کارە دەکات، BCAR بـــە ئامادەییـــەوە وەزارەتـــی ناوخـــۆی ئاگادارکـــردەوە کـــە چیتـــر بـــۆ پەنابەرانـــی دیکـــە پێویســـت بـــەم ڕێوشـــوێنە نـــاکات، BCAR بەرپرســـیارێتی ئامۆژگاریـــی و هـــاوکاری بـــۆ پەنابـــەرە کـــوردەکان لەئەســـتۆ دەگرێـــت و ئیتـــر پێویســـت نـــاکات بـــەدوای کەفیلـــدا بگەڕێـــن. لـــە کـــرداردا، کاتێـــک وەکـــو پەنابـــەر ڕێگـــای هاتنـــە نـــاوەوە بدرێـــت، ئـــەوا (خزمەتگوزارییـــە کۆمەڵایەتییـــەکان) لەبەردەســـتدا دەبـــن. دەرفەتێکـــی بەســـود و گرنـــگ بـــوو بـــۆ مـــن کـــە توانیـــم ئـــەم بابەتـــە بـــۆ باڵیـــۆز و کاربەدەســـتانی باڵیۆزخانـــە و نوســـینگەی کنســـوڵ بـــاس بکەم و ڕووبـــەڕوو بـــاس لـــە نیگەرانییەکانـــی B-KFS و BCAR بکـــەم.

هەروەهـــا، ئێمـــە دەمانویســـت دڵنیابیـــن لـــەوەی زانیـــاری و ئامۆژگاریـــی دروســـت دەدرێـــت بـــەو کوردانـــەی کـــە ڕەنگـــە شایســـتەیی ئەوەیـــان تێـــدا بێـــت وەکـــو پەنابـــەر بێنـــە شانشـــینی یەکگرتـــووەوە و هـــان بدرێـــن کـــە داوای پەنابەرێتی بکـــەن. ]...چەنـــد دێڕێـــک لـــە بەڵگەنامەکـــە پەڕیـــوە[

لەبەرئـــەوەی دەســـەڵاتدارانی ئێـــران حەزدەکـــەن کۆنترۆڵـــی تـــەواوی نیشـــتەجێکردنەکەیان لەدەســـتدا بێـــت، بۆیـــە پێناچێـــت کـــە پەنابـــەران ڕێکخـــراوی تایبـــەت بـــە خۆیـــان دروســـت بکـــەن و، هەروەهـــا ئـــەم پەنابەرانـــە بەســـەر وڵاتەکەدا پـــەرش و بـــڵاو کراونەتـــەوە. لەگـــەڵ ئەمەشـــدا، لـــە بارودۆخێکـــی لـــەم چەشـــنەدا، ئـــەو کەســـانەی کـــە لـــە ڕێکخراوەکـــەی پێشـــوودا بـــون یەکتـــری دەناســـن، حـــەزی بەردەومیـــدان بـــە پەیوەندییەکـــە لەناویانـــدا بەهێـــزە و، "تـــۆڕی گەیاندنـــی وتـــی وتـــی" کاردەکات. بـــە دڵنیاییـــەوە جـــۆرە ڕێکخســـتنێک لەناویانـــدا هەیـــە و نافەرمـــی و نهێنـــی هەڵدەســـوڕێت، ئەمـــەش بـــە فەرمـــی زانـــراوە، بـــەڵام تـــا ئەوکاتـــەی جموجوڵـــەکان لـــە ســـنوری نهێنیبونـــدا بمێنێتـــەوە دەســـتی تـــێ وەرنادرێـــت.

بەهـۆی ئـەم سـەردانەوە بـۆم روون بووەتـەوە کـە ژمارەیـەک کـورد هـەن رەنگـە شایسـتەی پێویسـتیان تێدا بێـت کـە بتوانـن ببـن بـە موڵکێکـی بـاش بـۆ ئـەم وڵاتـە ئەگـەر بتوانیـن یارمەتییـان بدەیـن و جێگایـان بکەینـەوە تـا ئەوکاتـەی شـوێنی گرنگـی خۆیـان لـە کۆمەڵگـە و ئابوورییەکەمانـدا دەکەنـەوە. ئـەم کەسـانە لـــە رەشـــە خەڵکەکـــە نیـــن، بەڵکـــو لـــەو توێـــژەن کـــە پێشـــینەیەکی باشـــتری خوێندەواریـی یاخـود توانـای باشـتریان هەیـە و، ئـەو کەسـانەن کـە بەراسـتی دەتوانرێـت بخرێنـە چوارچێـوەی پێناسـەی پەنابـەرەوە. ئـەو تێروانینـەی لـە رێگـەی چاودێـری کەسـانی دیکـە و چاودێرییەکانـی خۆمـەوە لـەلام دروسـت بـووە ئەوەیـە کـە ئـەوان خەڵکێکـن شـانازی بەخۆیانـەوە دەکـەن، ئەقڵێکـی سـەربەخۆیان هەیـە، هەسـتیارن، ئەقڵانیـی و سـۆزدارن و، کاتێک لـە وڵاتەکەماندا جێگەیـان بکەینـەوە پێویسـت نـاکات داوای لێبـوردن لـە هیـچ کەسـێک بکەیـن.

## ئەو بابەتە دیاریکراوانەی باسم کردن:

سـەرەڕای باسـکردنی بۆچونەکانـی ئـەو رێکخـراوە ناحکومییانـەی چالاکانـە کـە لـە بەریتانیـاوە کار لەسـەر کـوردەکان دەکـەن، بـۆ باڵیۆزخانـە و کونسـوڵخانەی بەریتانیـا و، جگـە لـە باسـکردنی رێوشـوێنی کـرداری سـەبارەت بـە وەرگرتـن و راوێـژ پێـدان، توانیـم کێشـەیەکی (WUS)یشـیان بـۆ بـاس بکـەم و ئـەوان لەبەرامبـەردا ئامۆژگاریـی خۆیـان خسـتەڕوو و بەڵێنیانـدا هەرکاتێـک پێویسـت بـکات یارمەتـی پێشـکەش بکـەن. هەروەهـا ئـەو بەرپرسـانەی پـدک کـە دەیانەوێـت خەڵکەکەیـان کـۆچ بکـەن، پێـم راگەیانـدن کـە دەبێـت پێشـوەخت تایبەتمەندێتییەکانـی هـەر زانیارییـەک کـە لـە رێگـەی فەرمییەکانـەوە ناردویانـە بنێـرن بـۆ BCAR، ئەمـەش یـان بـە راسـتەوخۆ یاخـود لـە رێگـای ئـەو کوردانەوە کـە لـە بەریتانیـادا نیشـتەجێن. هەروەهـا توانیـم بـاس لەو دەرفـەت و بەربەسـتانە بکـەم کـە رەنگـە کۆچبـەران لـە هاتنـدا بـۆ ئـەم وڵاتـە رووبـەڕووی ببنـەوە و

هەندێک نمونەم پێدان لەسەر ئەو جۆرە فۆڕمانەی کە رەنگە سەبارەت بە دەرفەتە پەروەردەیی یاخود پیشەییەکان کە داوایان لێ بکرێت پڕی بکەنەوە.

پێم خۆشە سود لەم دەرفەتە وەربگرم بۆ تۆمارکردنی سوپاس و پێزانینی خۆم بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە بە دەستکراوەییەوە هاوکاریی مادییان پێشکەش کردم کە بەهۆیەوە توانیم ئەم گەشتە بکەم، بەشێکی کۆمەکەکە لە رێکخراوەکانی دۆستایەتیی و هاوکاریی پەنابەرانەوە هاتووە و، بەشێکی دیکەشی لە کەسایەتییەکانەوە نێرداوە. هەروەها سوپاسی راستەقینە بۆ هەموو ئەو کەسانەی یارمەتی کردارییان پێشکەش کردم. هەروەها سوپاسی ئەو کەسانەش دەکەم کە کات و هەوڵی خۆیان تەرخان کرد و پێشوازییان لێ کردم، زانیارییان پێ بەخشیم و، یارمەتییان دام زۆرترین سود لەو کاتە سنوردارە وەربگرم کە لەبەردەستمدا بوو.

لەندەن. ٣١ی ئابی ١٩٧٦

کێنێت لی

**کلەیر**

**لە بەغداوە Z٢٨١٠٣٠ ئاب**

**نهێنی نیە**

**رۆژی وەرگرتن ٣١ی ئابی ١٩٧٦**

بۆ رۆتین: وەزارەتی دەرەوە و کۆمۆنوێلز راپۆرتی ژمارە ٢٧٦ی رۆژی ٢٨ی ئاب

زانیاری ئاسایی تاران و دیمەشق

وێنە بۆ واشنتۆن UKMIS نیویۆرک و UKMIS جنێف

## لێبوردن بۆ کوردە عێراقییەکان:

لە رۆژی ٢٨ی ئابدا حکومەتی عێراق لێبوردنێکی گشتی دەرکرد بۆ هەمو کوردەکانی"ریزەکانی سوپا، کاربەدەستان، کارمەندان و کرێکاران" کە ئێستا بەبێ مۆڵەت لە کارەکانیان دور کەوتونەتەوە، بەو مەرجەی تاوەکو رۆژی ١٥ی تشرینی یەکەم بچنەوە سەر کارەکانیان یاخود خۆیان بە نزیکترین دەسەڵاتی عێراقی بناسێنن. ئەم لێبوردنە بۆ هەموانە چ لەناوەوە و چ لە دەرەوەی عێراق، لێبوردنەکە خزمەتی سەربازییش دەگرێتەوە.

٢. مەرجەکانی ئەم لێبوردنە هەمان مەرجەکانی جاری رابردووە و ئەو تاوانانە ناگرێتەوە کە رەنگە رویاندابێت.

٣. وەرگێڕانەکـــە بـــە پێچـــراوی تەنهـــا بنێردرێـــت بـــۆ بەشـــی خۆرهەڵاتـــی ناوەراســـت.

وەزارەتی دەرەوە و کۆمۆنوێڵز تکایە وێنەیەک بگەیەنن بە ناوبراوان.

گراهام

لەسەر داواتان دوبارە نێردرایەوە

دۆسیەکان

MED

سێر ئەی. دەف

**نهێنی***
**سی**
**مستەر میڵن**
**HE o/r**

**کوردەکان:**

١. لــە میانــەی گفتوگۆکانــی ئــەم دواییــەم لەگــەڵ مســتەر ســتێمپڵ لــە باڵیۆزخانــەی ئەمریــکا و دکتــۆر مەحمــود عوســماندا لــە پــدک، یــەک دو بابــەت هاتنــە پێشــەوە.

(ا) کۆنفرانســەکەی کــورد. بــە قســەی د. عوســمان هیــچ پلانێــک نەبــووە بــۆ بەڕێوەبردنــی کۆنفرانســی ســاڵانەی پــدک لــە لەنــدەن لــە ڕۆژانــی ١٥ تــا ١٨ی ئابــدا. (ڕاپۆرتــی ژمــارە ٣٥٠ی وەزارەتــی دەرەوە و کۆمۆنوێڵــز ئامــاژەی پــێ دەدات). لەگــەڵ ئەوەشــدا ناوبــراو جەختــی لــەوە کــردەوە کــە لــە ڕۆژانــی ٥ تــا ١٠ی ئابــدا لــە بەرلیــن کۆنفرانســی پــدک ئەنجــام دراوە و کۆنفرانســێکی دیکــەش لەلایــەن ینــک ەوە ئەنجــام دراوە کــە کێبڕکێــکاری پدکــە (ینــک ڕەنگــە کورتکــراوەی حزبــی یەکێتیــی کوردســتان بێــت)، جــەلال تاڵەبانــی لــە ڕۆژانــی ١٤ تــا ١٧ی ئــاب لــە فرانکفــۆرت ســەرپەرشــتی کۆنفرانســەکەی ینــک ی کــردووە. بۆنەیەکــی گــەورەی دیکــە کــە بڕیــارە ئەنجــام بدرێــت بریتییــە لــە: هەفتــەی کــورد

* ئـەم بەڵگەنامـە نهێنییـەش، هیـچ ئامـاژە بۆ بـەرواری نووسـینی نەکراوە، بـەڵام بـە پێی ئـەو زانیارییانـەی کـە تێیـدا هاتـووە: بـاس لـە کۆنفرانسـەکانی پارتیـی و یەکێتیـی ئـەکات لەمانگـی ئـاب دا، هەربۆیـە بـە پەسـەندم زانـی کـە لـە ڕیزبەنـدی دانانـی بەڵگەنامەکانـدا، ئـەوا ئـەم بەڵگەنامـە نهێنییـەش بخەمـە ڕیـزی بەڵگەنامەکانـی مانگـی ئەیلولـی ١٩٧٦، شـەریف هـەژاری.

کـە لـە ناوەڕاسـتی مانگـی ئەیلولـدا لـە بەریتانیـا بەڕێـوە دەبرێـت و هـاوکات وەکـو "کۆنفرانسـی لقـەکان"ی پدکیـش تەماشـا دەکرێـت. باڵیۆزخانـەی ئەمریـکا لێـرە بـڕوای وایـە لـە چەنـد مانگـی داهاتـودا کـوردەکان بەمەبەسـتی دوبـارە رێکخسـتنەوە چەنـد کۆبونەوەیـەک لـە ئەوروپـا ئەنجـام دەدەن، بـەڵام ناتوانـێ هیـچ وردەکارییەکـی دیکەمـان بداتـێ.

(ب) بارزانـی. ئێسـتا مـەلا لـە ویلایەتـە یەکگرتووەکانـە و قسـە بـۆ "هاوڕێکانی" دەکات و، وەهـا تـێ دەگـەم کـە چەنـد وانەیەکیـش پێشـکەش دەکات. بارزانـی پێی گوتـم: چـاوەڕوان دەکرێـت بارزانـی سـاڵێک لـە ئەمریـکا بمێنێتـەوە. باڵیۆزخانەی ئەمریـکا لێـرە کەمێـک لـەو ئەگـەرە نیگەرانـن و وەزارەتـی کـۆچ هێشـتا بڕیـاری نـەداوە کـە ئایـا رەزامەنـدی لەسـەر سـاڵێک مانـەوەی دەدات یـان نـا. بـە بۆچونـی مـن ئەگـەر ناوبـراو لـە ئەمریـکا بمێنێتـەوە تەنیـا بـەو مەرجـە دەبێـت کـە بەشـداری سیاسـەتیی کـوردی نـەکات.

(ج) کـوردەکان لـە ئێـران. بـە وتـەی باڵیۆزخانـەی ئەمریـکا، کـوردەکان هاندەدرێـن کـە لێبوردنـە نوێیەکـەی حکومەتـی عێـراق قبـوڵ بکـەن. ئەمریکییەکان پێیـان گوتیـن کـە ٩٠٪ی ئـەو ٣٨ هـەزار کـوردەی هێشـتا لـە ئێـران ماونەتـەوە لێبوردنەکـە قبـوڵ دەکـەن. لـە راسـتیدا، باڵیۆزخانـەی ئەمریـکا بـڕوای وایـە کـە ئێرانییـەکان بەمەبەسـت هەڵمەتێکـی تەنگپێهەڵچنینیـان لـە بەرامبـەر جڤاتـە کوردییەکـە گرتۆتـە بـەر بـۆ ئـەوەی هانیـان بـدەن کـە بـڕۆن، چەنـد کوردێـک دوای ئـەوەی سـەردانی باڵیۆزخانـە بیانییەکانیـان کـردووە (بـە باڵیۆزخانەکـەی ئێمەشـەوە)، سـاواک هەڵیگرتـوون و لێکۆڵینـەوەی لەگـەڵ کـردوون و، هیـچ هەوڵێـک نـەدراوە بـۆ چارەسـەرکردنی کێشـەکانی پەراوێزخران و نیشـتەجێکردن و جیاوازییـە ئاینییـەکان و جیاوازیـی موچـە و تادوایـی کـە لـە ئێسـتادا کاریگەرییـان لەسـەر جڤاتـە کوردییەکـە هەیـە.

**تایبەت**
**باڵیۆزخانەی بەریتانیا**
**بەغدا**
**١٦ی ئەیلولی ١٩٧٦**
**بەڕێز ئای تی ئێم لوکاس**
**بەشی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست**
**وەزارەتی دەرەوە و کۆمۆنویڵز**
**وەرگیراوە لە تۆماری ژمارە ٣٥ی رۆژی ٢٤ی ئەیلولی ١٩٧٦**
**ژمارە ٣/٢٤٥**

ئیڤانی بەڕێز،

## بەعسیزم و کێشەی کەمینەی ناعەرەب

١. کاتێ لە ١٤ی ئەیلولدا قسەم لەگەڵ د. زەید حەیدەردا کرد، وتووێژەکە بەرەو ئەو پرسیارە رۆیشت کە کەمینە ناعەرەبەکان چۆن لە حزبی بەعسدا جێیان دەبێتەوە کە لەناوەڕۆکدا بەعس حزبێکی نەتەوەیی عەرەبییە. پرسیارەکە لە تێبینییەکەی د. حەیدەرەوە دروست بوو، تێبینییەک کە پێشتر لە د. حەیدەرم بیستبوو ئەوەیە: پێویستە لە پرسی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا ئەوە بێتەکایەوە کە ئیسرائیل ددان بە بوونی نەتەوەی فەلەستیندا بنێت. ئەم نمونەیەشی بەوە رونکردەوە کە کاتێ بەعس لە ساڵی ١٩٦٨دا لە عێراق هاتە سەر حوکم، یەکەم کار کە کردیان و حکومەتەکانی پێشوش دودڵ بون لە ئەنجامدانی، ئەوە بوو: ددانیان بە بوونی کەمینەکانی تری عێراقدا نا. بە

دڵنیاییـەوە کـوردەکان گەورەتریـن کەمایەتـی بـون، بـەڵام تورکمـان و ئاشـوری و هـی دیکـەش هەبـون. دوای ئـەوەی حزبـی بەعـس وەک نەتـەوە ددانـی بـەم کۆمەڵـە کەمینەیـەدا نـا، لەناوخۆیانـدا و لەگـەڵ نوێنەرانـی کەمینەکانـدا دەسـتیان کـرد بـەوەی کـە پێویسـتە وەک کەمینـە و هاووڵاتـی عێـراق چ مافێکیـان هەبێـت.

٢. ئـەم بابەتـە وایلێکـردم ئـەو پرسـیارە بکـەم کـە لـە سـەرەوەی نامەکەمـدا ئامـاژەم پـێ کـرد، کە ئایـا د. حەیـدەر چـۆن پەیوەندییەکانـی نێـوان ناعەرەبەکان، بەتایبەتـی کـوردەکان، لەگـەڵ بەعسـیزمدا دەبینێـت کـە ئەمـەی دواییـان هـەوڵ بـۆ یەکێتـی عـەرەب و پشـتیوانی دۆزەکانـی عـەرەب دەدات. د. حەیـدەر گوتـی ئـەم پرسـیارە بـە ئاشـکرا لەنـاو حزبـدا وتوویـژی لەسـەر کـراوە. بـە بۆچونـی ناوبـراو، کلیلەکـە ئەوەیـە: کـە حزبـی بەعـس بەرنامـەی ئـەوەی هەیـە بـەرەو سۆشـیالیزم بەرەوپێـش بچێـت.

سـەبارەت بـەوەی جەختکردنـەوەی بەعـس لەسـەر یەکێتـی عەرەبـی بەهـۆی حەزێکـی سـۆزدارانەی رابردووەوەیـە یاخـود تەنیـا لەسـەر بنەمـای نەتەوەیـی و زمانەوانـی نیـە: ئـەوان بڕوایـان وابـووە ئەگـەر سۆشـیالیزمی راسـتەقینە بـەدی بهێنرێـت، زەرورەتـی یەکگرتـن لەسـەر بنەمـای ئابـوری دەبێـت. هەرچەنـدە عێـراق وەک هەمـوو وڵاتێکـی دیکـەی عەرەبـی ئەگـەری لەبەردەمدایـە، بـەڵام زۆر لـەوە بچوکتـرە کـە "سۆشـیالیزم بنیادبنێـت" لەنـاو سـنورەکەی خۆیـدا. هەروەهـا پێشـبینی ناکرێـت کـە کوردەکانـی عێـراق لـەو ناوچـە بچوکـەی گرتوویانـە ئـەوا سۆشـیالیزم بنیـاد بنێـن و بـەوەش خۆشـگوزەرانی و کامەرانـی بۆخۆیـان بەدەسـت بهێنـن - ئـەو نەیدەتوانـی بـاس لـە کوردانـی وڵاتانـی دیکـە بـکات یـان کاریگەرییـان لەسـەر دابنێـت. بۆیـە بەرژەوەنـدی کـورد لەوەدایـە کـە لەگـەڵ عەرەبـدا کـە لـە هەوڵـی ئـەوەدان لـە ڕێگـەی سۆشـیالیزم و لـە ڕێگـەی پەیوەندییکردنـەوە بـە هاوبیرەکانیانـەوە بارودۆخـی ژیانیـان باشـتر بکـەن،

